پرۆژەی تیشك

٦




# بەرەو بەختیاریی ئافرەت

بەرگی یەکەم



جەمال حەبیبوڵلا (بێدار)




# بەرەو بەختیاری ئافرەت

جەمال حەبیبوڵلا
"بێدار"

بەرگی یەکەم

٢٠٠٦ زایینی - ١٤٢٧ کۆچی

**ناوەڕۆك** (ژمارەكانی لاپەڕەكان هی كتێبە چاپكراوەكەن)

# بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان هەر شایستەی خوای پەروەردگارە، پەروەردگارێك كە بەرنامەیەكی پاكی بێگەردی بۆ ئادەمیزاد دیاری كردووە تا بەپێی ئەو بەرنامەیە ژیانێكی ئادەمیزادانە، (نەك ئاژەڵانە) بەرنە سەر، سەلات و سەلامی هەتا هەتاییش بۆ گیانی پاكی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە بەرنامەكەی بە ئادەمیزاد گەیاندو خۆی لە بەجێهێنانیا نموونە بوو، كە ژیانی بریتیبوو لە دەنگدانەوەی ئەو بەرنامەیە.

كاتێ ئادەمیزاد تەماشای لاپەڕەكانی مێژووی ژیانی ئافرەت ئەكا، یان كە تەماشای ژیانی ئەمڕۆی ئەكات، سەرسوڕمان و گریان و پێكەنین دای ئەگرێ! سەرسوڕمان لەو جیاوازییە فراوانەی كە دروستكراوە لە نێوان بردنی ئافرەتا بەناخی زەویداو لەنێوان بەرزكردنەوەیدا بەرەو ئاسمان جاروبار.

گریان بۆ بەدبەختی و كلۆڵی و پێشێلكراویی ئافرەت لەكاتی بردنیدا بەناخی زەویدا، پێكەنینیش بەو بەرزكردنەوەیە كە بەرەو ئاسمان بەرزكراوەتەوە، چونكە نە ئەوو نە ئەم هیچكامیان جێی خۆی نەبووەو لە ڕاستییەوە گەلێ دوور بووە، ئایا ئەبێ مسقاڵ بێ یان خەربار؟

بە هەر جۆرێ بوو داری ئەو تاوانە لەسەر زەمینی بی باوەڕییدا هاتە بەرگرتن بەڵام چ بەرهەمێكی گرت! ژمارەیەكی زۆر لەقسەو فەلسەفەی زل و قەڵەوی بەڕواڵەت ورشەدار، كە بەشێوەی دروشم بەرزكرانەوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هونەرمەندانەتر ڕتووش دەكرێن و ئەگەڕێنرێن بەهەموو لایەكدا.

"ئافرەت بەندی بەندیخانەی ناو ماڵە، ڕزیوی ناو چێشتخانە، یان پێ بەستراوی كۆتی مێردو مناڵ و خێزانداریییە، لە خێزاندا ئافرەت كرێكارێكی ڕووتاوەو پیاو سەرمایەدارە، ئافرەت پلیشاوەی ژێر پێی فیلێكی ستەمكارە، واتە پیاو، ئافرەت نیوەی كۆمەڵە، ئافرەت هیچی لەپیاو كەمتر نییە، كۆمەڵ بێ ئافرەت وەك مەلی تاك باڵە، پێوەری ڕاستەقینەی ڕزگاریی كۆمەڵگە ڕزگاریی ئافرەتە.. هتد".

ئەم قسە زل و قەڵەوو ورشەداراتە، نەك سەدەها بگرە لە هەزارەها زیاتریش پەڕاویان پێ پڕكرایەوە، لەوێشەوە سەروازیان كرد بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارو سینەماو تەلەفزیۆن و ڕادیۆو سەرشانۆو تەنانەت سەر دیوارەكانیش، بە دەنگێكی زوڵاڵ بەر پەردەی هەموو گوێیەك كەوتن و هەر ئەزرنگێنەوە.

ئەو قسەو "فەلسەفە"و دروشمانە تاڕادەیەكی زۆر نەك كەم ڕاستیان تێدا بەدی ئەكرێت، بەڵام ئۆباڵ لە ئەستۆی كێدایە؟ ڕاستە ئافرەت ماف خوراوو بەدبەخت و كلۆڵ كراو بووەو ئێستاش هەروایە، بەڵام ئەی بۆچی وەهای لێ ئەكەن؟! ئایا هەر خۆی بەسروشت كلۆڵ و بەدبەخت و ماف خوراوە یا ئادەمیزاد، پیاو، ئەوەی بەسەرا ئەهێنێ؟ بەڵام پێم بڵێن، ئەی چار.. چار؟

"چار ئەوەیە ڕزگاری ئەكەین، ئازادی ئەكەین، سەربەستیی ئەدەینێ، ئا.. ئا، سەربەخۆیی پێ ئەبەخشین، یەكسانی ئەكەین لەگەڵ پیاودا، یەكسان لەهەموو سەرێكەوە، بۆ چ ئافرەت مرۆڤ نییە؟! چی لەپیاو كەمترە؟"

ئافرەت نەك هەر مرۆڤەو بەس، بەڵكو كارگەی مرۆڤە، خاوەنی مافی ڕەوای خۆیەتی، بەڵام ئادەی چۆن مافی ڕەوای خۆی ئەدەنەوە دەست؟

"پایەكانی خێزان لەبنەڕەتدا دەرئەهێنین، چونكە سەرچاوەی بەدبەختی ئەو خێزان و خێزانداریییە، لە بەندیخانەی ماڵ ئەیهێنینە دەرێ، قەڵای كۆنی باونەماوی "ڕەوشت" وێران ئەكەین، وشەی "گوناه"و "عەیبە" ئەخەینە ژێر پێ، دەستی

ئەگرین و ئەیبەین بۆ کارگە، لەوێ وەك پیاو کار بکات، بەوەش لە ئابووریدا سەربەخۆ ئەبێت، ئیتر منەتی پیاو هەڵناگرێت، ئەی ئەبێ تاکەی خۆی ببەستێتەوە بەتاکە پیاوێکەوەو ببێت بە بەندەی؟"

بەڵام.. ئەی نەوەی سبەینێمان؟ مرۆڤایەتی لە ئێمەدا نابێ بپڕێتەوە، ئەبێ ئێمە دار بنێژین بۆ ئەو نەوەیەی کە لەدوای ئێمە دێت، ئایا پێشینان نەیان ناشت بۆ ئێمە؟ ئەی نەوەی دوارۆژ؟!

"هەموو شتێ بڕواتەوە، شت نییە چارەسەری بۆ دانەنرێت، دایەنگا ئەو کارە ئەگرێتە ئەستۆ، ئەی ئەوە نییە یەك شوان ئەتوانێ بەرخەلێك کە لە (٣٠٠ ـ ٤٠٠) کارو بەرخ پتریش بێت بلەوەڕێنێ و نیگابانیان بکات؟"

هەنگاوی زلی "مەزن" لەم ڕووەوە نرا، ئافرەت هێلانەی خۆی بەجێ هێشت و گەیشت یان گەیەنرایە کارگەو شوێنەکانی تر، نیمچە سەربەخۆییەکی ئابووریی وەدەست هێنا، بەڵام ئایا بەوە لە ماف خوراویی و بەدبەختی بەتەواویی ڕزگاری بوو؟ ئایا لە دەرەوەی ماڵ و خێزاندا ئیتر چەوسانەوەی بەخۆیەوە نەدی؟ هەلپەرستی "استغلال"ی لەگەڵدا بەکار نەهێنرا؟ تاسەی ناو ماڵ و مناڵداریی لەناخیا ڕیشەکەن کرا؟ فیلەکە بوو بە بولبوول و ئاوازی بەگوێدا ئەڵێ؟

نەخێر.. نەخێر، چەوسانەوەو ماف قووتکردن لە ساکارییەوە گۆڕان بۆ ئاڵۆزیی، بار لەیەك مەنەوە بوو بە چل مەن، تەنها هۆی چەوسانەوە گۆڕا نەك چەوسانەوەکە، ئافرەت بەدبەختتر بوو نەك سەربەست و ئازاد.

ئەنجامی سروشتیی دەرهێنانی ئافرەت لە ماڵەکەیداو دوورخستنەوەی لەمێردو ئەندامانی خێزانەکەی ئاشووبەیەکی فراوانی داوێن پیسیی بوو کە لەوەشدا هەر ئافرەت دۆڕاوتر بوو، ئاشووبەیەك ئەوەندە پڕ مەترسیی و سامناکە، بیرتیژو بلیمەتەکانی ئەو شوێنانە پڕ بەدەم هاواریان لێهەڵساوە، بۆ نموونە، "جیمس ڕستون" لەم دواییەدا، لە "نیۆیۆرك تایمز"دا بڵاوی کردەوە: "مەترسیی وزەی جنسیی لە کۆتاییدا لە مەترسیی وزەی ئەتۆمی گەورەتر ئەبێت"، هەروەها مێژوونووس "ئەرنۆڵد توینبی" ئاگادارمان ئەکات کە "پەرەسەندنی جنس لەوانەیە ببێتە هۆی ڕووخانی شارستانییەت"، تەنانەت ئەو ئاشووبەیە گەورە پیاوان و سەرکردەکانی گەورەترین وڵاتانی سەرزەوی (ئەمریکاو ڕووسیا)ی هێنایە دەنگ و هاواری لێ هەڵساندن.

پزیشکەکانیش بەهۆی نەخۆشی زۆرو زەبەندەی جنسییەوە وەڕس بوون و کەوتنە هاوارو دادکردن، ئایا ئەوە بە ئازادکردنی ئافرەت ئەدرێتە قەڵەم؟ ئەگەر ئەمە ئازادکردن بێت ئەی بەندەکردن کامەیەو چۆنە؟

ئەوەی کە باسمانکرد لە خۆرئاواو خۆرهەڵاتەوە سەری دەرهێناو دەستی پێکرد، ئەمجا نێردرایە دەرەوە، هەتا گەیاندیانە خاکی موسڵمانان، دیارە لەسەرەتاوە موسڵمانان لەو قسەو ئاشووبەیە سڵەمینەوەو بەگژیانان چوون، بەڵام کوفر هۆو ڕێگای جۆر بەجۆری هەیەو بەپێی پێویستی ئەیانخاتە کار، جا بۆ سەرکەوتنی لەوەدا، کەوتە بەکارهێنانی پڕوپاگەندەو دروستکردنی گومان لە دڵی گەنج و لاوە موسڵمانەکاندا سەبارەت بە یاساکانی ئیسلام، بەتایبەتی هەڵخەڵەتاندنی ئافرەت هەتا لە ئیسلام بسڵەمێتەوە.

ئیسلام دژی جنسە، ئارەزووی سروشتی مرۆڤ ئەپوچێنێتەوە، دەستی خستۆتە قوڕگی ئافرەتەوە، تاساندویەتی، ناهێڵێ لەماڵدا بێتە دەرەوەو بەندی ئەکات، ئافرەت سەرکزی ژێردەستی پیاو ئەکات، ئەیکا بە بەندەی. بە نیوە مرۆڤی دائەنێت، ئەها لەمیراتا نیوەی پیاوی پێئەدات، پیاوێك بۆی هەیە لەیەك کاتدا چوار ژنی هەبێت، تەڵاق (مافی ڤیتۆ) دراوەتە دەست پیاو، ئاغایەتی و سەروکاریکردنیش لەخێزاندا هەر هی پیاوە.

ئەها گەواهی ئافرەت لە ئیسلامدا ڕەوا نییە، ئەها ئەبێ ئافرەت وەك یاپراخ خۆی بەسەد بەرگ بپێچێتەوە، ناهێڵێ ئەویش وەك پیاو کار بکات و بەرهەمی نەتەوە پەرەبسێنێت، ئەوەتا موسڵمانان بەوە دواکەوتوون.. هتد.

گەلی کوردیش کە بەشێکە لە گەلی گەورەی ئیسلام، کوفر لەو فرۆفێڵ و درۆو دەلەسەیە بێبەشی نەکردن ئەو درۆو دەلەسەیەی دا بەگوێی ئافرەتی موسڵمانی داوێن پاکی کورددا، ئەو ئافرەتەی کە خاوەنی جلوبەرگی شەنگ و شۆخی ڕەسەنی خۆیەتی و گونجاوی سروشتی ئاوو هەوای خاکەکەیەتی.

بەڵێ.. شاگردانی کوفر تاڕاددەیەکی زۆر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ڕۆڵەکانی ئیسلامی نەك لە ئایینەکەیان دوورخستەوە، بەڵکو کردنی بە دوژمنی قین لەدڵی ئیسلام، ئەمەشلەکاتێکا کە ڕان بێشوان بوو، باخەوان لەپرخەی شیرین خەوا بوو، دیارە لەو کاتانەدا دەست وەشاندن ئاسانە.

بێگومان ئەم باسە باسێکی دوورو درێژو ئاڵۆزە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنێکی خەستو قووڵو بەپێز هەیەو هەیبووە، بەڵام تا ئێستا بەزمانی کوردیی من نەم دیوە یاخود بەردەستم نەکەوتووە، لەبەر ئەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانی هەڵسم بە نووسینی چەند باسێك سەبارەت بە ئافرەت بۆ ئەوەی ببێتە گەشتێکی کورت بۆی لەگوڵزانی ئیسلامدا، بەو هیوایەی ئافرەتی کورد، بەتایبەتی خوێندەوارەکانیان، ڕاست لە ناڕاست جیابکەنەوە، ڕێگەی شیاوی خۆیان بەرنەدەن یان بیدۆزنەوە، ئەی من زادەی ئافرەتێکی کورد زمانو داوێن پاکی موسڵمان نیم؟

ئەوەش ئەڵێم کە هەموو لایەنەکانی ژیانی ئافرەتم لەئیسلامدا باس نەکردووە، بەڵکو چەند لایەنێکی دیاری کراوم داوەتە بەر یاسکردن، بەداڕشتنێکی تر چەند مشتێکم لە دەریایەك هەڵگۆزیوە، ئەویش نەك لەشێوەیەکدا کە بڵێم کەموکورتیی تێدا نەبێت، دیارە بەپێی وزەی خۆم ئەڵێم، ئەمە لەلایەکەوە.

لەلایەکی ترەوە، لە نووسینی باسەکانا پشتم زۆر بە لایەنی عەقڵیو زانیاریی بەستووە، بگرە بۆ نموونە نەبێت پەنا م نەبردۆتە بەرلایەنی گیانیی، هۆی ئەمەش ئەمەیە: کوفر وای نیشان دەدات کە عەقڵو زانیاریی چەکیەتی، منیش ویستوومە بەو چەکە لەسەنگەردا بەرامبەری بووەستم، ئەی جێی خۆی نییە کە "شافیعی" پێشەوا فەرموویەتی: "پەرچدانەوەی هەر مەزهەبێك بەبی زانینیو بەبی چوونە ناو بنجو بناوانیی بە بەرپەرچدانەوەیەکی کوێرانە دەژمێردرێت؟".

سەراپای باسەکە لەشێوەی گفتوگۆو ئاخافتنذایە" بە پرسیارکردنو وەڵامدانەوە. ئەوپەڕی ڕاستەو ڕوویی تێدا بەدی ئەکرێت.

دیارە خوێنەرانی ئەم باسە ئەبن بەچەند بەشێکەوە، هەندێکیان بەچاکی ئەزانن منیش ئەڵێم خوا چاکیان بۆ بکات، بەشێکیش پێیان ناخۆشەو دژی ئەوەستن، داوا ئەکەم لەخوا کە بەرچاویان ڕۆشن بکاتەوە، بەشێکی تریشیان دان بە کەڵکی بابەتەکاندا دەنێن، بەڵام گلەیی ئەوە ئەکەن کەموکورتییو کاڵوکرچییان تێدا هەیە، بەوانەش ئەڵێم ئێوە چاکتر بنووسن.

نامەوێ بەگاڵەی دەم نووسینەکە ببەمە ئاسمان، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پێوەی ماندوو بووم، ئەوپەڕی ڕەنجم تێدا داوە، سەرچاوەیەکی زۆرو هەمە جۆرم لەبەردەستا بووەو لە زۆربەیانم هەڵگۆزتووە، تەنیا داوایەك کە هەمە لای خوای پەروەردگار ئەمەیە کە ئەم نووسینەم لیێ وەربگرێتو بیکاتە مایەی خێری ڕۆژی دواییم.

## ژەمێك یاپراخ

سکالا: ئۆی، سەعاتێك ئەبێت لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشاوم، یەك وەنەوز نەچۆتە چاوم، ئای بەخوا وانەوتنەوەش کارێکی قورس و ناخۆش و سەرئێشەیەکی گرانە!

ئاواز: هەر قورس و گران و ناخۆش؟ هەر سەرئێشەو بەس؟ ئەی بۆچ نالێیت مەرگ.. مەرگ؟ توخوا وانە وتنەوەش بوو بەئیش؟

دڵپاك: ئای مامۆستایان! ئەوە ئەڵێن چی؟ ژیان بەکارکردن و تێکۆشان و ڕەنجدانەوە ژیانە، خۆشیی ژیان لە ماندووبووندایە، بگرە مرۆۋ بە کارکردن و بەرهەمهێنانەوە مرۆڤە، ئایا ئەزانن زاناکان ئێستا پێناسە کۆنەکانی مرۆڤیان گۆڕیوە؟

ئاواز: بۆ چ لە کۆن و تازەدا مرۆۋ هەر مرۆۋ نەبوە؟ پێناسەی کۆن و تازە یانی چی؟

دڵپاك: بەڵێ: مرۆۋ هەر مرۆۋ بووە، بەڵام ئەوسا زاناکان لەپێناسەیدا ئەیانگوت: "مرۆۋ ئاژەڵێکی گوێندەیە (حیوان ناطق)".

ئاواز: هەرکامیان بێت گرنگ نییە، زۆرم برسییە، چیمان هەیە؟

سکالا: ڕاست ئەکات منیش قۆڕەی سکم دێت لەبرسانا چیمان هەیە؟

دڵپاك: ئەی نازانن کە یاپراخم لێناوە؟ کەمێکیش سارد بۆتەوە، ماڵی پەلەیە، چونکە مەترسیی سووتاندنی لێناکرێت دانیشن.

بەدەم نانخواردنەوە بەمجۆرە کەوتنە وتووێژ

سکالا: دڵپاك، ئایا ئەزانی یاپراخ شتی تێدایە؟ مەبەستم ئەوەیە ئەو برنجەی کە ئەکرێتە نێو گەڵا، برنجێکی چاك و ئاسایی نییە!

ئاواز: بەکورتی بۆ پلاو ناشێ بۆیە ئەیکەن بە یاپراخ!

دڵپاك: مەرج نییە وەها بێت، ئایا ئەزانن یاپراخ لەپلاو تازەترە؟ مەبەستم ئەوەیە، یاپراخ بۆیە داهێنراوە خەڵك لە برنجی ڕووت وەڕس بووە، ئەوسا بیری کردۆتەوە، هەرەمەکیی و کوێرانە نییە، بەڵکو بەرهەمی بیرو ژیریی مرۆڤە، جۆرە تامێکی خۆش و نوێی وەهای تێدایە کە ئادەمیزاد وەڕسیی خۆی لەپلاو پێی ئەڕەوێنێتەوەو باوەڕناکەم جارێکی تر تا مرۆڤ مرۆڤە بتوانی دەسبەرداری ببێ، ئەها ئاژەڵەکان نازانن بیپێچنەوە! لەناو هەموو گیانداراندا تەنها مرۆۋ لێی ئەزانێ، دەی ئەوەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی پێشکەوتن و شارستانییەت نییە؟

سکالا: نەتهێشت بیرم بەسەر خواردنەوەکەوە بێت، تەنها پرسیارێك بوو بەدڵما هات، من کە تێرم خوارد خەو دام ئەگرێ!

دڵپاك: قەیدناکان سەربەستیت، بەڵام پرسیار وەڵامی ئەوێ.

## با لەیەکتر بگەین

دڵپاك: خوشكان، وا ئێمە دوو مانگێكمان لەژیانمان بردە سەر لەنێو قوتابخانەو ئەم ژوورەماندا، هەر وەك ئەشزانن هێشتا سەرەتای ساڵە، ئەبێ پێكەوەش بژین، چونكە ئەمەتا پیشە، غەریبی، مێیەتی، كۆیكردینەوە، بەهۆی ئەوەوە هەتا لێرەین بۆ یەكتر نزیكترین كەسین.

ئاواز: تەبعەن.. تەبعەن، ئەوە هەمووی ڕاستە.

سكاڵا: ئەوە ئاشكرایەو منیش ئەیزانم جا چی تیایە؟

دڵپاك: دەی هەر ئەوەندە بەس نییە كە پێكەوە بچین بۆ قوتابخانەو وانە بڵێینەوەو بێینەوە بۆ ماڵەوە، لەماڵیشەوە بخۆین و بخۆینەوەو كە خەویشمان هات بخەوین.

ئاواز: ئێ.. هەر ئیشوكارێكیش هەبێت بەنۆرە ئەیكەین.

سكاڵا: خەرجیش هەر سیانمان تیایا وەك یەك بەشدارین.

دڵپاك: بەڵام ئەوەش هەر بەس نییە.

سكاڵا: دڵپاك، هەست و ئاوەزم پێم ئەڵێت كە تۆ باسێكت وا بەدەستەوە، ئەی لەوە زیاتر چی بكەین؟ هەڵپەڕین یان گۆرانی بڵێین؟! خۆ هەروەك ئەزانی تا ئێستا هیچ جۆرە ناكۆكییەك لەنێوانماندا ڕووی نەداوە!

دڵپاك: ئەوە ئەزانم ڕوونەدانی ناكۆكیی لەنێوانماندا بەلای منەوە شتێكی سروشتیەو ئەبێ وەهاش بین، خۆ ئێمە بۆ بەگژاچوونی یەكتری دروست نەكراوین، بەڵام ئەی بۆ چ لەگەڵ یەكتردا ڕاست و ڕەوان و بێ پێچ و پەنا نەبین؟ ئەوەی كە لەدڵماندایە سەبارەت بەیەكتر بۆ دەری نەبڕین؟ بۆ بەشاراوەیی بمێنێتەوە؟

ئاواز: لەوكاتەوە كە ئەم ژوورە بەهۆی قوتابخانەوە كۆیكردووینەتەوە من هەر بە مامۆستایەك تەماشام كردوویت، كەچی سەیرە! تۆ دەم لەقسەی قەڵەوی فەلسەفییانە دەكوتی دڵپاك.

دڵپاك: وەك ئەزانن منیش وەك ئێوە مامۆستام، فەیلەسووف نیم، قسەكانیشم لە فەلسەفەوە دوورن، وا بزانم هیچ خراپەیەكشیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵنەگرتووە، بەڵام ئایا خراپە ئەگەر بەچاكیی یەكتر بناسین؟

سكاڵا: ئەوە خراپ نییە، بەڵام نەشمانگوتووە كە قسەكانت خراپەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە.

دڵپاك: بەڵێ، ئەوەتان نەگووت. بەڵام بەفەلسەفەیان دائەنێن، لەكاتێكیشدا قسەكانی من تەنها ڕاستییە نەك فەلسەفە.

ئاواز: ڕاستیی؟! كام ڕاستیی؟ ئای ڕاستیی بەسەزمان، چۆن گیرت خواردووە! ئاخۆ چۆن بێ؟ لەكوێ بێ؟

دڵپاك: ڕاستیی هەر یەك ڕاستییەو هەر وەك خۆی وەهایەو لەجێی خۆشیدا ناجووڵێت، ئەوەندە هەیە پێتان ئەڵێم: هەر وەك بۆ بەگژاچوونی یەكتر خەلق نەكراوین، هەر بەو جۆرەش بەتەنها بۆ خواردن و خواردنەوەو خەوتن و خەلق نەكراوین. هەركەسێك بۆ ژیان بژی ئای كە دەمێكە مردووە! چونكە كۆتایی و ئەنجامی ژیان مەرگە.. مەرگ!!

سكاڵا: ئێ، دە وابڵێ، منیش ئەوە ئەزانم كە مەرگ یەخەمان ئەگرێت و ڕاكردنمان نییە لەچنگی، بۆیە حەز ئەكەم بژین و هەروا بەخۆڕایی ژیان لەدەست دەرنەكەین، تامی بچەژین.

دڵپاك: منیش مەبەستم ئەوەیە ژیان بەخۆڕایی لەدەست خۆمان نەدەین وەك تۆ گوتت، جا كەواتە بۆ چ كارێكی وا نەكەین كەمردین نەمرین و هەر بژین، بەخۆشیش بژین؟

سكاڵا: ئاخر دڵپاك خان، تۆ ئەڵێیت قسەكانم لە فەلسەفەوە دوورن كەچی پڕن لە فەلسەفە! خۆ ئەگەر كەسێكی تر ئەو قسانەی بكردایە، یەكسەر منداڵم بۆ بانگ ئەكرد هەتا بەشێتە.. شێتە بكەوتنایەتە دوای. بەڵام من تۆ ئەناسم، ئەزانم شێت نیت، ئەزانم ژیرو خوێندەواریت.

دڵپاك: خوشكە گیان، ئێمە لەیەكتر تێنەگەیشتووین، من ئەمەوێ لەگەڵ یەكتردا ڕاست و ڕەوان بین بەوەش لەیەكتر ئەگەین.

ئاواز: ناڕاستیی و ناڕەواییمان لەگەڵ یەکتردا چییە دڵپاك؟ ئەی گوایە هێشتا یەکتر ناناسین؟ لەیەکتر نەگەیشتووین؟ ئایا ڕێزمان نەگرتوویت؟ لەنۆرەی خۆماندا ئیشمان نەکردووە؟ لەوە زیاتر چیت ئەوێ؟

دڵپاك: خوشکان، ئێوە مامۆستان.. مامۆستا، پیشەو وشەی مامۆستا بەرزو بەرێزن، دەی ئەبێ مەرجی مامۆستایەتیتان تێدا هەبێت، ئەبێ دڵفراوانییتان تێدا هەبێت، زوو هەڵنەچن، ئای! چەند حەز ئەکەم کە هێمن بن و لە قسەکانم زویرو دڵتەنگ نەبن!

سکاڵا: باشە، ئیتر زویرو دڵتەنگ نابین و هەڵناچین، بەڵام من باش لە قسەکانت تێناگەم، نازانم چی ئەڵێیت، من لە مەبەستت تێناگەم، چ بکەم تێناگەم!

دڵپاك: باوەڕم بەم قسانەت هەیە، بەڵام هۆی تێنەگەیشتنەکەت ئەوەیە، لەگەل یەکتردا ڕاست و ڕەوان نین، بەرامبەر یەکتر داخراوین، هەر یەکەمان لە جیهانێکی جیادا فڕەی باڵی بیرو ئاواتەکانی دێت، هەر یەکەمان چاوی بڕیوەتە پەیکەری تایبەتیی چارەنووسی هێشتا نەهاتووی خۆی.

ئاواز: ئەوە ڕاستە.. زۆر ڕاستە، بەڵام ئەی چار.. چار چییە ئەی دڵپاکی هەستیار؟

دڵپاك: چار هەر ئەوەیە ئەوەندە ڕاست و ڕەوان بین لەگەل یەکتردا هەتا بکرێینەوەو بەباشی یەکتر بناسین.

سکاڵا: بەڕاستیی تۆ کچێکی سەیریت! دەی فەرموو ئەوەتاین لەبەر دەستتدا، چۆنمان ئەکەیتەوە بمانکەرەوە، چۆنت ئەوێ بمانناسە، ئەمەتاین لەبەر دەستتدا.

دڵپاك: نا، چاوەکەم، ئەوەش چارە نییە، بەو جۆرەش هەر ناگەینە ئەنجام.

ئاواز: کەواتە تۆ ئەتەوێ پێمان ڕابوێریت، ئەتەوێ یاری بە دەمارەکانی مێشکمان بکەیت.. شێتمان بکەی.. بمان کوژیت؟

دڵپاك: ببوورە.. ببوورە، لەوانەوە زۆر دوورم، ئەو پەڕی ڕێزو نرختان لای من هەیە، بە ڕۆشنبیرو تێگەیشتووتان ئەزانم، خۆشم ئەوێن، من ئەمەوێ کەڵك لەیەکتر لەم ماوەیەدا وەربگرین، ڕێگەی بەئاوات گەیشتن دیاریکەین.

سکاڵا: سەرزەنشتی من مەکە، بەخوا لێت تێناگەم.

ئاواز: منیش داوای لێبوردنت لێئەکەم، لێم ببوورە.

دڵپاك: نا.. نا، من بەرامبەر ئێوە هیچ ناگرمە دڵ، دڵنیابن وەك خوشکی خۆم تەماشاتان ئەکەم، هەرگیز سەرزەنشت کردنتان نایەت بەبیرما، ئەوپەڕی ئاواتم ئەوەیە کە خوا لە بەختیارکردنتاندا سەرم بخات.

ئەمەوێ لەیەکتر بگەین، بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە گیروگرفتەکانمان چارەسەر بکەین، تەمو دووکەڵی ناو دڵ و دەروون و گیانمان بڕەوێتەوە، دەی فەرموون بۆ ئەو مەبەستە یارمەتیم بدەن، با من لە ئێوەو ئێوەش لە من شارەزایی و لە یەکتر گەیشت، بەدەست بێنین.

ئاواز: دڵپاك، زۆرت پێیەو کەمی دەرئەبڕی، خۆ دیارە!

دڵپاك: لەگەڵ ئەوەشدا نامەوێ خۆم بە پشکۆی ڕەق و قینی هیچ کەسێك داغ بکەم، حەزیش ئەکەم بە چاکەکردن بەرەنگاری خراپەو خراپەکاریی بکەم.

## پرسیارکردن ڕێگەی لێکترگەیشتنە

سکاڵا: ئامادەم بۆ لێکترگەیشتنن بەڵام چۆن؟ بە چ ڕێگەیەك؟

دڵپاك: بە پرسیارکردن لە یەکترو وەڵامدانەوەی یەکتر بەڕاست و ڕەوانیی و بێ پێچ و پەنا، دوور لە هەڵچوون و تووڕەبوون، بەشێوەیەك گیانی هێمنی و سەربەستیی بیروڕا باڵ بکێشێت بەسەرماندا، لەهەموو پرسیارو وەڵامێکیشدا مەبەستمان تەنیا دۆزینەوەی ڕاستیی بێت، نەك یەکتر بەزاندن.

ئاواز: ئەمەتم بەدڵە، هەموو کەسێك حەز لەڕاستیی ئەکات.

دڵپاك: نەخێر وانییە ماموٚستا ئاواز، هەزارەها هەن لەڕاستیی ڕائەکەن، لەکاتێکدا ئەشزانن ڕزگاربوونیان بەستراوە بە ڕاستییەوە، نابینی گەلێ نەخوٚش ڕائەکەن لە خواردن‌و خواردنەوەی ئەو حەب‌و دەرمانانەی کە پزیشکەکەی بوٚی نووسیوە، یاخود ئەو پارێزەی کە بوٚی داناوە ژێر پێی ئەخات؟

سکاڵا: ئەوە ڕاستە، گومانی تێدا نییە، بەڵام من قەت وەها نەبووم، خوٚ ئەگەر نەخوٚش بکەوم‌و بچمە لای پزیشك، هەرچی بڵێت پێم بەگوێی ئەکەم.

دڵپاك: گرێکوێرەکە لەمەدایە خوشکان، زەحمەتە کە هەر لێرەدا هەڵ ئەقوڵێت، نەفامیی ئاوێتە گەلێ لە نەفامیی سادە ئاڵوٚزترە، خوٚ ئەگەر ئادەمیزاد بزانێ کە نازانێ زوٚر بەئاسانیی فێر ئەکرێت.

ئاواز: وا دیارە ئێمە دەرەقەتی فەلسەفەکاریی توٚ نایەین، بە هەر زمان‌و زاراوەیەك ناومان ئەبەی هەوەسی خوٚتە.

دڵپاك: بەڵام ئەبێ باوەڕتان بە کەسایەتیی‌و ژیریی خوٚتان هەبێ، ئەبێ بوونتان، مروٚڤایەتییتان بسەلمێنن.

ئاواز: تەبعەن.. تەبعەن!

دڵپاك: کەچی هەر ئێستا دیمان دەمێ هەڵئەچن، دەمێکیش هەر وا بە ئاسانیی، بێ ئەوەی بگەینە ئەنجام شلیی نیشان ئەدەن!

سکاڵا: تو ئەو خوایەت کە نوێژی بوٚ ئەکەیت دڵپاك، سەرو دڵمانبەربدە، بەروٚکمان بەربدەو لێمان گەڕێ، پێم بڵێ بزانم کوت‌و مت چیت ئەوێ .. چی؟

گوتت با یەکتر بناسین.. ئەڵێم باشە بەسەرچاو، داوای لە یەکتر گەیشتنت کرد ئەویش بەسەر گیان، ڕاستیی‌و ڕەوانیی ئەویش بەسەر سەر، ئێ ئیتر چی ترت ئەوێ؟

دڵپاك: تەنها یەك شتم ئەوێ، ڕاستیی.. ڕاستیی‌و بەس.

ئاواز: ڕەنگە توٚ وابزانی ئێمە دوژمنی ڕاستین، توٚ بڵێیت حەزی لێ نەکەین، ئای.. ئای ڕاستی!

دڵپاك: بەڵام ڕاستیی بەبێ هەوڵدان‌و لێکوٚڵینەوە بەدەست نایەت، نامەوێ بوٚ دڵنەوایی‌و ڕووخوٚشیی نواندن بێت لەبەر من.

سکاڵا: ئەی چوٚن؟! ئێمەش خاوەنی بیروڕاو ڕێگەی ژیانی خوٚمانین، قابیلە لەبەر توٚ دەسیان لێ هەڵگرین، ئێمەش سەربەستین.

دڵپاك: ئەوەتم بەلاوە زوٚر جوان‌و سەربەستانە بوو، ئەگەر بێتو هەر وا بەرەوانیی لەسەری بڕوٚین دڵنیام ئەگەینە ئەنجام، بەهەرسێکمانەوە ڕێمان لەڕاستیی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر لێم وەربگرن بەتکاوە یەك داوام هەیە.

ئاواز: هەرچی ئەڵێیت سەربەستیت، فەرموو.

دڵپاك: لەبیروڕادا، لەدەرخستنی باوەڕدا، بەرامبەر یەکتر، ڕەوان‌و کراوە بین، هیچکامان ملکەچ نەکەین بوٚ هەڵچوون، چیمان لەدڵدایە بیکەین، بەپرسیارو بەشاراوەیی نەیهێڵینەوە، گوێ بوٚ وەڵامی پرسیارەکان بگرین، لە پرسیارکردن‌و وەڵامدانەوەدا ڕێگەی زانیاریی‌و ژیربێژی "منطق" بەر نەدەین.

سکاڵا: مەرج بێت، مەرجی ئادەمیزادی مەرد، ئەبی خوٚیشت وەهابیت، قسەکانی خوٚتت لەبیر نەچێتەوە.

دڵپاك: دڵنیابە.. دڵنیابە.. ئەگەر تووڕە بووم‌و هەڵچووم ئێوە یەکسەر بمگرن‌و بیرم بخەنەوە، تووڕەیی کەس ناگەیەنێ بە ئەنجام.

ئاواز: ئوٚوٚوٚ.. خوٚ زوٚر درەنگە سەعات بەرەو (١٠) ئەچێ، نازانم بەکوێدا بەو خێراییە شەوگار ئەو هەنگاوانەی نا! ئای ماندووم! نەخەوین؟

سکاڵا: ئەرێ وەڵڵا درەنگە، نەخەوین؟

دڵپاك: بوٚچی نا؟ فەرموون با بخەوین.

## من ئەمویست ئەو پرسیارە بکەم

دڵپاك: ئەمڕۆشمان لەزنجیرەی ڕۆژانی ژیانی وانەوتنەوە بەسەرچوو.

سکاڵا: بڵێ ئەمڕۆشمان لەسەرێشەی ژیان بەسەرچوو.

دڵپاك: وا مەڵێ سکاڵا، وانەوتنەوە پیشەیەکی زۆر بەرزو پیرۆزە، پەروەردەکردنو فێکردن یەکێك بووە لە ئەرکەکانی سەرشانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، زەڕەنگەری مێشكو ژیریو سۆزە، بەڵام ئەوەش کەسێکی ئەوێ لێی تێبگات، ڕێزی بزانێت.

سکاڵا: ئەهۆو، چوویتەوە سەر قسەکانی جارانت، با دیسانەوە نەچینەوە سەر باسەکەی شەو.

دڵپاك: بەڵام خانم، ژیان یەك یەکەیە، یاخود زنجیرەیەکە کە پچڕاندنی نەشیاوو نەگونجاوە، ئەتوانم بڵێم ڕستەیەکەو مانایەکی جوانو تەوای هەیە، هەر وشەیەکی لێ لابرێت دیارە بەوە ماناکەی ئەشێوێ یان ئەگۆڕێ.

ئاواز: جوانە، قسەکەت جوانە، دەبا نەی شێوێنین، نەی گۆڕین.

دڵپاك: ئەگەر مۆڵەتم بدەنێ ئەمەوی یەك پرسیارتان لێ بکەم.

سکاڵا: ئەی شەو پێمان نەگوتیت سەربەست بە لە گوتنو پرسیندا؟

دڵپاك: ئایا ئێوە لەشێوەو ڕەفتارو ژیانی خۆتان ڕازین؟

ئاواز: بەخوا باشبوو کە تۆ خۆت ئەم باسەت هێنایە پێشەوە، من هەر لەیەکەم ڕۆژەوە ویستوومە ئەو پرسیارە لە تۆ بکەم، بەڵام ئەترسام پێتگران بێتو تووڕە ببیت، ئەی توخوا تۆ لەخۆت ڕازیت؟ ئەوە بۆچ بیر لە شێوەو جۆری ژیانی خۆت ناکەیتەوە؟ جلوبەرگێکی شۆڕی لادێیانە، بەدرێژایی ساڵ سەرو زوڵفی داپۆشراوی پێچراو، نازانم لەو بەرگەتدا چۆن ناڕزێیت!! جیاوازیی نێوان تۆی مامۆستای زاناو ڕۆشنبیرو ئافرەتێکی لادێی نەزانی نەخوێندەوار چییە؟

لەوەش خراپتر، لەپیاوان سڵ ئەکەیتەوە، هەروەکو تۆ مەڕو ئەوان گورگ بن، ئەو لەشو سەرو گەردنە جوانەت لەو هەموو چاوانەی کە هەمیشە زیتەیان دێتو تینووی لالێکردنەوەی ڕەگەزی نەرم (الجنس اللطیف)ن شاردۆتەوە!

سکاڵا: چەندەها باوو نەریتو خووی کۆنی باونەماوت گرتووەتە خۆت، پێم ناڵێیت ئەوەت لەچییەو بۆ چییەو لەپێناوی چیدایە؟!

دڵپاك: هەرچەندە ئێوە پرسیارەکەی منتان کرد بەژێرەوەو لەوەڵامەکەی ڕاتان کردن بەڵام من بەسنگێکی فراوانەوەن بەوپەڕی بەختیارییەوە وەڵامی پرسیارەکەی ئێوە ئەدەمەوە بەو مەرجەی گوێ لەوەڵامەکەم بگرن.

ئاواز: فەرموو.. فەرموو، ئەی بۆ گوێی لێناگرین؟

دڵپاك: پێشەکیی، جلوبەرگ یەکێکە لە بەرهەمە گرنگەکانی شارستانییەتو پێشکەوتنی مرۆڤایەتیی، ئەو گەلو نەتەوانەی کە لەشارستانییەتەوە دوورن تا ئێستاش بەڕووتی ماونەتەوە، جا من و تۆی ڕۆشنبیرو خاوەن شارستانییەت ئەگەر وەك ئەوان بە ڕووتیی یاخود بە نیمچە ڕووتیی بمێنینەوە، جیاوازییمان لەگەڵ ئەواندا چییە؟

جگە لەوەش، بەرگو خۆداپۆشین یەکێکە لە گرنگترین جیاوازییەکانی مرۆڤو گیاندارەکانی تری ئەم گێتییە، ئەی نابینن گیاندارەکانی تر هەموویان ڕووتن، واتە جلوبەرگیان لەبەردا نییە؟

بێگومان وەك ئەزانن جلوبەرگ لەش لە گڕەی گەرماو کزەی سەرماو تەپوتۆزو تەنانەت خۆرو گەلێ شتی تری پیسو پۆخڵ، یان زبرو تیژو چەندەها شتی تر ئەپارێزێت، هەروەکو نەنگو شوورەیو کەموکورتییەکانی تری لەش دائەپۆشێت.

خۆ لای هەمووانیش ئاشکرایە کە جلوبەرگ جۆرە جوانییەك بەئادەمیزاد ئەبەخشێت.

جا خۆ ئەگەر جلوبەرگ بکەین بەهی لادێیی لەشارنشینەکانی دوور بخەینەوە، بەوە واتای شارستانییەت پێچەوانە دەبێتەوە، لەوەشدا واقیع لایەنگیریمان ناکات، ئەوانەی کە گاڵتە بە لادێیی لەبەر بەرگەکەیان ئەکەن دووجار هەڵەن، زۆر دوورن لەڕاستییەوە، بۆ جیاوازیی نێوان شارستانییو ناشارستانیی ئەبێ لەجلوبەرگدا بێت، یان لەکارپاکیو خزمەتکردنی مرۆڤایەتییدا بێت؟ ئەبێ لەژیریی و مەردایەتییدا نیشان بدرێت یان لەقۆڵو سنگو لاقی ڕووتدا؟

خوشکم، بۆ جوانیی بۆدرەیەو بۆیە؟ ڕوتیی سەرومل؟

نینۆکی درێژ؟ ئەبرۆی دەسکردە؟ یان قەڵەمو کل؟

پانتۆڵی تەسك، سنگی بەرەڵڵا، یان لاقی بێ موو؟

زێڕو ئەڵماسە؟ لەنجەی سەرجادە؟ یان پێڵاوو جل؟

سکالا: هەی.. هەی.. هەی! ئەی ئەگەر جوانیی لەوانەدا نەبێت، ئەی ئەبێ لەچیدا بێت؟ دەی فەرموو پێم بڵێ.

دڵپاك: بەیەك كۆپلە شیعر وەڵامت ئەدەمەوە:

نا.. نا، جوانیی ڕاست نەرمو نیانیتە، ڕەفتار چاكیتە

كارو بەرهەمە، خۆداپۆشینو داوێن پاكیتە

خێزان پەروەریی، مامۆستایەتیی، بیرو سەرنجە

ڕێزی خۆزانین، سەربەزیی و ژیری خودا ناسییتە.

خۆ بەدوورگرتنم لە پیاوان واتای مەرو گورکی ناگەیەنێت، بەڵكو واتای خۆناسینو دووبینیی و ئابڕوو پاراستن، ئەگەیەنێ، من زۆرباش ئەزانم كە مرۆڤایەتیی لەدوو نیوە پێكهاتووە، یەكەمیان ئافرەتو دووەمیان پیاوە، هەردووكیان دوولایەنی یەك شتن، كەمرۆڤایەتییە، هیچ لایەنێكیان بێ ئەویتر نایكرێت كتومت وەك لەشو گیان وەهان، جا یەككگرتنی ئەو دوو نیوەیە بۆ یەكەیەكی تەواو ئەبێ چۆن بێت؟ بەپێی یاساو لەسەر دەستوورێكی پاكی دیاریكراو یان لەبەرزیتەزیتی چاوێكی چنۆكی گەنجێكی هەڵەی بەرەڵڵای نەفامو سەر لێشێواو؟

خۆ ئەگەر شاردنەوەو داپۆشینی سەرو گەردنو لەش بە نەنگو شوورەیی و هەڵەكاری بدرێتە قەڵەم، ئەوە ئەبی بڵێین: قەندو چكلێت خستنە بەرگەوە، هەنگوێن كردنە نێو شووشە بوونی مرواریو گەوهەر لەناو سەدەفدا، داپۆشینی زۆربەی خواردەمەنییەكان، ئەمانەو چەندەها شتی تر، هەموو هەڵەكارین، ئەگەر ئەوەمان گوت ئایا ڕاستیی و ژیریی بەدرۆمان ناخەنەوە؟ لەڕووی ژیرییەوە قسەكەمان ڕاست دەرئەچێت؟

ئەو چاوە زیتە زیتكەرانە چاوی ڕاستەقینە نین، بەڵكو چاوی هەوەسو ئارەزوویەكی ئاژەڵیی و كاتین، لەگەڵ ئەوەشدا خۆپیشاندانی منو تۆ بەو چاوانە لەو شێوە "شارستانییە"دا تینوویەتییان ناشكێنێت، بەڵكو كڵپەو بڵێسەی گڕوتینی ئارەزوویان بە جۆشتر ئەبێت.

خوشكەكانم، ئەگەر منو تۆو تۆ، یان هەر ئافرەتێكی تر، بێتو ئاوڕ بداتەوە بەلای زیتەی هەموو چاوێكەوە، بێگومان خۆشی بەش بەش بكات بەوەش هەر فریای هەموویان ناكەوێت، خۆ ئەوسا ئەبی بوونو كەسایەتی خۆی بخاتە ژێر پێی ئەوانەوە، واتە سەربەخۆیی خۆی لەناو ببات، چونكە ئەوەی ملكەچی چەند كەسێك بێت سەربەخۆیی خۆی بزر ئەكات، ئەوسا ئیتر سەربەخۆیی تەنها وشەیەكی بێ ناوەڕۆكی دوور لەژیانو واقیع ئەبێت.

ئەی بۆچ پاكیی و سەربەخۆیی خۆم نەپارێزم یەكەم بۆ خۆمو كەسوكارم، دووەمیش بۆ هاوسەرێك كە ئەویش پاكیی و سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت بۆ من؟ ئەو هاوسەرەی كەپێكەوە دەزگایەكی هاوبەشی هێمنم لەگەڵدا دروست بكاتو لەچوارچێوەكەیدا بۆ خۆمان بەئارامیی ژیانی تێدا بەرینەسەر.

سكالا: مەبەستت لەو دەزگایە چییە؟

دڵپاك: مەبەستم خێزانە.. خێزان، كە یەكە (وحدة)ی سەرەكیی كۆمەڵگەیە، دەی بۆچ هەریەكەمان هەوڵی دروستكردنی ئەو یەكەیە نەدەینو لەسەر بنەڕەتی خۆشەویستیی و ڕێزگرتنو ماف پاراستن ژیانی تێدا نەبەرینە سەر؟

ئایا خۆخەریككردن بە زیتە زیتی چاوێكی چنۆكەوە چاكترە لەو ژیانەی كە لەگەڵ هاوسەرێكدا ببرێتە سەر؟ دیارە مەبەستم هاوسەرێكی وەهایە كە گزیی و ناپاكییم لەگەڵدا نەكات، لێی دڵنیابم، ئەگەر نهێنییەكم هەبوو، یان بۆم پەیدا بوو سپاردە بێت لایو بیپارێزێ، لە هەمان كاتدا منیش بەو جۆرە بم بۆ ئەو.

لە ڕۆژانی نەهاتیو سەردەمی پیرییشدا بەتەنگ یەكەوە بێین، نازی یەكتر بكێشین، ئیتر كەی ڕەوایە خۆم بكەمە قوربانی زیتەی چاوی بێ ئابڕوویەكی هەوەسپەرست؟ لەپێناوی خۆشیی ساتێكی كورتدا؟ ئەی نابێ بیری ئەوەشمان هەبێت كە ژیان هەر ژیانی نێو ئەم گێتییە نییەو بەرەو ژیانێكی تر بەڕێوەین؟

# ئەبێ بەئیش بێت نەك بەڕیش

سکالأ: ئەوەی کە گوتت هەمووی ڕاستە.. ڕاست، بەڵام..

دڵپاك: بەڵام چی؟ مەیهێڵەرەوە لەدڵتا.

ئاواز: هەڵسوکەوتت لەهی پیرەژن ئەکات، هەندێ شتت لە باوونەریتی کۆنەوە وەرگرتووە، سەیریت.. سەیر!!

دڵپاك: من زۆر باش ئەزانم کە گلەیی هەرەگەورەتان لێم ئا ئەم جلوبەرگەیە کە لەبەرمدایەو لەشم بەتەواوی دائەپۆشێت، چا حەز ئەکەم ئێوە ئەوە بزانن کە خۆدوورگرتن لە خەڵك، خۆجیاکردنەوە لە کۆمەڵگە بە لەبەرکردنی جلوبەرگی بێگانە، ئەوە نەخۆشییەکی دەروونییە، شاردنەوەو پڕکردنەوەی کەلەبەرەکانی دەروون‌و ژیری‌و کەسایەتی مرۆڤی ناساغ‌و ناتەواوە، مرۆڤ ئەو کەسەیە بەکرداری جوان‌و بەکەڵك بتوانی خۆی لەخەڵکی تر جیابکاتەوە، بەکردار نەك بە جلوبەرگ، نەك بە کەشخەکردن‌و فیزکردن، ئەبێ: "ئیش بێت نەك ڕیش"، ئەبێ مرۆڤ ژیریی‌و ڕۆشنبیری خۆی بەکرداری سوودبەخش، بە خزمەتکردنی مرۆڤایەتی، بە خوا لەخۆڕازییکردن بنوێنێ‌و نیشان بدات نەك بەشوێنکەوتنی مۆدەو باوی بێجێ.

دوای ئەوە، ئەو شتانەی کە ئێوە لەمندا بەدیتان کردوون‌و بەسەیرو کۆنیان ناوئەبەن، ئەگەر بزانن چین، بۆ ئەکرێن، لە پێناوی کێدا ئەکرێن، واتە بەوردیی‌و چاکیی تێیان بگەن، دڵنیام کە جارێکی تر ئەوەی کە گوتتان دووپاتی ناکەنەوە.

بەداخەوە! ئێوە "ڕۆشنبیر" ئێوەی خوێندەوار، لەهەموو شت گەورەتر. ئێوەی بەچکە موسڵمان! ئەوەندە بێئاگان کە نازانن من چی ئەکەم، چییەو بۆ کێی ئەکەم! کەڵکی چییە!! جا توخوا ناهەقمە کە داواتان لێ ئەکەم بۆ ئەوەی یەکتر بناسین‌و لەیەکتر تێ بگەین؟

خوشکەکانم، بەوەی کە من دەستم داوەتێ، بەداڕشتنێکی تر دەستم پێوە گرتووەو بەری نادەم، هەمووی لەیاساکانی باوەڕو ئایینەکەمەوە وەرمگرتوون، واتە من پەیڕەویی یاساکانی ئایینەکەم ـ ئاینی ئیسلام ـ ئەکەم، ئەو ئایینەی کە بەرنامەی ژیانەو خەڵاتی پەروەردگارە بۆ بەندەکانی خۆی، بۆ نەوەی ئادەم لەهەموو کات‌و شوێنێکی سەرزەوییدا. جا من نامەوی ئەو خوایە لەخۆم برەنجێنم لەبەر خاتری زیتەی چاوی کابرایەکی بەدڕەوشت.

ئیتر هەق وایە پەیوەندیی من بەو ڕێبازە خواییەوە، خوای من‌و ئێوەو بوون بەتێکڕا، بەشتێکی سەیرو بەباوونەریتی کۆن نەزانن، من ئەمەوێ لەسەر یاساکانی ئەو ڕێبازە بژیم‌و بمرم، ئەمەوێ ژیانم تەرخان بکەم بۆ بڵاوکردنەوەو گەیاندنی ئەو ڕێبازە بەخەڵك، بۆ چەسپاندنی لەم سەر زەمینەی ژیاندا، هەتا بەڕووسووریی‌و سەربەزیی بچمەوە بەردەستی خوا.

سکالأ: ئۆی دڵپاك، قسەکانت دڵی ئادەمیزاد دێنێتە لەرزین، موچرکە دێنن بەلەشما، بەسە.. بەسە، ئەترسم.

ئاواز: لێمان ببورە.. توخوالێمان ببورە دڵپاك، هەستتمان بریندار کرد، هیوادارم لێمان ببوریت.

دڵپاك: من هەستم هیچ بریندار نەبووە، خوا لێتان ببوورێت.

بەپێچەوانەی بۆچوونەکەتەوە خوشکە ئاواز، زۆر شادمانتان کردم بەو قسانەی کە لەکانگای دڵتانەوە بەڕوون‌و ڕەوانیی هاتنە دەرەوە، ئای کە ئێستا خۆم بە بەختیار ئەزانم! ئای دڵخۆشم پێتان! ئەوەتا خەریکە سەرەتای ڕاست‌و ڕەوانیی لێتانەوە ئاسۆی دەرئەکەوێ، کە ئەوەش بەلای منەوە زۆر پێویست‌و گرنگ‌و گەورەیە

بانگی بێ "بانگ"م واز لێناهێنم

چەندێ بتوانم "تۆو" دائەچێنم

هیچ باکم نییە بڕوێ یان نەڕوێت

چونکە "شێخ" تەنیا هەر سێوی ئەوێت

بەڕێم شارەزام، کارم، ئەیزانم

درێغی ناکەم، لەوەی بتوانم

# گرێ کوێرەکە کرایەوە

**سکالاَ: زۆر سەرم سوڕ ئەمێنێ لە تۆ دڵپاك! بەڕاستیی من خۆم ئامادەكردبوو بۆ شەڕو هەرایەكی گەرمو گوڕ، بەتەمابووم یەكسەر دوای قسەكانی منو ئاواز یەخەمان بگریتو بێیت بەگژماندا، كەچی خۆت لێڵ نەكرد، بەزەردەخەنەیەكەوە وشەی شادمانیی و بەختیارییت دا بەڕووماندا!!**

**دڵپاك: ئەمەیان سەیرترە! دەی بۆ؟ لەبەرچی؟**

**ئاواز: بیستومانە كە هەركەس لەلای ئێوەمانانددا قسەیەك لەو قسانەی كە ئێمە ئاراستەی تۆمان كردن بەدەمیابێت، یەكسەر ئەدەن بەدەمیا، یاخود لەڕقا ئەو ناوە بەجێ ئەهێڵن.**

**دڵپاك: ئێوە بەچاوی خۆتان قەت شتی وەهاتان دیوە؟**

**سكالاَ: نەخێر، من شتی وەهام قەت بەچاوی خۆم نەدیوە، ئەوەتا لەتۆدا پێچەوانەكەیم بینی.**

**دڵپاك: خوشكان، بەشی زۆری ڕاستیی هەر بەو جۆرە لە چاوی خەڵك لارو خوار كراوەو ئەكرێت، خۆ ئەگەر لە موسڵمانێكی نەزانو نەشارەزاوە هەڵەیەك لەو بابەتەی كە بۆ ئێوەمانانیان باسكردووە ڕووی دابێت یان ڕوودات، ئەوە هۆیەكەی نەزانیی و نەشارەزایی و ساویلكەیی ئەو موسڵمانەیە نەك ئیسلام.**

**بەڵام ئێوە وەڵامی پرسیارەكەی منتان فەرامۆش كرد، ئایا ئێوە ڕازین لەشێوەی ئەوژیانەی كە تیایا ئەژین؟**

**سكالاَ: تەبعەن.. تەبعەن. ئەی بۆچی نا؟**

**دڵپاك: بەقایلبوونەوە، واتە بەقایلبوونی خودی خۆتانەوە یان لەژێر پاڵە پەستۆی باوو مۆدەی كۆمەڵایەتییدا، بەداڕشتنی تر یان دوای مۆدێل كەوتوون؟**

**سكالاَ: ئەتوانم بڵێم بەهەموویانەوە.**

**ئاواز: جا بۆچی ئەو ژیانەی ئێمە خراپە؟**

**دڵپاك: دەی ئێوەش زویر مەبن ئەگەر پێتان بڵێم: ئەگەر دەسانتیمەتری تریش تەنوورەكانتان كورت تر بكەنەوە، نەك سەرومل و گەردنتان، بەڵكو سنگ، پشت، سكیشتان دەربخەن بۆ زیتەی چاوە برسییەكان، لەوەش زیاتر دە ئەوەندەی ئەوان چاوتان بزیتێنن، ئیتر سەرزەنشتتان ناكەم، بەڵكو خەریكە بڵێم: گەر هەموو ڕۆژێ یان هەموو شەوێ خۆتان بخەنە باوەشی هەزار كەسەوە هێشتا هەر كەمەو ناتوانن كەلەبەرەكەی پێ پڕ بكەنەوەو ناشكرێتەوە.**

**سكالاَ: وس.. وس، بەسیەتی، ئەوە ئاگات لەخۆتە؟**

**ئاواز: ئەمەیان یانی چی؟ جۆرە فەلسەفەیەكی تری تازەیە؟**

**دڵپاك: زۆر چاك ئاگام لەخۆمە، هەروەها فەلسەفەكاریش ناكەم. ئەی لەبیرتان چووە كە لەیەكتر توورە نەبین؟ ئەی نەمانگوت خێرا هەڵنەچین؟ كوا مەرجەكەتان؟!**

**سكالاَ: ئۆۆو.. ڕاست ئەكەی، بەڵام تۆ تەنگەتاومان ئەكەیت.. تەنگەتاو! شتی خراپت پێگوتین.**

**دڵپاك: خوشكەكانم، من لەو قسانەی كە كردمن، مەبەستم تەنها ئێوە نییە، بەڵكو مەبەستم هەموو مێیەكی وەك ئێوەیە ئەی بۆچی وەها نەبن؟ ئادەمیزاد كە باوەڕی بەخوا، بە زیندووبوونەوە، بەپاداشتو سزا نەبێت، هەرچییەكی بۆ بلوێت بۆچی نەیكات؟ بۆچی بێ سنوور ورگو فەرجی خۆی نەلەوەڕێنێ؟ ئایا بێ باوەڕ لە ورگو فەرجی هیچی تری بۆ ئەمێنێتەوە؟ لە فەرهەنگی ئادەمیزادی وەهادا، پێم بڵێ ئەبێ جیاكەرەوەی چاكو خراپ، ڕەواو ناڕەوا چی بێت؟**

**سكالاَ: لەوەدا ـ واتە سەبارەت بە باوەڕی من بەخوا ـ زۆر چاك بزانە كە بەهەڵەدا چوویت، من لە تۆ زیاتر باوەڕم بەخوا هەیە، هەركەسیش باوەڕی بەخوا نەبێت، بەنەزانو گەمژەو بیرتەسكو مێشك پووچی ئەزانم.**

**ئاواز: ئەوەی باوەڕی بەخوا نەبێت باوەڕی بەبوونی خۆیشی نییە.**

**دڵپاك: سوپاس بۆ خوا.. سوپاس بۆ خوا، ئەوا گرێكوێرەكە كرایەوە، ئیتر هەر ئەوەندە هەروا بەڕاستو ڕەوانیی لەسەر باسەكەمان بەردەوام بینو هەڵ نەچین خوا یاربێت هەر ئەگەینە ئەنجام، چونكە گرێكوێرەكە كرایەوە.**

# خەڵك وەها دەڵێت

دڵپاك: خوشكان، ئێوە گوتتان كە باوەڕتان بەخوا هەیەو بێباوەڕ بەنەزان و گەمژەو خۆنەناس ئەزانن وانەبوو؟

سكالاَ: بەڵێ وابوو، پەشیمان بوونەوەم نییەو هەر وەهاشە.

ئاواز: ئەوە شتێكە كە عەقڵ ناتوانی دەسبەرداری بێت.

دڵپاك: زۆر جوانە، بەڵام باوەڕ كاتێك باوەڕە كە خاوەنەكەی بجوڵێنێ، بەڵگە بینوێنێ، هێزو تینی لەڕەوشتدا، لە گوفتاردا ڕەنگ بداتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئیمانەوە ئەفەرموێ: "ليس الأيمان بالتمني ولا بالتحلي ولكن هو ما وقر في القلب وصدقه العمل" رواه البخاري. یانی باوەڕ ئەوەیە لەدڵدا جێگیر بێت و كردار بیسەلمێنێ.

جا حەز ئەكەم پێم بڵێن، ئایا ئێوە باوەڕتان بەكەڵك و خۆشیی و كاریگەریی مۆسیقا هەیە؟

ئاواز: بێگومان، چونكە هونەرێكی خۆشەو مرۆڤ حەزی لێ ئەكات.

سكالاَ: دیارە مۆسیقا خۆشییەك دەدات بە دەروون.

دڵپاك: بەو هەموو حەزەوە كە لەنێو دڵتانا هەیەو پەنگی خواردووەتەوە لە دەروونتانا، ئایا ئەبنە مۆسیقاژەن؟

سكالاَ: نەخێر، چونكە تەنها بەحەزی ڕووت هیچ جێبەجێ نابێت.

دڵپاك: دەی هەر بەوجۆرەش باوەڕ بە تەنها، لە چالاَیی دڵدا، بێ ئەوەی بتجووڵێنێ، بتگۆڕێت بەس نییە، ئەبێ كارت تێبكا، ببێتە خولیای هەمیشەیت، لەگەڵ خوێنتا تێكەڵ بێ، بەجۆرێ جیابوونەوەت نەبێت لێی، بگاتە هەموو خانەكانی لەشت، بە ئەو بژیت، بۆ ئەو بژیت، باوەڕ ئەبێ بەمجۆرە بێت.

سكالاَ: ئێمە پەیمانمان دا بەیەكتر كە لەگەڵ یەكدا ڕاست و ڕەوان و بێ پێچ و پەنا بین، وا نەبوو دڵپاك؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، وابوو، ئەتەوێ پەشیمان ببیتەوە؟

سكالاَ: نەخێر، نامەوێ پەشیمان ببمەوە، جا وا بەو پەڕی ڕەوانییەوە پێت ئەڵێم: من باوەڕم بەخوا هەیە، بەڵام زۆر زۆر ڕقم لەهەموو ئایینێكە، بەتایبەتیی ئاینی ئیسلام.

دڵپاك: ئەگونجێت هۆی ئەوەم پێ بڵێیت ماموستا سكالاَ؟

سكالاَ: ئەی بۆچی نا؟ ئایینەكان هەر یەكەیان جۆرە كۆت و زنجیرێك بووە بۆ دەست و پێ بەستنی ئافرەت، هەمیشە چەكی دەستی پیاو بوون بۆ سەركوتكردنی، بەتایبەتی ئایینی ئیسلام. ئای كە دڵڕەق و ستەمكاریی نواندووە دەربارەی ئافرەت!

ئاواز: زیادەڕەویی نییە ئەگەر بگوترێت ئیشی سەرەكیی ئیسلام چەوساندنەوەو بەندكردنی ئافرەتە، بگوترێت هاتنی ئیسلام یانی زەوتكردنی سەربەستیی و یەكسانیی و تواندنەوەی ئافرەت، باشە، توخوا ئیتر بۆچی ڕقمان لێی نەبێت؟

دڵپاك: بەڵام خوشكان ئەوەی كە ئێوە ئەیڵێن لە چ ئایەتێكن لەكام سوورەتی قورئاندا، یاخود لەچ فەرموودەیەكی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرتان گرتووە؟ حەز ئەگەم نیشانی منیشی بدەن!

سكالاَ: من خۆم هیچ لەوانەم بەچاوی خۆم نەدیوە، چونكە من قورئانم نەخوێندووەو ناشارەزای فەرموودەكانی پێغەمبەریشم ﷺ.

ئاواز: خەڵك ئەوە دەڵێن، قابیلە ئەو هەموو خەڵكە درۆ بكات؟

دڵپاك: خەڵك وەها دەڵێت!! خوشكان، خەڵك هەمووی ئەو باس و قسانە ناكات، ئەبێ ئەوەش بزانیت كە خەڵكم هەمووی ڕاست ناكات هەروەك هەموویشی درۆ ناكات.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شادمانم كە هەندێ لەو قسانە كە لە خەڵك بیستووتانن سەبارەت بەوەی كە ئیسلام ئافرەت ئەچەوسێنێتەوە باس بكەن بۆم، بۆ ئەوەی پێكەوە بەوردیی هەڵیان بسەنگێنین، جا پاش شیكردنەوەیان ئەگەر ڕاست بوون وا منیش دێمە سەر بیروڕاكەی ئێوەو واز لە ئیسلام دێنم، خۆ ئەگە پڕوپەڵاتە بوون، پڕوپاگەندەی داتاشراو بوون ئەوا ئێوە وەك سەربەست، سەربەست تر بن و هەر ڕێیەك ئەگرن بیگرن.

سكالاَ: كچە خۆ ئەوەتا ئێوارەیە! بەكوێدا ڕۆژ تەواو بوو؟

ئاواز: ئەی نابێ شتێك بخەینە بەر دڵمان؟ هەڵسە دڵپاك نۆرەی ئیشی تۆیە، خێراکە، برسیمە.

دڵپاك: بەسەرچاو، هەر ئێستا ـ خوا یاربێت ـ خواردنی چاك‌و پاکتان بۆ پێئەگەیەنم. زویر مەبن.. ئاواتم ئەوەیە نەبمە هۆی ئەوەی دڵتان گەرد بیگرێت لەم غەریبییەدا.

"دڵپاك هەڵئەستێت‌و بەگورج‌و گۆڵیی خواردنی ئێوارە پێ ئەگەیەنێ‌و ئەیخاتە سەر سفرەو هەر سێکیان پێکەوە دەست ئەکەن بەخواردن".

دڵپاك: "اللهم بارك لنا فیما رزقتنا وقنا عذاب النار بسم الله".

سکاڵا: نانخواردنیش ئەم پێشەکییەی ئەوێ خانم؟

دڵپاك: سکاڵاگیان، خوا ئەم وتەیەی پێ خۆشە، خۆ تۆش بەدەمی خۆت ددانت نا بەوەدا کە باوەڕت بەخوا هەیە.

(لەنانخواردن ئەبنەوە)

دڵپاك: "الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا من حول ولا قوة منا وجعلنا مسلمین".

ئاواز: هەر بەپێشەکییەوە نەوەستایەوە، ئەوەتا پاشەکیشی بۆ هێنا! باشە ئەی لەمەوبەر بۆچ ئەمانەت نەئەگوت؟

ئەزانی لەمەبەریش ئەوانەم هەر گوتووە بەڵام لەدڵدا. من وام ئەزانی ئێوە باوەڕتان بەخوا نییە، سوپاس بۆ خوا بۆم دەرکەوت کە باوەڕدارن، لەبەر ئەوەش خۆشەویستیتان لەناخمدا زۆر چاك ڕیشەی داکوتا، ئیتر بەپێویستم زانی بەئاشکرا بیڵێم بۆ ئەوەی ئێوەش فێری ببن و بیڵێن، ئەی نابێت ئادەمیزاد سوپاسی پەروەردگارە ڕۆزی دەرەکەی بکات؟ ئایا ئەگەر سوپاسی نەکات بە سپڵە ناژمێرێت؟

پیشەی سپڵەیی هی پشیلەیە
بۆ ئادەمیزاد نەنگ‌و لەکەیە
نەکەی سپڵەبی خۆ تۆ ئینسانی
چۆن ئەبێ ڕێزو نرخت نەزانی؟

## حەز لەو باسە ئەکەم

ئاواز: ئای چەند خەوم دێت! خەریکە کوێر ئەبم.

سکاڵا: ئێ، چیت کرد؟ خۆ مریشك نین هەر ئێوارە بخەوین، با دوو قسەی بەکەڵك بکەین. دڵپاك حەز ئەکەم بچینەوە سەر باسەکەمان.

دڵپاك: بەسەر چاو، منیش حەز ئەکەم ئەو پڕوپاگەندانەی کە بیستووتن‌و بەسەلمێنراو لەمێشکتدا بنبەست بوون، بییانخەیتە ڕوو تا پێکەوە شیتەڵیان بکەینەوەو بگەینە ئەنجام.

ئاواز: ئەترسم زویرو دڵتەنگ ببیت.

دڵپاك: من؟! لەوە مەترسن، هەرچی لەمێشك‌و دڵتانا کۆبۆتەوە ڕاستەو ڕوو بێ ترس دەری بڕن، بپرسن، منیش هەرچییەك بزانم، وەڵامتان ئەدەمەوە، وەڵامی هەرچییەکیشم نەزانم ئەوا پەنا ئەبەمە بەر سەرچاوە، سەرچاوەی زۆر هەیە و بەئاسانیی دەست ئەکەون تکایە بپرسن.. بپرسن.

سکاڵا: وەك پێم گوتی ئەڵێم سەرەتا بەدبەختیی‌و چەوساندنەوەی ئافرەت بەشێوەیەکی بەرفراوان لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە دەست پێ ئەکات، لەبەر ئەوە منیش حەز لەچارەی ئیسلام ناکەم.

دڵپاك: وەك گوتتان، ئێوە نەشارەزای ئیسلامن‌و لە داواکانتاندا پشت بە "ئەڵێن" ئەبەستن، جا با بۆ ئەم مەبەستەو بەنیازی دەرخستنی ڕاستیی، سەرێك لە سەرچاوە مێژووییەکان بدەین‌و بزانین گوزەران‌و باری ئافرەت لەپێش دەرکەوتنی ئیسلامدا، لە گەورەترین‌و بەناوبانگترین شوێنەکانی جیهانی ئەو سەردەمانەدا چۆن بووە، واتە کورتەیەکی مێژووی گوزەران‌و ژیانی ئافرەت لەپێش هاتنی ئیسلامدا باس بکەین، ئەوسا خۆتان حەکەم بن، ئەنجامەکە بەوردیی بدەنە بەر تیشکی عەدەسەی مێشك‌و ژیریی خۆتان‌و خۆتان پەند لەژیانی وەربگرن، بێگومان ئەتوانن ڕاست لەناڕاست بەئاسانیی جیابکەنەوە.

سکاڵا: بەخوا من زۆر حەز لەو باسە ئەکەم‌و بەتاسەوەم بۆی، فەرموو دەست پێ بکە، گوێت لێ ئەگرم.

دڵپاك: زۆر باشە، بەپشتیوانی خوا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

# بەشی دووەم

## ئافرەت پێش هاتنی ئیسلام

دڵپاك: یەكێك لە نووسەران بەناوی "بهي الخولي" لە پەڕاوی "الأسلام والمرأة المعاصرە"دا نووسیویەتی: "كاتێ مێژوو یان چیرۆكی شارستانییەتی مرۆڤ ئەخوێنیتەوە، ئەبینی بریتییە لە تاقیكاریی پڕ لە زەحمەتی یەك بەدوای یەكدا هاتوو، ڕەگەز "عنصر"ی نەفامێتیی‌و كۆچەرێتیی‌و ترس‌و دڵە ڕاوكێ‌و خۆپەرستیی‌و تاسەی دوژمنكاریی‌و خۆبەزلزانین‌و چەندانی تر لەو جۆرە ڕەگەزانەی تێدا دیارە، تاقیكارییەك كە تیایا ئەبینین لەو ساتەوە كە لەزۆرانبازیی درەندەكان ڕزگاربوون ڕوویكرد بەلای زۆرانبازییەكی كەوە، دژ بەبرای مرۆڤی.

بەوجۆرە چەندەها لاپەڕەی تری خوێناوی بەهۆی جەنگ‌و هێرش بردنە سەر یەكترو تاڵانكردنەوە، بەهۆی بە بەندەكردنی ساواو گەورەوە هەتاكو بكرێتە نۆكەرو خزمەتكاری لایەنی سەركەوتوو لەناو ماڵدا، لەزەوییەكەیدا، لە ئاژەڵ لەوەڕاندن‌و چەندان ئەركی تردا، چەندان لاپەڕەی تری خوێناویی تۆمار كرد..

ئایا نەدەگونجا مرۆڤ لەو جەنگ‌و هەرایەدا ئافرەتی سك پڕ، شیردەرو لاوازو نەخۆش‌و پیر عەفوو بكات؟ ئایا نەدەگونجا لەكاتی بەشكردنی دەسكەوتی ئەو جەنگانەدا ئافرەت لەبەشكردن بەدەر بوایە؟

ئایا بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ‌و هەرا نەئەبوو پرس‌و ڕاوێژ بە ئافرەتیش بكرایە؟

دوو هۆی گرنگ لە كۆندا سنووریان بۆ نرخ‌و پلەی ئافرەت كێشابوو، یەكەمیان: ئافرت مێینەیە "انثی"، ژیانیش پێویستی بە نێرینەیە بۆ جەنگ‌و بەرگریكردن لە ژینگە "البیئة"ی كۆندا. دووەمیان: كاری ئافرەت شتێكی ترە نەك هەراو جەنگ كردن. ئەو دووهۆیە كاریگەرییەكی بە بڕشتیان هەبوو لەوێنەكێشانی باری كۆمەڵایەتیی ئافرەتدا..".

سكاڵا خان، لەوەی كە بیستت چاوەڕێی چی ئەكەن بۆ ئافرەتی كلۆڵ‌و بەدبەخت لەو سەردەمانەدا؟ خۆ سەردەمی پێش دەركەوتنی ئیسلا بووە!

سكاڵا: ئەوەم دێتە بەرچاو كە ئافرەت لەناو تەپ‌و تۆزی مەیدانی جەنگدا نوقوم بووەو شاراوەتەوەو دەرناكەوێت.

ئاواز: لایەنی سەركەوتووش ئافرەتی بەدیل گیراوی لایەنی ژێركەوتووی وەك مێگەلی تاڵانكراو داوەتە بەرو بە پەلە لێی ئەخوڕێ.

دڵپاك: وێنەكێشان "تصویر"ەكانتان زۆر جوان‌و پڕ مانابوو، بەڵام سەد خۆزگە دەرنەكەوتوو شاراوە بوایە، وەك ئاژەڵ سەربڕدرایە، خۆ ئەگەر وەها بوایە زۆر بەختەوەرو سەربڵندو خاوەن شكۆ ئەبوو، چونكە ڕزگاری ئەبوو، ئەبڕایەوە، بەڵام ئەوە دەستی نەداوە بۆی، بە خەویش نەیدیوە بەخۆیەوە.

ئای! خوشكان، لەو بارو حاڵ‌و ژینەی كە ئەو بەدبەختانەی تێدا ژیاوە، سەرزەنشتم مەكەن ئەگەر قسەم بۆ نەیەت‌و بەجوانیی نەتوانم باسەكەتان بۆ دابڕێژم، لە داخ‌و شەرما خەریكە قوڕگم دابخرێت، دڵی ئەوێ توانای خۆگرتنی هەبێت.

هەرچەندە سەیری مێژوو ئەكەم شەرمەزارو پێی پیر ئەبم،
هەرچەند گەواهیی ئەبیسم پەست‌و مات‌و زویر ئەبم
ئاگربەر ئەبێتە گیان‌و لەشم تەزووی كاریگەری شەرم
چ بۆ ئەوسا، چ بۆ ئێستا ئای! كە زیزو دڵگیرئەبم
لەمەوپێش من وام ئەزانی ئەم پلان‌و فێڵ‌و داوە
یەكەم جارە، تازەبابەتە، خەڵكی تازە دایهێناوە
چینی ئافرەت ژێر چەپۆكیی، چەوسانەوەی قەد نەدیووە
كەچی مێژوو كە دێتەگۆ ئەوەی ئەمرۆ بەجێماوە.

ئاواز: بەڵام کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمە ناژیرو دواکەوتوو بوون.

دڵپاك: منیش مەبەستم ئەوە نییە کە بیسەلمێنم ژیرو پێشکەوتوو بوون، بەڵام خۆ کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ خاوەن شارستانییەتن، ئایا لە سایەی شارستانییەتەکەیاندا ئافرەت ئازادە؟

لەلایەکی ترەوە، ئەمەوێ بزانن کە ئیسلام نەك ئافرەتی بەدبەخت نەکردووە، بەڵکو خستوویەتیە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی.

## ئافرەت لە یۆناندا

دڵپاك: یۆنانییەکان ژیرترین گەلو خاوەنی پێشکەوتوترین شارستانییەت بوون لە مێژوودا، لەچەرخە سەرەتاییەکانیاندا ئافرەتیان لە تێکشکاوترینو نالەبارترین ژیاندا بوون، گوزەرانی لەپلەیەکی زۆر نزمدا بوو، لەڕووی ڕەوشتو مافی یاسایی‌و خووڕەشتی کۆمەڵایەتییەوە هیچ سەنگو پلەیەکی لەناویاندا نەبوو، ئافرەتیان لەژێر تیشکی ئەفسانەیەکی کۆنی خەیاڵییەوە تەماشا ئەکردو تێیان ئەڕوانی، بەپێی ئەو ئەفسانەیە سەرچاوەی ئافرەت "باندورا" بوو، ئەویش ڕەگو ڕیشەی هەموو دەردو ئەشکەنجەیەکی مرۆڤی بوو، بەهۆی ئەوەشەوە ئافرەت لەناویاندا لەنزمترین پلەدا سەیر ئەکرا، لەوپەڕی زەلیلیی‌و سەرکزیی‌و بەدبەختییدا بوو لەهەموو لایەنێکی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە پلەکانی ڕێزو سەربەرزیی ناو کۆمەڵگە هەموویان تایبەتیبوون بۆ پیاو.

ئاواز: ئاخ پیاو ئاخ، خۆزگە دەستەڵاتم ئەبوو بەسەرتا.

دڵپاك: لەسەرەتای چەرخی وریابوونەوە ئەو ژیانەی کە ئافرەت تێیدا بوو بە نەگۆڕاوی مایەوە تا زانست بڵاوبۆو، شارستانییەت پەلوپۆی کرد، ئافرەتیش لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا بەرز بۆوە، ژیانی لەجاران چاکتر بوو، گەرچی پلەی لەڕووی یاساوە هیچ نەگۆڕا، بووە بەڕێوەبەری ماڵ، ئەرکی سەرشانی لەچوارچێوەی ماڵدا سنووری خۆی وەرگرت‌و دەسەڵاتی تەواوی تێدا پەیدا کرد، داوێن پاکیی‌و بێگەردی "العفاف" بە نرخترین شتی ئافرەت بوون‌و هەر بەوانەش نرخی دیاری ئەکرا، پەردەو حجاب لەخێزانە بەرزەکاندا باوی پەیداکرد، خانووەکانیان لەدوو بەش دروست ئەکرد، بەشێك بۆ ئافرەتان‌و بەشێك بۆ پیاوان، ئافرەتەکانیان لەشوێنی دانیشتن‌و یانەو شوێنە گشتییەکانی تردا تێکەڵ‌و بەشدار نەئەکرد، ئافرەت خۆیشی لەوشوێنە گشتییانە وەدەر نەئەخست، شووکردنی‌و بەستنی خۆی بەتەنها بەمێردەکەیەوە لەنیشانەکانی ڕەسەنیی‌و شەرەفمەندیی ئەژمێررا.

سکاڵا: دیارە.. دیار، بێگومان شارستانییەت هەمیشە بۆ ئافرەت لەبارە، باڵی نازو نرخی بۆ ئەکاتەوە.

دڵپاك: بەپێچەوانەی ئەوانیشەوە ژیانی بەرەڵلایی‌و بەدڕەوشتییان بەلاوە زۆر ناپەسەند بوو بەقێزەونیان ئەزانی.

سکاڵا: ئەها.. ئەها.. ئەوەتا ڕاستم گوت! شارستانییەت!! ئەی چۆن؟!

دڵپاك: بەڵێ لە چەرخێکدا وەها بوون، کە نەتەوەی یونانیی هێزو توانای لەسەرەتایدا بوو، هێشتا خونچە بوو، ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو گەشەکردن‌و خۆشگوزەرانیی ئەچوو، بەڵام هەر لەو چەرخەشدا وردە بەدخوویییەك لەناویاندا هەر هەبوو. گەرچی لەسنوورێکی تەسکدا بوو. هۆی ئەوەش ئەوەبوو پیاوان، وەك ئافرەتان، داوای داوێنپاکیی وبێگەردییان لێنەئەکرا، یانی ئەوان لە داوالێکردنی ڕەوشتپاکیی بەدەربوون، دیارە ئەوەش شتێکی زۆر هەڵە بووە.

هەر ئەو سەربەستییەی کە پیاوان بۆ خۆیان دایانبڕی بوو، بووە هۆی دروستبوونی دانە دانەیەك لەئافرەتی داوێن پیس‌و بڵاوبوونەوەی کاری گەند لەگیانی کۆمەڵگەی یۆنانییدا بەجۆرێك ئیتر لێی نەبڕێت.

ئینجا بەرە بەرە هەوەس‌و ئارەزووری دەروون بەسەر خەڵکا زاڵ بوو، ئاگری قڕ "الرغبة"ی ئاژەڵییانەی بێ ئامان خستنیە پێش خۆی، بەو بۆنەیەشەوە ئافرەتی داوێن پیس‌و بەدڕەوشت جێگایەکی زۆر بەرزی لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا دابڕکرد کە وێنەی لەمێژووی مرۆڤایەتییدا نییە، ئیتر "..."کان بوونە مەڵبەندێکی وەها کە هەموو چینەکانی گەل ڕوویان تێ بکەن، بوونە شوێنێ کە فەیلەسووف‌و هۆنەرو ویژەوانەکان تێیان بخزێن، بوونە خولگەیەك کە ئەستێرەکانی فەلسەفەو ویژەو هۆنراوەو مێژوو هونەرەکانی تر بە دەوریدا بسوڕێنەوە، یاخود بوونە خولگەیەك کە دەستهاڕی نەتەوەی یونانیی بە

دەوریا بسووڕێتەوە، ئافرەتە داوێن پیسەکان نەك هەر تەنها سەرۆکایەتیی یانەکانی زانیاریی و کۆڕەکانی وێژەیان ئەکرد، بەڵکو گیروگرفتە ڕامیارییەکانیش لەبەردەمیانا، بەڕاوێژی ئەوان ئەخرانە ژێر تیشکی چارەسەرکردنەوە.

ئەو هەڵەشەییە لەو ڕووەوە گەیشتە ڕادەیەکی وەها تەنانەت لەو گیروگرفتانەدا کە بەهۆیانەوە دواڕۆژی نەتەوەی یۆنانی پێ بەرز یان نرم ئەبۆوە، یان مان و نەمانی بەو هۆیانەوە بەسترابوو، ئەخرانە بەردەست ئافرەتێك بۆ بڕیاردان لەسەریان کە لە شەوێك یان دوو شەوێك زیاتر ڕووی بە پیاوێك نەئەداو هەوارگەی ئەگواستەوە بۆ لای پیاوێکی ترو لەتێرکردنی "الجنس" بەو لاوە بیرو هۆشی بەسەر هیچی ترەوە نەبوو.

ئاواز: ناسکە نەتەوەو ناسکە شارستانییەت!!

دڵپاك: ئەی بەتەمای چین؟ شارستانییەت بەبی باوەڕبوون بەخواو بە گیان و زیندووبوونەوە هەروا دەرئەچێت.

خۆشەویستیی جوانیی "حب الجمال" لای یۆنانییەکان زیاتر پەرەی سەند بەجۆرێك ئاگری خستە دەروونیانەوە، دامرکاندنەوەو کوژانەوەی جێگای هیوای هیچ کەس نەبوو، پەیکەرەکانیان لەشێوەیەکی ڕووتدا دروست ئەکرد، ڕووتییەك کە زۆر وردەکارییان تێدا ئەکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ چەش "ذوق"یاندا بگونجێت، ئەو پەیکەرانەیش ئەبوونە هۆی بزواندن و جۆشاندنی ئارەزووە ئاژەڵییەکان و زیاتر گڕی تێبەرئەدان.

بەوجۆرە سەنگو پێوەری ڕەوشت لەناویاندا گۆڕا، هەتا گەیشتە ئەوەی داوێن پیسی و سێکسبازی لەبیرو باوەڕی زاناو فەیلەسووف و زانایانی ڕەوشتدا بەخراپە دانەنرێت و سەرزەنشتی هیچ کەسی لەسەر نەکرێت.

ژنهێنان لەناویاندا بێ نرخ و بێکەڵك بوو، گوێیان نەئەدایە، هەتا لە ئەندامی ئەوەشدا ئایینەکەشیان ملکەچ کرد بۆ ڕەفتارو ئارەزووە بڵێسەدارەکانیان، ئینجا پەرستنی "ئەفرۆدیت" لەناویانا هاتە کایەوە، بەپێی ئەفسانەکانیان ئەو ئافرەتە ژنی خوایەکیان بووەو خۆی خستۆتە باوەشی سێ خوای ترەوەو چوونەتە لای تەنانەت ئەوەی لەگەڵ پیاوێکی ئاسایشدا کردووە، "کیوبید" خوای خۆشەویستیی لەسکی ئەودا هاتۆتە دەرەوە!!

خوشکان، بیروڕاتان چییە سەبارەت بەگوزەرانی ئافرەت لەناو نەتەوەو کۆمەڵگەیەکی ڕەفتارو گیان گەنیوی وەهادا؟

سکاڵا: ئەم یۆنانەی کە باست کرد، ئەو یۆنانەیە کەڕۆشنبیرانی ئەم چەرخەمان بیرو ڕاو بیردۆزەکانیان زیندوو و دەمەزەرد ئەکەنەوەو ئەیانەوێ بیانکەنە ڕێبازی ژیانی چەرخیی و ژیانی سەدە داهاتووەکانی تر؟!

ئاواز: زیادەڕۆییان لەسنوور بەدەر بووە.

دڵپاك: بەڵێ ئەمەی باسمکرد ئەو یۆنانەیە، ئینجا کاتێ پەرستنی ئەفرۆدیت بڵاو بووەوە "..."ە خانەکان، شوێنەکانی تری داوێن پیسیی بوونە جێگای پەرستش "العبادة"، تیاترۆ و باشۆکییەکان بوونە زیرگەوان و خادمی ئەو پەرستگایانە، ئەمجا شکۆی زیناکردن ئەوەندە بەرزو بووەوە، هەتا کاڵای کارێکی ئایینیی و پیرۆزی بەباڵادا بڕرا، ئەوەش هەمووی لەسەر حیسابی ئافرەت ئەکرا.

بەوەشەوە نەوەستاوە، داوێن پیسیی لەجۆرو ڕواڵەتێکی تردا لەیۆناندا دەرکەوت، بەڵێ، لەشێوەی "نێربازیی"دا، بەشێوەیەك خەریکبوو تەڕو وشك پێکەوە بسووتێن، ئایین و ڕەوشتیش بەسنگێکی فراوانەوە پێشوازییان لەوە کرد، باوەشیان بۆ کردەوە ئەوکارە چەپەڵ و گڵاوە کە پێچەوانەی یاسای سروشتە، کە فیترەتی مرۆڤ قێزی لێ ئەکاتەوە وەها لەیۆناندا بڵاو بووەوە کە هونەرمەندە "دەس ڕەنگینەکان"لە تابلۆ هونەرییەکانیاندا بەنیازی سۆزی خۆشەیستییەوە دەریان ئەبڕی! زاناکانی ڕەوشتیش لایەنگرییان ئەکردو ئەیان گوت: "پەیوەندییەکی دۆستایەتییە لەنێوان دوو پیاودا!!".

ئەو دوو یۆنانییەی کە نەتەوەی یۆنانیی ڕێزی فەرامۆش نەکردن و زۆر شانازیی پێوە ئەکردن، تەنانەت پەیکەری بۆ کردن، چونکە ئەو خۆشەویستییە کردبوونی بەخۆشەویستی یەکتر "هرمودیس و ئەستوجتن" بوون[1].

ئاواز: حەیفە ئەوانە بە پێشکەوتوو و خاوەن شارستانییەت ناو ببرێن.

[1] گەلێ سەرچاوە بەتایبەتی "الحجاب"ی "ابو الأعلا المودودي".

دڵپاك: حەیف بێت یان نەبێت منو تۆ ناومان نەناون بەخاوەن شارستانییەت، بەڵكو ئەوە كاری مێژووەو مێژووش بەو جۆرە باسیان ئەكات.

مێژوو شاهیدە لەدوای ئەوە یۆنان ئیتر بڵندیی و شكۆی بەخۆیەوە نەدی.

سكالاّ: ئۆش! دڵپاك، موچركە دێت بەلەشما، خەریكە مێشكم ئەتەقێ، نەفرەتی مێژوو بەدوایانەوە نەبڕێت، من هەر ئەوەم بیستووە كە یۆنان یەكەمین هێلانەو مەڵبەندی شارستانییەتی مرۆڤایەتیی بووەو گێتیی بەتێكڕا قەرزاریانە، لەبەر ئەوە زۆرم خۆش ویستووەو ناوەكەم بەڕێزەوە لەمێشكما تۆمار كردووە.

دڵپاك: ئەوانە بیرۆكەرەوەكانیان، مێژوونووسە مەزنەكانیان ئەیانگوت: "ئەبێ ناوی ئافرەت وەك ئافرەت خۆی لەناو ماڵدا بەند بكرێت"[1].

گوێبگرن لە "دیموستین"ی بەناوبانگ كە دەڵێت: "ئێمە سەر لە تیاترۆكان ئەدەین بۆ لەزەت چەشتن، دۆستو ماشقە ئەگرین بۆ ئەوەی تەندروستیی ڕۆژانەی لەشمان باش بێت، ژنیش ئەهێنین بۆ ئەوەی منالّی شەرعییمان بۆ بێننە كایە"[2].

بەوپێیە ئافرەت كە لە ماڵی باوكییەوە ئەگوێزرایەوە بۆ ماڵی مێردەكەی بۆ ئەوە نەبوو كەبیبێتە خانمو گەورەی ماڵ، بەڵكو بۆ سككردن، بۆ زاوزێو منالّ بەخێوكردن بوو.

"هیزیود"ی یۆنانیی حەوت سەد ساڵ پێش زانین ئەی گوت: "با ماڵێكو ژنێك و مانگایەكت هەبێ، بەمەرجێ ئەو ژنە هەر بۆ ئەوە بكڕیت كە سەرپەرشتیی مانگاكەت بۆ بكات"[3].

هەروەها "سقرات" لە "قریقوبل"ی پرسی: "ئایا لەناو ناسراوانتدا كەس هەیە لەژنەكەت كەمتر لەگەڵیا قسە بكەیت؟"[4].

سكالاّ: خۆزگە زووتر ئەمەم ئەزانی، ئەم هەموو شتانەمان لێ شاراوەتەوەو چەند شتێكی كورتی پچڕ پچڕمان ئەدرێتێو ئێمەش وا ئەزانین ڕاستیی هەر ئەوەیە!

دڵپاك: لەوەدا لەگەڵتام، بەڵام هەركەس مەیل بكات ئەتوانێ لەسەرچاوەكاندا بخوێنێتەوەو دوای بەراوورد و هەڵسەنگاندن ڕاستیی دەست خۆی بخات.

لەنیوەڕۆژێكی ڕووندا "دیوجین"ی فەیلەسووف چرایەكی هەڵگرتو دەستی كرد بەگەڕان لەبازاڕێكی گەورەی یۆناندا، خەڵكیش بەسەرسوڕمانەوە دوای كەوتنو لێیان پرسی: ئەو چرایە چییە پێت؟ لەوەڵامدا وتی: "ئەمەوێ مرۆڤێك بدۆزمەوە". نازانم سەرزەنشتی دیوجین ئەكەن؟

ئاواز: بەخوا هەر مەگەر خۆی بەقەد خۆی ژیر بووبێت، ئافەرینی بێ، بەڵام ئەزانن كاتژمێر چەندە؟ بەیانی خەبەرمان نابێتەوە.

## ئافرەت لەڕۆماندا

ئاواز: لەڕاستییدا دڵپاك باسو بابەتەكەی دوێنێ شەو بەتام بوو، ئەمڕۆ تەنانەت لەكاتی وانە وتنەوەشدا لەگوێمدا هەر ئەزرنگایەوە.

سكالاّ: خوا خوام بووە زوو دەوام تەواو بێت تا بێینەوەو دەستی پێبكەینەوە، دڵپاك توخوا لەسەر باسەكە بڕۆ.

---

[1]ـ حياة اليونان: ول ديورانت، تەرجەمەی: محمد بدران.

[2]ـ مبادئ القانون الروماني: د. محمد عبدالمنعم، د. عبدالمنعم البدراوي.

[3]ـ المرأة في القرن العشرين: جروان السابق.

[4]ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دڵپاك: بەسەرچاو، ئێستاش باسی ئافرەتتان لەڕۆماندا بۆ ئەكەم. ئەوانەی لەدوای یۆنانییەكان كە تاجی شارسشتانییەتیان كردە سەر ڕۆمانەكان بوون، ئافرەت لەناویاندا زنجیرەیەك بەرزیی و نزمیی بەخۆیەوە دی، لەسەردەمی یەكەمین كۆمارییاندا، پیاو سەرۆكێتیی ئایینیی و ڕامیاریی، بەڕێوەبەری دارایی خێزان، دەسەڵاتدارێتیی بەسەر ژن و ماڵ و منداڵدا، هەمووی هەبوو، تەنانەت لەهەندێ حاڵەتدا مافی كوشتنی ژنەكەی خۆی هەبوو، هەموو مافێك لەڕووی كڕین و فرشتن و خەرجكردن و.. هتد، لەدەست پیاودا بوو.

ئاواز: بەواتایەكی ڕوونتر ئافرەت كڵۆڵ و بەدبەخت بوو.

دڵپاك: ئافرەت هیچی بەدەستەوە نەبوو، چونكە (بەپێی بیری ئەوان)، ئافرەت لەڕووی یاساوە نەشیاو بوو، یاسا مێیەتیی "الأنوثە"ی بەیەكێك لەهۆیەكانی نەشیاویی دەژمارد هەر وەك شێتیی و كەمتەمەنی كە دوو هۆی نەشیاو بوون و نەئەبوو نەئەكرا سەروكێتیان پێ بسپێردرێت. كە مێردەكەشی ئەمرد بەكوڕەكانی یا برا یا مامی مێردەكەی ئەسپێررا.

ڕۆمانەكان وردە وردە بەرەو پێشكەوتن چوون، باری سەرشانی ئافرەتیش ڕووی كردە سووكبوون، بەڵام پەردە "الحجاب" لەناو ئەماندا دەرنەكەوت، لەڕێگەی یاسای خێزانەوە ژن و منداڵیان توند بەستبۆوە، داوێنپاكیی بە چاوێكی بەرزو بەڕێزەوە تەماشا ئەكرا، بەتایبەتیی لەئافرەتدا، بەڵێ، داوێنپاكیی تاكە پێوەرێك بوو بۆ پێوانەی شەرەف و ئابڕوو نرخ بۆ دانان، لەبەر ئەوە پلەی خووڕەوشت لەناویاندا بەرز بوو، بەپێی ڕەوشت و ڕەفتاریان دروست نەبوو پیاو و ئافرەت بەبێ مارەكردن لەیەكتر بكەون، ئافرەتیش تا نەبووایە بەدایك و خاوەن خێزان ئەو پلەو نرخە بەرزەی بۆ نەئەبوو.

تیاترۆ باشۆكیی و ناپاك هەرچەندە هەبوون و چینێكی جیاوازیان پێكهێنابوو پیاویش جۆرە سەربەستییەكی هەبوو بۆ ڕابواردن لەگەڵیانا، بەڵام بەچاوێكی سووك تەماشا ئەكران، بێ نرخ بوون لەناو كۆمەڵگەدا، تەنانەت هەر پیاوێك ئامۆشوی بكردنایە لەبەرچاوی خەڵك سووك و ڕیسوا ئەبوو.

سكاڵا: ئەمانە باش بوون.. باشبوون، لام وایە ئێمە قەرزاری شارستانییەتی ئەمانەین، خەڵك نماوەكانیان لێ گۆڕاوە، ڕۆمانیان لای بۆتە یونان.

دڵپاك: نەخێر، خوشكە سكاڵا، لێیان نەگۆڕاون، بەڵام تۆ پەلەت كرد، پەلە، ئەوەی كە گوتمان لەسەرەتای هاتن و شارستانییەتیاندا بوو، ئەمانیش كە پێشكەوتن تێڕوانینیان بەرامبەر ئافرەت گۆڕا، ئیتر گۆڕان بەسەر یاسا و ڕێبازەكانی خێزان و ژنهێنان و شووكردن و تەڵاقداندا هات، بە جۆرێك هەموو شتێك سەرەو ژێر بووەوە جووتسازیی، "الزواج" لەناویانا واتای خۆی بزركرد، زۆر كەم گوێیان پێئەدا، پەیوەندیی ژن و مێردایەتیی كزو بێتین بوو، هەموو مافێكی ئافرەت لەمیرات، خاوەنداریێتی، لایەنەكانی تری دیاریكراو دیاری كران، یاسا ئافرەتی سەربەست كرد، ئیتر نە باوك نەمێرد دەسەڵاتی بەسەریا نەما.

ئاواز: بەخ.. بەخ، لەو شارستانییەت و پێشكەوتنە! دیارە ئەوانە باشبوون، ئەوەتا ئافرەتیان سەربەست و ئازاد كردووە.

دڵپاك: ئافرەت سەربەخۆیی ئابووریی پێبڕا، ئەمەش بەشێوەیەكی ئەوەندە سەرسوڕهێنەر ئافرەتی دەوڵەمەند كرد كە زۆر لەپیاوەكانیان پارەیان لە ژنەكانیان قەرز ئەكرد.

سكاڵا: ئەمەیانم زۆر لاجوانە، دەستیان خۆش بێ، ئەوەم زۆر بەدڵە.

دڵپاك: بەڵام ئایا ئەزانن كە پارەیان بەسووكاریی ئەدا بە مێردەكانیان؟ زۆر جاریش پیاو بەهۆی ئەو قەرزەوە ئەبووە بەندە "العبد"ی ژنەكەی، جگە لەوەش تەڵاقدانیان ئەوەندە ئاسانكرد، بەهۆی ئاسانترین و سادەترین شتەوە بەكاریان ئەهێنا.

ئاواز: باوەڕم پەیداكرد كە بەسۆزترین نەتەوەبوون بەرامبەر ئافرەت.

دڵپاك: ڕەنگە ئەو قەسابەی بەرخ دائەبەستێ لەماڵدا بۆ ئەوەی زۆر چاك قەڵەو بێت بەسۆزترین كەس بێت بۆ بەرخەكە بەلای تۆوە ئاواز!! ئەها فەیلەسووفێكی بەناوبانگیان "سینكا" هاواری لێ هەڵساوەو ئەڵێ: "تەڵاقدان ئەمڕۆ لەڕۆماندا وای لێهاتووە شەرمو شوورەیی تێدا نەماوە، تەنانەت ژنان تەمەنی خۆیان بەژمارەی شووكردنەكانیان ئەژمێرن"[1].

"مارشل" باسی ئافرەتێك ئەكات كە دە شووی كردووە، "جوینل" باسی یەكێكیی تر ئەكات كە لەماوەی پێنج ساڵدا خۆی خستۆتە باوەشی هەشت مێردەوە. "قدیس جروم" باسی یەكێكیتر ئەكات كە بیستو سێ شووی كردووەو دوا مێردی پیاوێك بووە كە ئەو ژنە بیستو یەكەمین ژنی بووە! خۆ دیارە حیسابی قەراغو بیجاخیان بۆ نەكراوە، واتە هەر باسی شووە یاساییەكانیان كردووە.

سكاڵا: ئێ!! دڵپاك، دڵمت سارد كردەوە، وادیارە ئەمیش هیچ.

دڵپاك: ئەمجا تێڕوانینیان سەبارەت بە ژنو پیاو لە ڕێگەی پەیوەندیی حەرامەوە زیاتر گۆڕا، تا لەم دواییەدا گەیشتە ئەوەی كە زاناكانی ڕەوشت زینایان لابووە شتێكی ئاسایی، ئەوەتا "كاتا" ڕێگەی داوێن پیسیی لەسەردەمی گەنجێتیدا بەمرۆڤ ئەدات وە "شیشرون"ی چاكساز "المصلح" ڕای وابوو كە گەنجەكان خۆیان نەبەستنەوە بەكۆتو زنجیری ڕەوشتەوەو بەرەڵڵا بن!!

"ئیبكتیتس" هەر لەخووڕەوشتی هەڵئەدا بەقوتابییەكانی خۆی ئەگوت: "لەچوونە لای ئافرەت پێش ژنهێنانو شووكردن دوور كەونەوە ئەگەر توانیتان، بەڵام ئەگەر نەتانتوانی یان گەر كەسێك دەسەلاتی بەسەر خۆگرتندا نەبوو سەرزەنشتی مەكەن"[2].

بەوجۆرە شیرازەی خووڕەوشت لەناو كۆمەڵگەی ڕۆمانیشدا پچڕاو دوای ئەوە شەپۆلێكی فراوانو بەهێزی بەرەڵڵاییو بێ ئابڕوویی پەیدا بوو، شانۆكان بوونە پێشانگای خۆنواندنو خۆدەرخستن بەڕووتییو خۆنیشاندان بەبێبەرگیی ڕەواجی پەیدا كرد. ناو ماڵەكان بەوێنەی ڕووتو قووتی بێ ئابڕوو پڕ لە بێ شەرمیی ڕازێنرانەوە، بەدوای ئەوەشدا تیاترۆو پیشەی پاشكۆیەتیی ئەوەندە ڕەواجی پەیدا كرد هەتا هەموو ماڵێكی گرتەوە بەشێوەیەكی فراوانی وەها كە ڕۆمانەكان هەر خۆیان لێی وەڕس بوونو كەوتنە هاوارو سكاڵاكردنو لەسەردەمی حوكمی "تائی بیرس"دا (٤ پ. ز . ٣٧ن) یاسایەك سەبارەت بەقەدەغەكردنی پیشەی "..." گەریی ئافرەتان دانرا.

شانۆگەری "فلۆرا" هەنگاوێكی گەورەی ڕۆمانەكان بوو لە بێئابڕوویدا، چونكە لەو شانۆگەرییەدا ژنان بەڕووتیی لەخۆدەرخستندا كێبەركێیان ئەكرد، جگە لەوەش خۆشتنی ژنانو پیاوان لەیەك شوێنێداو بەبەرچاوی خەڵكەوە هاتە كایەوە، خۆ باسو ڕازو قسەی قۆڕ پیشەی هەمووان بوو، تەنانەت ئەو وێژەیەی كە خەڵك بەلایەوە وێژە بوایە ئەو جۆرە وێژەیە بوو كە لەو ڕووەوە بێت.

بەڵێ، ڕۆمانییەكان لە هەوەسكاریی ئاژەڵییانەدا ئەوەندە ڕۆچوون هەتا تیایا چەقین، هەر ئەوەش بووە هۆی كۆمانەوەی پشتی دەوڵەتەكەیانو بێهێزو لاوازی كردو لەئەنجامدا ئەویش تیاچوو.

سكاڵا: بۆنی بەدبەختییو كلۆڵیی ئافرەت لەناو ئەوانیشدا درا بەلووتما، لەگەل ئەوەشدا باسەكەم پێ خۆش بوو، دڵپاك، من لەم جۆرە خوێندنەوەیە دوورو بێئاگام، هەر نەمبیستوونو نەشمزانیوە كە هەن، بەخوا وا دیارە كە خوێندنەوەی مێژوو بەكەڵكە، كچێ خۆ مێشكی مرۆڤ ئەكاتەوە، ئیتر منیش هەوڵئەدەم كە دەس پێ بكەم، بەخوا باشبوو كە ڕۆمانیشم ناسی.

دڵپاك: ئەی چۆن! خوێندنەوە هەر جۆرێك بێت بەكەڵكە، تۆیش بخوێنەرەوە، لە چاك، لەخراپ، ئەوەی كە چاكە چاكەی لێوەرئەگریت، ئەوەش كە خراپە هەوڵ ئەدەی خۆتی لێ بپارێزی، چونكە شارەزای بوویتو ئەی ناسیت. پاش چەند ساڵێك لەخوێندنەوە، بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانی بوویت بەزاناو شارەزایەك كە كەڵك بەخۆتو كەسانی تر بگەیەنیت.

ئاواز: ئای ئافرەتی بەسەزمان چەندێ گیرخواردوو بوویت، ئەوەش ڕۆمان.

---

[1] الحجاب/ أبوالاعلى المودودي والاسلام والمرأة المعاصرة ـ بهي الخولي.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ. هەر وەك بەدبەختە، بەدبەخت بوو، كڵۆڵ بوو.

بەباندۆڕای سەرچاوەی شەڕ حیساب و مامەڵە ئەكرا

بەكەلێن و كەلەبەری هاتوچۆی شەیتان دائەنرا

بەدۆزەخی پڕ لەبەلا، كانیی نەنگ و هۆی سەرشۆڕیی

شان كزیی پیاو، بنجی تاوان بەناوبانگ بووەو ئەژمێررا

سكالا: بەلام دڵپاك، خۆ جیهان بریتیی نەبوو لەیۆنان و ڕۆمان بەتەنیا.

دڵپاك: ڕاست ئەكەی پشت بەخوا باسی ئافرەتت لەشوێنە گرنگەكانی تردا بۆ ئەكەم پەلەكردن باش نییە.

## ئافرەت لە ئەورووپای گاوردا

دڵپاك: چەرخ و سەردەمی گاورێتیی "النصرانية" لەئەرووپادا هاتە پێشەوە، دەستی كرد بەچارەسەركردنی ئەو ئاژاوە ڕەوشتییە، بێگومان لەسەرەتاوە هەنگاوی مەزن و پیرۆزی نا، چونكە توانی بەسەر هەموو ڕواڵەتەكانی بێئابڕووییدا سەربكەوێت، ئەوەش بەهۆی داخستنی دەرگای سەرچاوەكانییەوە، توانی سەماكەران، گۆرانیبێژان، تیاترۆكان، وا لێ بكات كە تەوبە بكەن و واز لەكاری گەندو ناڕەوا بهێنن، پایەی ڕەوشت بەرزیی و ئاكاری جوانی هەڵساند، بەلام ڕێگاكانیان ئەوەندە گران و قورس و سەخت بوون، ئەتوانین بڵێین بەربەركانێی فیترەتی ئادەمیزاد بوون، بناغەی تێ ڕوانینیی پەیوەندیی نێوان پیاوو ئافرەت لە لایان ئەوەبوو، كە گوایا ئافرەت چەمەی تاوان و گوناح و خراپەكارییە، پیاوانی كەنیسە لە هێنانەخوارەوەی نرخ و پلەی ئافرەتدا زیادەڕۆیی زۆریان ئەكرد، ئەیانگوت: "ئەبێ شەرم بكەن لەخۆیان كە ئافرەتن، ئەبێ لەپەشیمان بوونەوەیەكی هەمیشەییدا بژین، چونكە ئەوان نەفرەت (لەعنەت)یان هێنایە سەر زەمین".

سكالا: ئەها هاتیتە سەر قسەكەی من، ئایین لەگەڵ ئافرەتدا دڵڕەقە.

دڵپاك: ئاخر پەلە مەكە، با لەباسەكە ببمەوە ئەوسا حوكمی بدە بەسەردا. باوەڕیان وەهابوو كە ئافرەت دەرگای دۆزەخە، تەنانەت چوونەتە سەر ئەو ڕایە كە شەیتان لەشی بۆ ئافرەت دروست كردووە ! لەبەر ئەوە ئەبێ پیاوان نەفرینیان لێ بكەن مادام ئەوان هۆی خەڵەتاندن بوون، لەوەش زیاتر ئەیانگوت شەیتان خووی وایە لەشێوەی مێیینەدا خۆی دەردەخات[1].

ئاواز: خۆ ئەڵێن ئایینی (عیسا) ئایینی خۆشەویستیی و بەزەیی پیاهاتنەوەیە ئەی ئەو تێڕوانینە سەیرە كەی خۆشەویستیی و بەزەیی تێدایە؟

دڵپاك: بێگومان ئایینەكە خۆی پاك بووەو بۆ خێرو چاكەی مرۆڤ نێردراوە، بەلام پاش (عیسا) (سەلات و سەمی خوای لەسەر بێت) پیاوانی كەنیسە ئێجگار زیادەڕەوییان تێداكرد، ئەوەیان فەرامۆش كردووە كە (عیسا) پێغەمبەر لە (مەریەم)ی ئافرەت لەدایك بووە!!

گوێبگرن، ئەیانگوت: ئەبێ ئافرەت لەجوانیی و شۆخ و شەنگیی خۆی تەریق ببێتەوە، چونكە ئەو جوانیی و شۆخ و شەنگییە پیاو بەرەو تاوان و گوناح ئەبزوێنێ، ئەوانە لە ئافرەتا چەكێكن لەو چەكە بێوێنانەی كە بەدەست شەیتانەوەن بۆ فریوادانی مرۆڤ! لەبەر ئەوە ئەبێ ئافرەت هەمیشە بپارێتەوەو كەفارەتی ئەوە بدات و لەو كەفارەتدانە هەرگیز نەكەوێت، گوێبگرە، بۆ یەكێك لەپێشەواكانی سەرەتای گاورێتیی كە "ترتولیان"ە سەبارەت بە ئافرەت چی دەڵێن: "ئافرەت ڕێگەی هاتنە ژوورەوەی شەیتانە بۆ ناو دەروونی مرۆڤ، هەروەك ئافرەت خۆی مرۆڤ نەبێت و تەنیا پیاو مرۆڤ بێت!! هەر ئەو پاڵ پێوەنەری پیاو بوو بۆ نزیك كەوتنەوە لەدارە یاساغەكە، یاسای خوای شكاندو پیاوی (كەوێنەی خوا بوو) ناشیرین كرد".

---

[1] تأريخ العالم/ تەرجومەی وەزارەتی مەعارفی مصر.

ڕای دووەمیان بەکورتیی ئەمەیە: "سێکس لەنێوان پیاوو ئافرەتدا هەر خۆی لەخۆیا گلاوە، ئەبی لێی دوور بکەوینەوە تەنانەت لەڕێگەی ژنهێنانی ڕەسمیشەوە".

بێگومان ئەوە ڕەهبانیەت و گۆشەگیری بوو کە ڕیشەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی "اشراقیة"، لەو ڕێگەیەوە عازەبیی دەستی پێکردو بە بەرزترین پلەی ڕەوشت بەرزییان دەدایە قەڵەم، بەپێچەوانەشەوە نزمترین ژیان خێزانداریی بوو، بەو پێیە هەرکەسێك بیویستایە ڕەوشت بەرز بێ، ئەبوایە ژنی نەهێنایەو بەو نیازەوە نزیکی ئافرەت نەکەوتایە.

تەنانەت لە چەند کۆنگرەیەکی بەرزدا بڕیاری ئەوە درا کە پیاوانی کەنیسە لەگەڵ ژنەکانیاندا لە چۆڵیدا "في الخلوة" نابێت بەیەك بگەن و کۆببنەوە، بەڵکو ئەبێ بە بەرچاوی خەڵکەوە کۆببنەوە یان بەیەکبگەن، ئەوەش کرا بە یاسایەکی ڕەسمیی پەیڕەوی کراو.

سکالا: بەڕاستیی شتی سەیرو ناهەموار بەبیریاندا هاتووە! وەی.. وەی!!

ئاواز: ئافرەتی بەسەزمان بەتەواویی گیریخواردووە لەژێر ئەو جۆرە یاسایانەدا.

دڵپاك: لەوەش زیاترو بۆ نموونە، ئەگەر ژن و مێردێك ڕێك بکەوتایە شەوێك لە جەژنێکدا بەجووت بمانایەتەوە، ئەوە ڕێگەیان نەئەدرا لەگەڵ خەڵکا جەژن بکەون و لەشادیی و خۆشیی ئاهەنگی جەژنا بەشداریی بکەن، هەر وەك بڵێیت تاوانێکی گەورەو گوناهێکی خراپیان کردبێت!

سکالا: لەسەرێکیشەوە، دەستیان خۆش بێت، بەس نییە ئافرەتیان لەپیسیی پیاو قوتار کردووە، هەرچۆن بووبێت باری سەرشانی ئافرەت سووکتر بووە لە جاران و تاڕادەیەك ئابڕووی پارێزراوە.

دڵپاك: خۆزگە وەها بوایەو تا سەریش سەری بگرتایە، بەڵام بەهۆی ئەو ڕەهبانیەتەوە خۆشیی و ئاسوودەیی نێوان کەسانی خێزان بوو بەهەڵم و ڕەوییەوە، تەنانەت هەر دۆستایەتیی و خزمایەتییەکیش کە لەئەنجامی ژنهێنان و شووکردنەوە پەیدا بوو بوو بەپیس و گلاو ئەژمێردرا.

لەئەنجاما جێگەی ئافرەت لێژ بوو، نرخی شکا، ژیانی ژن و مێرد شلۆق بوو، ئافرەت ملکەچی پیاو بوو، لەمافی میرات و خاوەنداریێتیی بێبەش کرا، تەلاقدانیش بەپێی ئایین و یاسا هەڵگیراو نەما، خۆ ئەگەر ژن و مێرد ئاویان لە کاسەی سەری یەکتردا بخواردایەتەوە، سەراپای ژیانیان شەڕو ئاشووبەو ئاژاوەو هەرابووایە، جیابوونەوەیان بۆ نەبوو، بەڵکو تەنها یەك چارەیان هەبوو ئەویش بەڕاهب بوون بوو کە تف لە پەیوەندیی ژن و مێردایەتی "العلاقة الزوجية" بکەن. یاخۆ هەر یەکەیان بەدزی دەستی بدایەتە خواردنەوەی پێکی داوێن پیسیی کە ئەوەش وەك ئەزانین حەرام و ناڕەوایە بەلای هەموو ئایینەکانەوە لەوانەش ئایینی مەسیح، سەلامی خوای لەسەر بێت.

خۆ شووکردن و ژنهێنان وەك ئاماژەمان بۆ کرد، لەلایەن ژن یان مێردەوە پاش هەرکامیان بۆ ئەوی تر ئەوە ستەمێکی گەورەی پڕ لە نەنگ و شوورەیی وەها بوو کە هاوسەنگی نەبێت، بەجۆرێك بەژنهێنان یان شووکردنی دووەمیان ئەگوت "زینای بەدڕەوشت!"، بەڵام پیاوانی کەنیسە، یاسای کەنیسە، ژنهێنانیانی قەدەغەو یاساغ کردبوو.

خوشکان، ئەمەی کە باسم کرد هەمووی لەو چەرخ و سەدانەدا بوو کە هێشتا ئایینی ئیسلام دەرنەکەوتبوو، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەدایك نەبوو بوو. جا ئەمە لەکوێ و ئەو قسانە لەکوێ کە ئەڵێن سەرەتای بەدبەختیی و کۆت و زنجیرکردنی ئافرەت لەمێژوودا لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە دەست پێ دەکات؟!

ئاواز: جیهان گەورەیە، فراوانە، مەرج نییە لەسەرانسەری جیهاندا ئافرەت هەر وا چەوساوە بووبێت، ئەی ئەوە بۆ باسی ئیسلامەکەی خۆت ناکەی؟ وا دیارە ئەترسیت، ناوێریت بێیتە سەر باسی ئەو!

دڵپاك: نەخێر مامۆستا ئاواز، ئەوەی تۆ بۆی چوویت وانییە، ئەمەوێ هەنگاو بە هەنگاو نزیکتان بکەمەوە، ڕاستە جیهان گەورەو فراوانە، سەر لەژیانی ئافرەتی گرنگترین بەشەکانی تری سەرزەوی لەپێش ئیسلامدا ئەدەین، بەڵام بەداخەوە کە ئیسلام ئەکەی بەموڵکی من و خۆت بەموسڵمان ناژمێریت! ئیسلام ئایینی هەموو کەسێکەو بۆ هەموو کەسێك هەیە بیکات بە بەرنامەی ژیانی خۆی.

# ئافرەت لەئێراندا

**دڵپاك: ئێران، ئەو ئیمپراتۆرییەتە مەزنەی کە ململانێی ئەکرد لەگەڵ ڕۆمدا بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا، کێڵگەیەکی کۆنی بەپیتی چالاکیی بوو بۆ ئەو بزووتنەوە وێران کاریانە کە ڕەوشتی پیسی تێدا بڕوێت، بۆ ئەو کارە گەندانەی کە شیاو نەبوون، لەو ڕووەوە لەلایەن گێتییەوە ناسراون، بناغەی خووڕەوشت لەو خاکەدا لەدێرین ڕۆژگارەوە درزی بردبوو، تەپی بوو، تەنانەت پادشاکانیان کچ و خوشکی خۆیان ئەهێناو ئەیانکرد بەژنی خۆیان.**

**بەڵێ، لەداخ و ئەنجامی پیسیی و بەدکاریی و بێئابڕووییدا بوو کە "مانی" کەوتە بانگکردن بۆ وازهێنان لەژنهێنان و دوورکەوتنەوە لەئافرەت، بەو هیوایەی منداڵبوون ڕوو نەدات و ئیتر ڕەچەڵەو تۆوی ئادەمیزاد بپڕێتەوەو سەرزەوی لەپیسیی ئادەمیزاد ڕزگاری بێت.**

**ئاواز: کابرایەکی سەیر بووە! بیروڕاکەشی دوور لەژیریی بووە.**

**دڵپاك: گرنگ نییە، سەیر بووبێت یان نا، ئێمە هەقمان نییە بەسەریەوە، بەڵێ مانی کوژرا، بەدبەختیی و ڕۆژڕەشی ئافرەت زیاتر دەستیپێکرد، بە تایبەتیی بەدەستپێکردنی بزووتنەوەی "مەزدەك" و بڵاوبوونەوەی و چوونی قوباد شا بۆ سەر مەزهەبەکەیی و پشتگیریکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە، هەتا مەزهەبەکەی سەرانسەری خاکی فارسی گرتەوە.**

**سکاڵا: مەزدەك، داوای چی ئەکرد؟**

**دڵپاك: مەزدەك، داوای هاوبەشی گشتیی ئەکرد لەسامان و ئافرەتدا، وای بەڕەوا ئەزانی کە ئەو دوو شتە موڵکی کۆمەڵ بن و هی گشتیی بن.**

**ئاواز: بیروڕاکەی خراپ نەبووە، ئیتر بۆچی ئافرەت بە بزووتنەوەکەی تووشی بەدبەختیی بووە؟ ئەوەتا ئەمڕۆش گەلێ وڵات لەسەر ئەو یاسایە ئەڕۆن.**

**دڵپاك: خوشکەکەم، ڕەنگە نەزانی کە گەنجەکان خێرا خۆیان خستە باوەشی مەزهەبەکەیەوە! ئیتر بەوەش لافاوی بەدخوویی و شەرواڵ پیسی هەموو لایەکی ڕاپێچ کرد، بەشێوەیەکی وەها خەڵك خۆی ئەکرد بە ماڵانداو ئافرەتیان بەبەرچاوی پیاوەکەیەوە، لەناو ماڵ و منداڵەکانیدا ئەفڕاندو ئەیانبرد، سامانی خەڵکیان تاڵان ئەکرد، بەبێ ئەوەی خاوەنەکانیان مافی فزرەکردنیان هەبێت، هەتا وای لێهات دایك و منداڵ یەکتریان نەئەناسییەوە، یان منداڵ باوکی خۆی نەئەناسییەوە، باسەکە درێژەو من بە کورتی بۆم باسکردن، تەماشای "فجر الأسلام"ی ئەحمەد ئەمین و "ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين"ی نەدەوی و ژیانی پێغەمبەری مەزنمان موحەممەد ﷺ بکەن، بەدرێژی باسەکەی تێدا ڕۆشنکراوەتەوەو چاکتر لێی تێئەگەن، منیش لێتان ئەپرسم: لەو مەزهەبەی مەزدەکدا کامیان دۆڕاوترە ئافرەت یان پیاو؟ کێ قۆچ و قوربانی ئاشووبەکە بووە؟**

**سکاڵا: بێگومان هەردووکیان دۆڕاو بوون، بەڵام ئافرەت دە ئەوەندەی پیاو دۆڕاو تر بووە، چونکە حەزو نیازو خواستی ئافرەت هیچ جۆرێك حیسابی بۆ نەکراوە، ئەوەتا ڕازیی بووبێت یان نەبووبێت فڕێنراوەو خۆیداوە بەدەست هەوەسی پیاوەوە.**

**دڵپاك: گوتنەکەت زۆر ڕاستە، ژیانی ئافرەتی بەسەرزمان لەناو وڵات و میللەتێکی بەدخووی هەوەس پەرستی هەرگیز تێرنەبووی وەهادا بێننە بەرچاوتان ئاخۆ ژیانی ئەبێ چ ژیانێك بووبێت؟ چ خۆشیی و سەربەستییەك لەژیانی وەهادا هەیە، تەنانەت داوێنیشی هی خۆی نەبێت و لەمافی پاراستنی بێبەش بکرێت، توخوا ئەوە ژیانە؟ ئەوە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە؟**

**بەڵێ، منیش ئەوە ئەزانم کە هەندێ وڵات لە سایەی هەندێ بیروڕای بەناو تازەدا ئەیانەوێ جیهان بگەڕێتەوە نەك هەر بەرەو ڕۆژگارو چەرخی مەزدەك، بەڵکو بەرەو ژیانی کۆمەڵگەی سەرەتایی "المجتمع البيدائي" و ژیانی ئافرەت لەڕووی پەیوەندییەوە لەگەڵ پیاودا لەسەر ئەو شێوازە دابمەزرێنن، لەکاتێکا ئەو وڵاتانە پڕوپاگەندەی پێشکەوتن و پێشکەوتنخوازیی ئەکەن و هەرکەس باوەڕی بەئابڕوو هەبێت بەکۆنەپەرستی دادەنێن!**

ئاواز: وادیارە ئێمەی ئافرەت هەر لەسەرتاوە بە نەگبەتیی هێناومانە!

دڵپاك: ئای خوشكەكانم، ئافرەتی بەسەزمان لەژێر یاسادا، ئەو یاسایەی كە هەوەس و ئارەزووی ئادەمیزاد دایڕێژێ هەر وەها ئەبێت، گوڵێكە بۆ بۆنكردن یاخود دارێكەو بۆ بەرەكەی بەخێو ئەكرێت، نەك لەبەر ئەوەی كە ئەویش وەك پیاو ئادەمیزادێكی خاوەن مافەو مافی ژیانی هەیە! خۆزگە ئافرەتان بە چاكیی و وردیی خۆیانیان ئەناسی، خۆزگە بەچاوی ژیریی بیریان ئەكردەوەو هەڵسوكەوتیان ئەكرد، نەك بەچاوی دڵ و سۆز و ئارەزوو.

سكالا: دڵپاك، با ئێستا بخەوین، بەڵام توخوا بەیانی دوای گەڕانەوەمان لەقوتابخانە باسەكەمان بۆ تەواوكە، هەرچەندە پڕ لە بەدبەختیی ئافرەتە بەڵام حەزی لێ ئەكەین!

دڵپاك: بەرسەرچاو، خوایاربێت درێغیی ناكەم.

## ئافرەت لە هینددا

سكالا: دڵپاك گیان، سبەینێ پێنج شەممەیەو ئەڕۆینەوە، باسەكەم بۆ بكە.

دڵپاك: دەی بۆچ وا ئەزانی لەبیرم چۆتەوە؟ ئێستاش ئەتان بەم بۆ هیندی كۆن، ئایینی هند لە گیانی خۆیداو لە كۆندا پڕبوو لەجەورو ستەمكردن لە ئافرەتی بەسەزمان، لە ئەفسانەكانی مانۆدا كە زۆر زاڵ بوو بوون بەسەر هینددا ئەبینرێت كە "مانۆ" ئافرەتی خەلق كردووە، خۆشەویستی نوێن، (حب السرير) نشینگە، ڕازاندوەتەوە، هەوەس پیسیی، توڕەیی، ڕووتبوونەوە لەشەرەف، بەدكاریی، ئەمانەی هەموو لەسەر پێویستكردوون، ئافرەت لەخۆیدا پیسە هەروەك ناهەقی كە لەخۆیدا پیسە ئەمەش دەستوورێكی چەسپاوە[1].

دیسان لەیاساكەی مانۆدا هاتووە: "ئافرەتی بەوەفا ئەبێ خزمەتی ئاغای ـ مێردەكەی ـ بكات، بەجۆرێك كە ئاغاكەی وەك خوا بزانێت، تەنانەت ئەگەر ئاغاكەی هیچ كارچاكیەكیشی تێدا نەبێت، پێویستە ژن كارێكی وا نەكات كە دڵی ئاغاكەی گەرد بیگرێت، لەبەر ئەوەو بەپێی ئەوە ئەبێ ئافرەت زۆر بە گەردن گەچییەوە مێردەكەی بدوێنێ و پێی بڵێت سەروەرم.. جاروباریش بڵێت: ئەی خواكەم.. لەڕۆشتنندا چەند هەنگاوێك بەدوایەوە بڕوات، پیاویش زۆر بەكەمی وشەیەكی ئاراستە بكات، نابێ لەگەڵیا شت بخوات، بەڵكو ئەبێ ئەوە بخوات كە لەمێردەكەی ئەمێنێتەوە"[2].

هەروەها: "پێویستە لەسەری ئەو ڕۆژەی مێردەكەی ئەمرێت ئەویش بمرێت، بەڵكو لاشەی ئەم و ئەو لەیەك ئاگردا بنێ بەخۆڵەمێش ئەم باوە كۆنە (بورهمی)ە هەر لە كۆنەوە هەتا سەدەی حەڤدەهەمی زایین مایەوەو پەیڕەو ئەكرا"[3]

سكالا: وای.. وای! چەندە دڵڕەق و بێبەزەیی بوون! چ میللەتێك بوون؟!

ئاواز: ئەی بۆچ ناڵێیت چەند كێوی و دڕەندەو نابەچە بوون؟! چەند دواكەوتوو و دوور لە سۆز و ژیریی بوون!

دڵپاك: مەسەلەكە تەنیا هی دواكەتن نییە، نا، گوێبگرن لە ئەفسانەیەكی تری هیندیی ئەڵێت: "خوا مەخلوقێكی بەهێزی خەلق كردو ناوی نا پیاو، لێی پرسی: ئایا تۆ ڕازیت؟ پیاو بە نا وەڵامی دایەوە، دووەم جار خوا لێی پرسی: چیت ئەوێ؟ پیاو وەڵامی دایەوە: ئاوێنەیەكم ئەوێ كە تیایدا بڵندیی خۆم ببینمەوە، سندوقێكم ئەوێ خشل و گەورەیی خۆمی تێ بخەم، سەرینێكم ئەوی لە كاتی ماندوویەتییدا پاڵی پێوە بدەم، قەڵغانێك خۆم لەپەنایدا بشارمەوە لە كاتێكدا پەژارە زۆرم بۆ ئەهێنێ، یارییەكم ئەوێ پێی شادمان ببم، پەیكەرێكم ئەوێ چاوم بەجوانییەكەی تێر بخوات و منارەیەك ڕێگەی پێ شارەزا ببم، لەبەر ئەوەش خوا ئافرەتی خەلق كرد"[4].

ئاواز: ئەوە جگە لە خورافاتی پڕوپوچ بەولاوە هیچی تر نییە.

---

[1] ـ تأريخ العالم: وزارة المعارف المصرية.

[2] ـ حضارة الهند: ول ديورانت.

[3] ـ المرأة في القران: عباس محمود عقاد .

[4] ـ المرأة في القرن العشرين: جروان السابق/ ص١٨.

دڵپاك: قابیله من بڵێم ئەوە حەقائیقی ڕاستو پاك بووەو نابێت قسەی لەدژ بكرێ؟ بەڵام دیارە ئەوە لەكاتێكدا بووە كە ئیسلام هێشتا دەرنەكەوتووە، ئەمەوێ ئەوە بزانن، ئەمەوێ تێبگەن كە لەوانەیە ئێوە شارەزای ژیانی ئافرەت نەبن لەكۆن و تازەدا. جا فەرموون با بچینەوە سەر باسەكەوە.

خۆ ئەگەر ئافرەتی بەسەزمان خۆی نەسووتاندایە ئەوە ڕیسواو بەپەند ئەبوو، ئیتر بۆی نەبوو شوو بكاتەوە، ئەبوو بە بەندەو كەنیزەكی خەسوو خەزوورەكەی بەدرێژایی ژیانی، ئەمە لە سەرێكەوە لەسەرێكی ترەوە، لە پیسیو گەنیوییدا سەبارەت بە ئافرەتو لە بەدڕەوشتیان لەگەڵیا تا بینەقاقەیان چەقیبوون، لە هەردوو سەرەوە ئەنجامی تاوانە نابەجێو ناڕەواكانیان بارێكی قورسێ پڕ لەجەور بوو بەسەر شانی ئافرەتەوە.

هیندییەكان ئارەزووبەزێنو هەوەس باز بوون لەخواردنو بەكارهێنانی ئەو خۆراكو شتانەدا كە بڵێسەی ئارەزووی ئاژەڵییانەیان پێ بەرز ئەبۆوەوە، لەو كارەدا بەناوبانگ بوون، هەروەها "مهادیو" كە لە ناشیرینترین شێوەدا كە ئەوپەڕی شوورەیی تێدا دیاربوو پەیكەریان بۆ دروست كردبوو ئەیانپەرست، خوشكان، ئەوانە ئەندامی منداڵ بوون "آلة التناسل"یشیان ئەپەرست[1].

پیاوان، ژنی ڕووتو ژنانیش پیاوی ڕووتیان ئەپەرست، كاهنو زیرگەوانانی پەرستگاكان، ئافرەتە ڕاهبەكانو ئەوانەش كە سەریان لە پەرستگاكان ئەدا لە شەرەف و ئابڕوو ئاوەڕووتیان ئەكردن بەجۆرێك ئەو شوێنانە بوونە ڕاوگەی داوێن پیسیو بەدكارییو نێچیر ڕاوكردنی داوێنپیسان، جا سەرنج بدەنو كەمێ بیر بكەنەوە، ئا ئەوە بارودۆخی ژیانی ئافرەت بووە لەشوێنە "پیرۆزەكانیاندا" جا ئەبێ لە كۆشكی پاشاو دیواخانو ماڵی بەگو دەوڵەمەندو دەستڕۆیشتووەكاندا چۆن بوو بێت؟ ئەبێ كەسایەتیو ئابڕووی لەچ پلەیەكدا بووبێت؟!

سكاڵا: بەڕاستی دڵپاك هەر ئەڵێیت خەو ئەبینم! یان لەجیهانێكی تردا ئەسوڕێمەوە، ترسو پەژارەش لەشو گیانمیا ن داپۆشیوە، گریانم دێت.. بۆ ئەو ئافرەتە بەسەزمانانەی كە لەو كۆمەڵگانەدا ژیاونو مردوون، ئاگاو ئاوەزم بە جۆرێكی جیاواز لەمەوبەر دێنە ئاواز.

دڵپاك: ناهەقت نییە خوشكە گیان، جا هەر لەناو ئەو كۆمەڵگەیەدا جاری وا هەبوو یەك ئافرەت چەند مێردێكی هەبوو، لەهەموو شتێ سەیرتر بەلامەوە ئەوەیە كە پیاوان قوماریان لەسەر ژنان ئەكرد، پیاو ژنی خۆی ئەدۆڕاندو كابرای براوە بەبەرچاوی مێردەكەیەوە ئەیدایە بەرو ئەیبرد.

ئاواز: وادیارە ئەوانە هەستو نەستو فامو ژیرییان نەبووە، ئەمەیە ئەو شارستانیەتەی كە لە هیندا هەبووەو ئێستا بەشانازییەوە مێژوو ناوی ئەبات؟ توخوا حەیف نییە بە شارستانیەت ناو ببرێت؟

دڵپاك: خوشكەكەم، بەڵێ ئەوە یەكێك بووە لە شارستانیەتەكانی سەر ڕووی زەویی، بەڵام شارستانیەتی بێباوەڕ، شارستانیەتێك كە لەسەر بنەڕەتی لەخواترسان دانەمەزرێت هەروا دەرئەچێت لەكۆنو تازەدا، بەڵام من حەز ئەكەم كە ئێوە حوكم بەسەر ئەنجامی باسەكدا بدەن نەك من، ئایا ئافرەت لەناو ئەو شارستانیەتەدا سەربەستو بەختەورە بووە؟

سكاڵا: ئەی قوڕم بەسەر، توخوا ئەوە پرسیاری ئەوێ؟ دیارە زۆر زۆر بەدبەخت بووە، نەبوونی لەبوونی، مردنی لەژیانی گەلێك چاكتر بووە.

دڵپاك: بەڵێ، ڕاستەو ڕاستت گوت، ئاه!! خۆزگەم بەوكاتەی كە تێئەگەن.

كۆڕی مەیو پێڕی قومار، لەمەیخانە كەرێك ئەخرا
براوە "ئێوە"ی لەجیاتی هەموو شتێ پێشكەش ئەكرا
دەوری ساقیش، سووڕو سەما، ستران بێژی، هەوەسبازیی
مەزەكردن، خاڵیگەیی، بێتاقەتی، پێ ئەسپێررا.
نەیان ئەهێشت بێخەم بژیت، بەئازادیو بێئاهی كاڵ

[1] ـ الحجاب: للمودودي.

بەساوایی بەبێ تاوان، بەزیندوویی ئەخرانە چاڵ

بە گەورەییش لەگەڵ پیاودا کە ئەو ئەمرد ئەیان نێژان

ئەسوتێنران، ئەبوونە گەرد، دەستو پەنجە، ئەگریجەو خاڵ!!

## ئافرەت لە چیندا

دڵپاك: یەکێك لەو شارستانیەتانەی کە لەپێش ئیسلامدا بووە شارستانییەتی چین بووە، لەسەر ئەو خاکەشدا باری سەرشانی ئافرەت هەر قورسو چارەی هەر ڕەشبووە، ئاینی "لاوتسۆ" ژیانی دوور لەدنیاییو زبرو سەختی لاپەسەند بووە، ژنهێنانی بەباشو کارێکی چاك دانەئەناو گوێی پێ نەئەدا. دیارە ئەوانیش ئافرەتیان بەبەڵاو گڵاو زانیوە لەبەر ئەوە لەناو کۆمەڵدا شوێنێکی نزمی هەبووە.

یەکێك لە ئافرەتەکانی چین "الطبقة"ی بەرز، نامەیەکی کۆنی بەجێ هێشتووە کە لە نووسینەکەیدا باسی پلەی ئافرەتی چینی تێدا کردووە، لەنامەکەدا هاتووە: "ئێمەی ئافرەت دوا پلەی نزمیمان دراوەتێ لەپلەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتییدا، لەبەر ئەوەش ئەبێ بێنرخترین کار بەشمان بێت".

لەگۆرانیەکانیان: "ئای بەختی ئافرەت چەند ڕەشە! لەهەموو دنیادا هیچ شتێك نییە بەقەد ئافرەت بێنرخ بێت، کوڕان سەربەستو ئازادو بەختیار هەر وەك خوابنو لەئاسمانەوە باری بن.. کەچی کچ هیچ کەسێك بەلەدایکبوونی شادمان نییە، کە گەورەش بوو ئەبێ بخرێتە ژوورێکەوەو بشاردرێتەوە لەترسی ئەوەی نەك چاوی بەڕوومەتی مرۆڤێك بکەوێ، کە لەماڵیشەوە نەمێنێو بزر ببی کەس بۆی ناگەڕێ" [1].

لەسەرێکی ترەوە زوڵفی ئافرەتیان ئەبڕیو ئەیانبەست بەو تۆو وشتەوە کە ئەیان ویست بیچێنن، هەروەها چینییەکان (پیاوان) لەیاسای باوکێتیدا لەئارییەکان لەو ڕووەوە توندوتیژتر بوون، ئەوەی فارسەکان بەزۆرو بە توندوتیژی ئەیان سەپاند بەسەر ئافرەتدا، چینییەکان بەژیریو سۆز سەپاندیان بەسەریاندا، گەورە پیاوی چین بەلایەنی کەمەوە ئەبوایە نۆ ژنی ببوایە، ئافرەت دوور خرابۆوە لە دەست خستنە ناو ئیشوکاری ژیانەوە، تەنها لەخۆراك، هیمنکاری هێلانەی خێزان یان مێرد، منداڵبووندا جێی دەستی هەبوو.

ئەگەر چاودێریی ئافرەت بە توندیی نەکرێت بەڵا ئەهێنێت بەسەر خێزانی مێردو باوکدا، ئافرەت ئاژەڵە، پیسکەیە، پیسە، ئەمانەو چەندەهای تر لەم جۆرە قسەی چینییەکان بوون، هەروەها ئەیانگوت پیاو خۆرەو ئافرەت مانگ، ئەم تیشکەکەی لەوەوە وەرئەگرێت [2].

ئاواز: کەواتە پەندو حیکمەتی شارستانیەتی چین ناوەکانیان پێچەوانەن.

سکاڵا: بەڵام خۆ ئافرەتیان بەجارێکدا تێك شکاندووە، ئاخ.. ئاخ!!

---

[1] ـ حضارة الصين ـ ول ديورانت.

[2] ـ المرأة في القرن العشرين ـ جروان السابق.

# بەشی سێیەم

سكالاَ: شەوان كە سەر ئەنێمە سەر سەرین، بیرو هۆشم هەر بەسەر ئافرەتەوەیە، ئافرەتی بەدبەخت، ئافرەتی چەوساوەی كلۆڵی ماف خوراو! لەدێرییندا دەست بەسەرو چەوساوە، ئێستاش بێبەش لە ئازادیو سەربەستی، تا یەكسانی لەگەل پیاودا! ئەمە ئەبێ تاكو كەی هەروەها بێت؟

ئاواز: با ڕابردوو بەخێرو شەڕیەوە لەبیر خۆمان ببەینەوە، ڕابردوو بڕایەوە، ئیتر چ پێویست بە باسكردنی ئەكات؟ با بیرێك لەداهاتوو بكەینەوە.

دڵپاك: لەوەدا لەگەڵتام كە بیر نك بیرێك لەداهاتوو بكەینەوە بەڵكو بەوە بەرەو بەختیاریی ئافرەت هەنگاو بنێین، بەشكو بتوانین كارێ بكەین لە چەوساندنەوە، ئیستغلال، ماف خوراویی، بەدبەختیو كلۆڵی ڕزگار بین، ئەی ئێمەی ئافرەت ئادەمیزاد نین؟

بەلاَم لەوەدا هەرگیز لەگەڵتا نیم كە بڵێم: "با ڕابردوو لەبیر خۆمان بەخێری یان بەشەڕیەوە ببەینەوە"، ئەوە ڕایەكی ڕاست نییە.

ئاواز: بۆ ڕایەكی ڕاست نییە؟ تۆ بڵێیت ڕابردوو بگەڕێتەوە بۆمان؟

دڵپاك: نەخێر، من ئەوە ناڵێم كە تۆ بۆی ئەچیت، ئەوەی من ئەیڵێم زۆر جیاوازە لەوەی كە تۆ بیری لێ ئەكەیتەوە.

حەز ئەكەم ئەوە بزانن كە شارستانیەتی ئەمڕۆ گێتیی بەرهەمی ئەمڕۆ نییە، بەڵكو بریتییە لە بەرهەمی هەوڵو كۆششی بەردەوامی هەزارەها ساڵی ئادەمیزاد كە لەمەوبەر، واتە لەڕابردوودا، داوێتیو ئەوەتا منو تۆو خەڵكی تر ئەمڕۆ سوود لەو ڕابردووە ئەبینینو پێی ئەحەسەێینەوەو بووینەتە خاوەنی شارستانیەت، دەی ئیتر كەی ڕەوایە ڕابردوو لەبیری خۆمان بەرینەوە؟ ئەی بۆ لەسەر ڕۆشنایی تیشكی ڕابردوو هەنگاو بەرەو بەختیاریی ئافرەت نەنێین؟

سكالاَ: بەلاَم چۆن؟ دەی فەرموو پێمان بڵێ.

دڵپاك: با هیچ نەبێت شتێك لە ژیانی ئافرەت لەڕابردوودا بزانین، ئەوسا دێینە سەر باسی ژیانی ئەمڕۆی ئافرەت، ئەوسا پێكەوە هەنگاو بنێینو بەرەو خۆشییو بەختیاریی ئافرەت بڕۆین.

سكالاَ: بۆ باسی ئافرەت لەڕابردوودا هێشتا ماویەتی؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، نەتانهێشت باسەكەتان بۆ تەواو بكەم.

سكالاَ: بەخوا من زۆر حەزم لەو باسەیە، با شێو بكەینو دەست پێ بكەینەوە.

## ئافرەت لەمیسری كۆندا

دڵپاك: لەوانەیە بتوانین بڵێین شارستانیەتی میسری كۆن، یەكەم شارستانیەتێك بووە كە بەگوێرەی ئەو كاتەو لەچاو شارستانیەتەكانی تردا، توانیبێتی لایەك بەلای ئافرەتو مافەكانیەوە بكاتەوە، چونكە پلەو پایەیەكی بڕیاردراوی لەلایەن یاساوە بۆ تەرخان كراوەو دەوڵەتو نەتەوەش پەسەندیان كردووە.

بەپێی ئەو یاسایە جۆرە مافێكی بۆ دیاریكرا كە لە نیمچە مافی پیاوان ئەچوو، بۆی هەبوو میرات ببات، گەر مێردەكەی لەماڵەوە نەبێ سەرۆكایەتی مالو خێزانی ئەو بێت، هەرچەندە ئەو یاسایەش دامەزراو یان چەسپاو نەبوو، بەلاَم بەگوێرەی ئەو كاتە بۆ ئافرەت گەلێ باشبوو وەك گوتمان.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە ئافرەت ئاهی ساردی لەدڵدا بڕابێتو تیر ئۆخەی كردبێت، ئەها "تبحوتب الحكیم" ئامۆژگاریی خەڵك ئەكات: "مەهێڵە ئافرەت سەرپەرشییكردنی خێزان بكات، واتە مەیدەنە دەستی، گوێڕایەڵیكردنی بۆت لە دەست نەدەی، چونكە ئەگەر زاڵبووی بەسەریا وەك ئاوی بێخووڕی لێ دێت بۆت"[١].

---

[١] ـ المرأة في القرن العشرين ـ جروان السابق.

ئاواز: مەبەستت چیبوو لەوەدا کە گوتت مافەکانی یاخود یاساکانی ئەو مافانە چەسپاو یان دامەزراو نەبوون؟

دڵپاك: چونکە ئەو مافانە بەسترابوون بەباری ڕامیاییەوە، بەپێی بەرزو نزمی‌و شڵەژانی دەوڵەت‌و جۆری حوکمڕانان ئەو مافانەش ئەگۆڕان، ئەوەبوو کە میسر کەوتە ژێر چنگی دەوڵەتی ڕۆمانیەوە، ئەو یاساو مافانە توانەوەو نەمان، بەڵکو ئافرەت ئیتر پێویست بوو لەسەری کە ملکەچ بێ بۆ ئەو یاساو بەسەرهاتانەی کە ڕۆمان دایئەنان[1].

سکاڵا: لەسەرتاوە دڵخۆش بووم، بەڵام دڵخۆشیەکەی منیش توایەوە!

ئاواز: سەیرە! پیاوان بۆ بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەگەر ئافرەت نەبێت ئەی ئەوان لەکێ ئەبن؟! ئەی نەیانزانیوەو نازانن کە لەئافرەت بوون‌و ئەبن؟

دڵپاك: ڕاست ئەکەی خوشکی بەڕێزم.. ئەوەی گوتت زۆر ڕاستەو نیشانەی سەرسوڕمانی زۆری ئەوێ، بەڵام ئەی تاکەی ئافرەت بێدار نەبێتەوەو خۆی نەناسێ؟ هەڵخەڵەتاویی تاکەی درێژە بکێشێ؟

## ئافرەت لەبابل دا

دڵپاك: یاساکەی "حامورابی" کە بابل بەوەوە بەناوبانگە ئافرەتی وەك ئاژەڵێکی خاوەندار ئەژمارد، چڵەپۆپەی شوێن و جێگای مرۆڤ لە بابلدا لەوەدا خۆی ئەنوێنێ کە: ئەگەر کەسێك کچی کەسێکی تری بکوشتایە، بەپێی ئەو یاسایە ئەبێ کابرای بکوژ "القاتل" کچەکەی خۆی ببردایە بۆ کچی کوژراوەکە، ئینجا هەر بەپێی ئەو یاسایەی حامورابی ئەمیش کچەکەی ئەوی ئەکوشت.

سکاڵا: ئەی هاوار: دەی بۆچ گوێرەکە تاوانی گای پێ ببژێرێتەوە؟!

دڵپاك: بەڵام تەنها گوێرەکەی مێ ئەی بژاردەوە، نێر نا، تاوانی من‌و تۆ نەبووە، گوێی مەدەرێ، یاسایەك بووەو بەبێ پرسی من‌و تۆ دانراوە.

خۆ ئەگەر خاوەنی کچە کوژراوەکە دڵ نەرم و خاوەن سۆز بوایەو کچی بکوژەکەی نەکوشتایە. واتە لێبوردنی ببوایە. ئەوا ئەو کچە ئەبووە هی ئەوو ئیتر لەماڵی ئەو دەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی حوکم بەچاکی یاسای وڵات بچەسپێنێ کوشتنی ڕاست‌و بەکەڵك تر بوو!

ئەبێ ئەوەش بزانین کە لەوڵاتی بابلدا هیچ بیروباوەڕێکی وەهاو پرشنگداری نەبوو کە داوای مافی ڕاستەقینەی ئافرەت بکات، بەو ناوەوە کە ئافرەت ئادەمیزادەو وەك پیاو مافی ڕەوای سروشتی خۆی هەیەو ئەبێ لێی زەوت نەکرێت[2].

ئاواز: هیچ ڕۆشناییەك سەبارەت بە ئافرەت لەو وڵاتەدا بەدی ناکرێت.

دڵپاك: وابزانم پەلەت کرد، ئەگینا ڕۆشنایی تێدا ڕەنگە بەدی بکرێت.

سکاڵا: چۆن؟ ئەوە بەڕاستە؟ ئادەی چۆن؟

دڵپاك: یاساکەی حامورابی ڕێگەی ئەدا بەژن کە جگە لەمێردەکەی شوو بکاو پیاوێکی تریشی هەبێت، بەڵام ئەمە لە حاڵەتێکا ئەگەر ماڵی مێردەکەی ئەوەندە خۆراکی تێدا نەبێت کە ژنەکە تێری پێ بخوات. واتە پێی تێر بێت ، سزای ئافرەتی ناپاکیش خنکاند بوو لەئاودا[3].

سکاڵا: ئای لەو ڕۆشناییە! هەر پیرۆزی خۆیان بێت بەخوا لەو هەموو شوێنانەدا کە باست کردن ژیانی ئافرەت لە بەدبەختی بەولاوە هیچی تر نەبوو.

---

[1] المرأة في القرآن ـ عباس محمود العقاد.

٢ المرأة في القرن العشرين ـ جروان السابق.

٣ المرأة في القرآن ـ عباس محمود العقاد.

دڵپاك: خۆ ئەو شوێنانەی كە باسمان كردوون‌و باسی ژیانی ئافرەتمان كرد هیچ كامیان موسڵمان نەبوون، ڕوونتر بیڵێم لەپێش دەركەوتنی ئیسلامدا بوون.

ئاواز: ئای دڵپاك: ئەزانم.. ئەزانم مەبەستت چییە لەو قسەیە.

## ئافرەت لەناو جوولەكەدا

دڵپاك: جوولەكە هەرچەندە خاوەنی ئایینێكی ئاسمانیی بوون، بەڵام هەندێ پاشماوەی خوو نەریتی دەوری كۆن‌و كۆچەرێتیی لەناویاندا زۆر بە قووڵیی ڕەگی داكوتابوو هەر لەناویاندا مابۆوە، لەبەر ئەوەش ئافرەت لەناو جوولەكەشدا هەر بێشوێن‌و پلەوپایە بوو.

هەر بەهۆی ئەوەشەوە نەیان ئەهێشت ئافرەت لەگەڵ پیاوی برایا هاوشان بێت، لەوەش زیاتر، ئەوەندەیان هێنایە خوارێ هەتا كردیانە هاوشانی بەندەو نۆكەر، لەگەڵ براكانیدا میراتی نەئەبردەوە، ئەگەر باوك لەژیانی خۆیدا شتێكی پێ بدایە. ببەخشایە. هەر ئەوە بوو، خۆ ئەگە ژنێك یان كچێك، سامانێ، شتێكی ببوایە، ئەوە پێویست بوو لەسەری كە شوو بەهاوخێڵی خۆی بكات‌و بەغەیری خێڵی خۆی. با جوولەكەش بێت. شوو نەكات.

لەوەش شووم‌و بەڵاتر ئەوەبوو باوك بۆی هەبوو كە كچی خۆی چ بە ساوایی‌و چ بە گەورەیی بفرۆشێت، ئەوەش لەجوولەكەدا شتێكی سەیر نییە، چونكە هەر لە سەرەتایانەوە بە پارەپەرستی‌و چاوچنۆكیی هێناویانە.

سكاڵا: مەردی خوابە دڵپاك، خەریكە ئەم دنیا فراوانەم لێ بێتە كونەمشك! من قەت بەبیرو خەیاڵمدا نەهاتووە كە ئافرەت بەو جۆرەو تا ئەو ڕادەیە كلۆڵ‌و بەدبەخت بووبێت! وەی لەو ژیانەی!! ئای.. ئای لەبێئاگایی منیش! هەرگیز ئەم جۆرە باسانەم نەبیستووە.

دڵپاك: ئاخر هەر لەبەر ئەمەبوو كە داوام لێكردیت بخوێنیتەوە، سكاڵاخان، خوێندنەوە بەكەڵكە، مێشكی ئادەمیزاد ئەكاتەوە، بخوێنەرەوە.

لەوەش سەیرتر، لەناو جوولەكەدا، ئافرەت ئەكەوتە حەیزەوە، وەك گلاو یاخود بەگلاو دەیان ژمارد، گلاویی چییە، خۆ شاخ‌و گوێداریی نییە؟! نانیان لەگەڵدا نەدەخوارد، لەگەڵیا نەیانئەخواردەوە، لەگەڵیا كۆنەئەبوونەوەو لە ماڵێكدا لەگەڵیا دانەئەنیشتن[١].

ئاواز: بێ مێشك‌و سادەو نەزان بوون، ئەگینا ئافرەت لەو كاتەدا كەی ئەوەندە پیسە؟

دڵپاك: منیش مەبەستم ئەوە نییە كە ئافرەت لە حەیزدا پیس‌و گلاو بكەم، نا، بەڵكو باسێكی مێژوویەو بۆتان ئەگێڕمەوە هەتا بزانن ژیانی ئافرەت بەر لەدەركەوتنی ئیسلام چۆن بووە.

---

[١] سەرچاوەی مێژوویی بۆ ئەم باسە ئێجگار زۆرەو نایەنە ژمارە.

# ئافرەت لە ئەسپارتەدا

سکالا: جاروبار "سەربەست"ی برام و هاورێکانی زۆر بەگەرموگوڕیی ناوی سپارتە ئەهێنن و باسی سەربەستی ئافرەت لەو شوێنەدا ئەکەن، بەلام دلپاك، تۆ باسی ئافرەتت لە ئەسپارتەدا پشت گوێ خست!

دلپاك: ئەسپارتە شارێك بووە لە شارە گرنگەکانی یۆنان، بەئازایەتیی و لێزانینی جەنگ ناویان دەرکردبوو، بەڵێ جۆرە سەربەستییەك لەناویاندا درابوو بە ئافرەت. ئینجا نەزانەکان وا ئەزانن کە ئەو سەر بەستییە لەبەر چاوی کاڵی ئافرەت بووە، بێئاگان لەوەی کە خەڵکی ئەو شوێنە . پیاوانیان . گیانی کارو پیشەیان سەربازێتیی بووە، ژیانیان لەسەر دەسکەوتی جەنگ و کوشتار وەستابوو.

ئاواز: باسەکەت لێلایی تیایەو لەمەبەستت تێناگەم دلپاك.

دلپاك: دان نەنان بەمافی مرۆڤدا . نەك هەر تەنها مرۆڤ . لە ئەسپاتەدا لەو پەڕی دلڕەقییدا بوو، بۆ نموونە، هەرکەسێك لەپیاوانیش لەشی کزو لاواز بوایەو بێهێز بوایە ئەیانکوشت، چونکە بەڕای ئەوان بەکەڵکی جەنگ نەدەهات، هەروەها لەئادەمیزاد بە بەندەکرندا دەستێکی بالایان هەبوو، ئینجا لەدڕندایەتیاندا لەگەڵ بەندەکاندا هاوشانیان زۆر کەم بوو، جا ئەو تۆزە نەرمییەی کە بەرامبەر ئافرەت ئەیان نواند هۆیەکەی تەنها یەك شت بوو، بەلام بە هیچ جۆرێك داننان بەمافی مرۆڤدا نەبوو . هەروەك هەندێ بەو جۆرە بۆی ئەچن . بەڵکو ئەو هۆیەش ئەوەبوو پیاوان هەمیشە خەریکی جەنگ و کوشتار بوون، کەم کەم ئەکەوتنەوە ماڵەوە، ناچاریی وای لێکردن کە سەروکاریکردنی ماڵ لەکاتی نەبوونی پیاودا لەماڵەوە بە ئافرەت، واتە بە ژنەکانیان بسپێرن.

سکالا: همم.. ڕاستە، ژیریی پەسەندیی ئەکات.

دلپاك: ئەوەی بۆم باسکردن ڕاستییەکی مێژوویی‌یەو گومانی تێدا نییە. ئەو سەربەستیەی کە لەسپارتەدا بەئافرەت دراوە تەنها ئەوە بووە، ئەگینا لەڕاستییدا زۆر لە سەربەستیی و ئاشکراکردنی مافی ڕەوای ئافرەتەوە دوور بوون، بەڵگەش لەسەر ڕاستیی باسەکەمان، بۆ نموونە: ئافرەتی سەربەست "خانم" ژیانی لەگەڵ کەنیزەکە داوێن پیسەکاندا وەك یەك پێکەوە ئەبردە سەر تا ئەوکاتەی کە پیاوەکەی لە جەنگ و کوشتار ئەگەڕایەوە، هەروەها لەمیرات بێبەش ئەکرا[1].

سکالا: سەیر لەوەدایە سەربەست و هاورێکانی کە گوێ لە هەڵکەوت ئەگرن، کاتێ کە باسی ژیانی ئافرەتیان بۆ ئەکات، چ لە کۆن و چ لە تازەدا، ئەم شتانەی تۆ باسیان ئەکەیت ئەو ناویان نابات! خۆ لە لقی مێژووش لە کۆلێژدا ئەخوێنێ.

دلپاك: خوا یار بێت، ڕۆژێك ئەبێت خۆت بتوانی لەهەموو شتێ بگەیت.

بەداڕشتنێکی تر، ئەتوانین بڵێین ئەو وردە سەربەستیەی کە ئافرەتی ئەسپارتەیی هەیبوو یا پێی درابوو، هەروەك تریفەی مانگ کە بریتییە لە تیشکدانەوەی تیشکی خۆر، دەستەلاتی ئەمیش ڕەنگدانەوەی نەپەردەژانی مێردە جەنگاوەرەکەی بوو.

خوشکان، بەڕاستی لەهەر دەلاقەیەکی مێژووە سەیری ژیانی ئافرەت، لەهەر شوێنێکدا ئەکەین، تروسکایی تێدا نابینین، ژیانی پڕ بووە لە بەدبەختیی و کڵۆڵیی و چەرمە سەری، هەمیشە لێی وەرگیراوە بەبی ئەوەی پێی بدرێت، چەوسانەوەو گەردن کەچیی بەشی بووە، وەك زەویی وەهابووە هەر چاوەڕوانیی بەرهەمی لێکراوە، پیاویش هەمیشە پیت و بەرەکەتی لەوەوە وەرگرتووە، دروێنەی لەو زەوییەوە کردووە، ئەی پیاوان خۆیان زادەی ئەو زەویە بەپیتە نەبوون؟

سکالا: بەلام نزیکترین شوێنت لەخۆمانەوە تا ئێستاش باس نەکردووە، ئەی نازانی عەرەبەکانیش نەتەوەیەکی خاوەن شارستانیەت بوون؟ تا باسی ژیانی ئافرەتیشم لەناو ئەوانا بۆ نەکەی، کۆڵت بەر نادەم و وازت لێناهێنم.

---

[1] موسوعة عقاد/ مجلد (٤)، لاپەڕە (٤٤٣)

ئاواز: بەخوا سەیرە! جاران هەرکە ئێوارە دائەهات وەك مریشك . کە ئەخزێتە کولانەوە . ئەچوویتە ناو نوێنەکەتەوە سکالاّ! کەچی ئێستا وا کاتژمێر بەرەو یانزەی شەو ئەچێت‌و ئەتەوێ تازە دەست پێ بکەینەوە، درەنگە درەنگ، مەردی خوابە واز بێتە.

سکالاّ: بەڕاستی باسەکان هەرچەندە دڵتەزێنن بەلاّم هەر حەز بە بیستنیان ئەکەم، ئەمەوێ فێرببم، تێبگەم.

## ئافرەت لەناو عەرەبدا

سکالاّ: ئای چەندێ بێتاقەتی باسەکانت بووم دڵپاك! لەماڵەوە هەر بیرم ئەکردیت، خوا خوام بوو زوو بگەڕێینەوەو دەس پێ بکەینەوە.

ئاواز: بڕیار وابوو کە ئەمجارە باسی ئافرەتمان لەناو عەرەبدا بۆ بکەیت.

دڵپاك: بەڵێ، لەبیرمەو خوایار بێت بەڵێنی خۆم ئەبەمە سەر، وا ئێستاش هەوارگەمان ئەگوازینەوە بۆ ناو ئەو ژینگەو کۆمەڵگەیەی کە ئیسلامی تێدا دەرکەوت، تا بزانین لەپێش هاتنی ئیسلامدا گوزەرانی ئافرەت لەوێدا چۆن بووە.

بەدڵنیاییەوە پێتان ئەڵێم، کە بەشی ئافرەت لەو ژینگەیەدا لەڕووی نرخ‌و ئینصافەوە لەشوێنەکانی تری گێتیی چاکتر نەبووە. بەشی ئافرەت لەوێشدا هەر دەردەسەریی‌و ناکامیی بووە، لەهەندێ شوێنی ئەو خاکەدا، جەورو ستەم چنگی بێبەزەییانەی ئەگەیشتە ڕیشەی گیانی شیرینی، لەبەشەکانی تریشیا لە نزمترین پلەی ژیاندا دەنگی تاساوی کپ ئەکرایەوەو هیچ کەس ئاوڕی لێ نەئەدایەوە، یان بڵێین هیچ کەس مافی ئەو بەسەزمانەی بەبیردا نەئەهات!

ئەوپەڕی بەرزبوونەوەو شکۆی ئافرەت لەوەدا بوو . واتە تەنها لەبەر ئەوە بوو . کە ژنی پیاوێکی ناودارو بەدەستەلاّت بوو، یان دایکی منداڵی پیاوەکەیە، یاخود خزمەتکاری پیاوە!

بەلاّم پاراستن‌و ڕێزگرتنی بەناوی ئەوەوە کە مرۆڤە، لەڕەگەزی ئافرەتە، خاوەنی مافی سروشتی خۆیەتی، ئەمانە هەر لە ئارادا نەبوون.

بەڵێ باوك، مێرد، کوڕ یان برا، ئەیانپاراست، ئەو پاراستنەشیان بەئەرکێکی سەرشان‌و بەپێویست ئەزانی، بەلاّم ئەو ئەرکە، ئەو پێویستییە کە بۆ پاراستنی شتەکانی تری پیاو پەیڕەویی ئەکرا. بۆ پیاو نەنگ‌و شورەیی بوو کە دەستدرێژی بکرێتە سەر ئەو ئافرەتانەی نزیك‌و خزمی بوون، بەلاّم ئەو نەنگ‌و شورەییە هاوشان بوو لەگەڵ نەنگ‌و شورەییەکدا کە دەستدرێژی بکرێتە سەر ماییەکەی، مەڕو مالاّتەکەی، ئاژەڵەکانی تری، یان هەر شتێکی تر کە پێوەندیی بەو پیاوەوە هەبوو.

سکالاّ: وادیارە هیچ هەواڵێکی دڵخۆشکەر لەناو ئەوانیشدا نابیسترێ!

دڵپاك: بەلاّم هەواڵی دڵتەزێن‌و غەمگین زۆرو زەبەندەیە.

## زیندە بەچاڵکردن

دڵپاك: ئەو بەسەزمانە، هەر بە لەدایکبوونی، لەو خاکەدا، خەڵك یەکسەر مۆنیی‌و ڕووگرژیی دایدەگرت، ئەڵێن کابرایەك ژنەکەی لە سی سکدا هەر کچی ئەبێت، ئەویش لەداخا ماڵەکەی بەجێ ئەهێڵێ‌و ئەچێتە ماڵە دراوسێیەك، کە ژنەکەی بەوە ئەزانێ ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| ما لأبي الذلفاء لا يأتينا | وهو في البيت الذي يلينا |
| يغضب ان لم نلد البينا | وانما نعطي الذي أعطينا[1] |

ئاواز: بەڕاستی قسەکەی جوان‌و پڕ مانا بووە! خۆ ئێستاش زانیاریی تازە لایەنگریی قسەی ئەو ئافرەتە ئەکات.

---

[1] المرأة في القرن العشرين/ جروان السابق.

دڵپاك: ئەوە ڕاستە، بەڵێ ئەیكات، بەڵام خۆ بەدبەختییەكە لەوەدا نەوەستاوە، خۆزگە هەر ئەوەندە بوایە، ئای كە ئافرەت بەختەوەر ئەبوو!

سكاڵا: بەخوا قسەكانت ئەمترسێنن، بۆ چ لەوەش خراپتر هەبووە؟!

دڵپاك: خوشكەگیان، هەر بەساوایی بە چەند بیانوویەكی بێ تان‌وپۆ، باوكەكەی بەزیندوویی ئەیخستە ناو چاڵێك‌و نەی ئەهێشت چاو بەدنیای ڕۆشندا بگێڕێت، بەوە دەوتر زیندەبەچاڵكردن.

سكاڵا: ئۆی.. ئۆی!! لەشم لەترسا، گیانم لەداخا، موچركەیان پێدا دێت! دەی بۆچی؟ لەبەر چی؟ تاوانی ئەو بەسەزمانە چی بوو؟

دڵپاك: قورئانیش هەمان پرسیار ئەكات بە ئیستنكارەوە: (وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَت* بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَت)؟[١]

لە بێئاوەزی بەولاوە ناوی بنێین چی؟ نەفامییەو دروشمەكەی ئەمەیە

من غاية المجد والمكرمات بقاء البنين وموت البنات[٢].

بەلایانەوە هۆی شانخواری‌و مایەی نەنگ‌و هەتك كردن بوو، لەبەر ئەوە كەسوكارەكەی چارەیان نەئەویست، هەرگیز ئەوەندە ڕوویان نەئەدایە كە بگاتە ئەو ڕووپێدانەی بە كەنیزەك یان ولاغێكی بەكەڵك ئەدرێ، ئەوانەشیان كە زیندە بەچاڵیان نەئەكردن تەنها لەبەر ئەوەبوو كە بەبەشێك لەمیرات، ئەو میراتەی كە لەباوكەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ كوڕ، دایان دەنا. لەوەش زیاتر، ئەفرۆشرا، ئەدرا بە بارمەتە بۆ بەجێهێنانی سوودو دانەوەی قەرز.

كۆمەڵگەی عەرەب، كۆمەڵگەیەكی خێڵەكیی بوو، هێرشكردنە سەر یەكتر بەهەق و ناهەق ئارام بوونەوەی بۆ نەبوو، دوژمنایەتیی بۆ تۆڵەسەندن كۆتایی نەدەهات، لەو هەراو جەنگەشدا كە شكۆی خێڵی پێ بەرز یان نزم ئەبۆوە، ئەرك‌و گرنگیی‌و دەستوەشاندن بەپیاو. نەك بەئافرەت. جێبەجێ ئەكرا، بگرە ئافرەت لەو ڕووەوە لەتالانێك بەولاوە هیچی تر نییە، دەست دوژمن ئەكەوێ چ بۆ خزمەتكاریی، چ بۆ ڕابواردن (الاستمتاع)، كە ئەمەش ئەبێتە هۆی چەند جاربوونەوەی ئەركی سەرشانی پیاو لە پاراستنی ئافرەتدا، لەترسی ئەوەدا نەك بكەوێتە دەست دوژمن‌و بكرێتە دیل‌و بەندەیەكی زەلیل! و ببێتە مایەی سەرشۆڕیی خێڵەكەی.

ئاواز: باوەڕ بكەن زیندە بەچاڵكردنەكەی چاكتر بووە لەژیانی.

سكاڵا: هەرگیز نەهاتووە بەبیرمدا كە دڕندایەتیی بگاتە ئەو ڕاددەیە! بەڵام ئەو زیندە بەچاڵكردنە لەهەموو شتێ سەیرتر بووە! ئەوە چۆن بووە؟

دڵپاك: با یەك دوو نموونەیەكت بۆ بێنمەوە، ئەوسا چاك تێئەگەی. باوكێك خۆی بەدەمی خۆی بەسەرهاتەكەمان بۆ ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: "هەر كە كچمان ببوایە زیندە بەچاڵم ئەكرد، قەت بەزەییم بە هیچ كامیاندا نەهاتووەتەوە، جگە لەیەكێكیان كە لەكاتی لەدایكبوونیدا من لە سەفەردا بووم، دایكی فڕاندبووی بۆ لای خاڵوانی‌و سپاردبووی پێیان، كە گەڕامەوەو پرسیارم كرد چیمان بوو، ژنەكەم هەواڵی دامێ كە ساوایەكی مردووی لێ جیابۆوە.

چەند ساڵێك بەسەر ئەوەدا تێپەڕی، تا كچەكە گەورە بوو، پێگەیشت، ئەوسا دایكی هێنایەوە، ڕۆژێك چوومەوە بۆ ماڵەوە كچێكم دی! قژی زەردی جوان، زوڵفی ڕێك‌و پێككراو، ملوانكەیەكی لەملاو سواری گەردنی بوو بوو، پرسیم ئەم كچە كێیە؟ جوانیی‌و ژیرییەكەی سەرسامیان كردم، ژنەكەم دەستی كرد بەگریان، لەپاشا وتی: ئەمە ئەو كچەتە كە لە سەفەر گەڕایتەوەو من گوتم مناڵێكی مردووم لێ جیابۆوە، فڕاندم بۆ لای خاڵوانی وا ئەمڕۆ هێناومەتەوەو گەیشتووەتە ئەم ڕاددەیە.

دانم گرت بەخۆمدا تا دایكی پەشۆكا بەئیشو كارەوە، ڕۆژێك دامە بەر خۆم‌و چاڵێكم بۆ هەڵكەندو فڕێم دایە ناو چاڵەكە..! ئەویش ئەیگوت: بابە گیان، چیم لێئەكەی؟ منیش هەر گڵم بەسەرا ئەكرد! دیسانەوە ئەی گوت: بابە گیان

---

[١] ئایەتی (٨و ٩)ی سورەتی (التكوير).

[٢] المرأة في القرن العشرين/ جروان السابعة.

ئەمکەیت بەژێر گڵەوە؟! بە تەنها جێم ئەهێڵی؟! بەجێم ئەهێڵی!! منیش هەر گڵم ئەکرد بەسەریا، هەتا دامپۆشیو دەنگەکەی پچڕا"[١].

{ماوەیەك هەرسێکیان بێدەنگ بوون، کە دڵپاك تەماشای کردن چاویان پڕبووە لەفرمێسك، چەند خولەکێك گریان، چەندان هەناسەی ساردو کاڵیان هەڵکێشا..!}

سکاڵا: ئای.. ئای! مرۆڤایەتی یان دڕندایەتی بکەین بەناویان؟ ئەوانە ئامیزاد نەبوون، ئەگەر ئادەمیزا وەهابێت حاشا.. حاشا من بێبەرییم لەئادەمیزاد، چیم ناو ئەنێن جگە لە ئادەمیزاد ناوم بنێن.

ئاواز: بەڕاستی ئافرەت حەقی خۆیەتی کە چاوی پیاو هەڵکۆڵێت.

دڵپاك: نا، خوشکەکەم، نا. هەروەك کردەوەکانی ئەوان تاوان بووە، هەر بەو جۆرەش فتواکەی تۆیش تاوانە. شتنەوەی تاوان بە تاوان نابێ، پیاو ئادەمیزادە، ئافرەتیش وەك ئەو ئادەمیزادە، ئەی بۆ پەیڕەویی ڕێبازێك نەکرێت کە ڕاستییو دادگەریی لە جێگای خۆیان دائەنێ؟

بە هەرحاڵ. حەزئەکەم لەو ڕووەوە نموونەیەکی ترتان بۆ باس بکەم.

یەکێك لە یارانی پێغەمبەر ﷺ کە لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ دائەنیشت زۆر غەمبار دەرئەکەوت، جارێکیان پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد: بۆ وا غەمباریت؟ وەڵامی دایەوە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژگاری نەفامییدا تاوانێکم کردووە، ئەترسم هەر چەندە موسڵمانیش بووم، خوا لێم خۆش نەبێت، پێی فەرموو: (تاوانەکەتم بۆ باس بکە). وتی: من لەوانەم کە کچەکانی خۆیانیان ئەکوشت، کچێکمان هەبوو، ژنەکەم لێم پاڕایەوە کە لێی گەڕێم، منیش لێی گەڕام، گەورەبوو پێگەیشتو بوو بە یەکێك لەجوانترین ئافرەتان، خوازبێنییان کرد، کرمی نەفامێتیم جووڵا، دڵم توانای ئەوەی نەبوو کە بیدەم بەشوو یان وازی لێ بێنمو بۆ خۆی هەر لەماڵەوە بمێنێتەوە بەبێ مێرد، بەژنەکەمم گوت: من ئەمەوێ بچم بۆ فلان هۆزو فلان تیرە بۆ سەردانی خزمەکانم، کچەکە بنێرە لەگەڵما، ئەویش بەوە دڵخۆشبوو بەجلوبەرگو خشڵ ڕازاندیەوە، پەیمانی لێ وەرگرتم کە دەستی ناپاکی. مەبەست گیانیەتی. بۆ نەبەم، بردم بۆ سەر بیرێك ڕوانیمە بیرەکە، کچەکە هەستی بەنیازم کرد، زانی کە ئەمەوێ بیخەمە بیرەکەوە، باوەشی پیادا کردمو دەستی کرد بەگریانو ئەیگوت: ئۆش! بابەگیان، ئەتەوێ بمخەیتە بیرەکە؟ بەزەییم پێدا هاتەوە، ئەمجا تەماشایەکی تری بیرەکەم کردەوە، کرمەکەش جوڵایەوە، باوەشی پێدا کردمەوەو ئەپاڕایەوە: ئەی بابە، نەکەی سپاردەکەی دایکم لەدەست بدەیت، وای لێکردم جارێك ئەمڕوانییەوە بیرەکەو جارێك تەماشای ئەوم ئەکردو بەزەییم پیادا ئەهاتەوە، هەتاکو شەیتان زاڵبوو بەسەرماو بەسەرا خستمە ناو بیرەکەوە بەدەم ئەم هاوارەوە کە دیکرد: "ئای بابە خۆ کوشتمت!" منیش لەوێ مامەوە هەتا دەنگی بڕاو کۆتایی پێهات.

پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی دەستیان کرد بەگریان، ئەمجا فەرمووی: "ئەگەر فەرمانم پێ بکرابایە کە کەسێك لەسەر کارو کردەوەکانی سەردەمی نەفامێتیی سزا بدەم، سزام ئەدایت"[٢].

بۆیە خوای میهرەبانیش بەتووڕەییەوە ئەپرسێت: (وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ* بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ).

سکاڵا: ژیانم لەبەر چاوکەوت! خۆزگە لە سەرەتاوە نەبوومایە، یان بە ئافرەت خەلق نەکرامایە! ئای لەپیاو!! ئۆف لەو دڵو سۆزە!

ئاواز: دواکەوتوو نەزان بوون، دوور لە شارستانیەتو بوون، بەڵام باوو نەریت هەمیشە دەوری خۆی ئەبینێ، شتێکی ڕیشەدارە.

دڵپاك: ڕای هیچکامتان بەڕاست نازانم، چونکە لەبنەڕەتدا ژنو پیاو قەت بۆ دوژمنایەتییو چەوسانەوە خەلق نەکراون، مەسەلەکەس پەیوەندی بە پێشکەوتنو دواکەوتنەوە نییە وەك ئاواز بۆی چوو، بەڵکو پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە هیوادارم ڕۆژێ لەڕۆژان باش تێبگەن.

نەیان ئەهێشت ساتێ بژیت بە ئازادیی، بێ ئاهی کاڵ

---

[١] كتاب الأغاني: لأبي الفرج، من لە "كلمات مضيئة مهداة الى المرأة"ی ناجي النجار وەرمگرتووە.

[٢] مجموعة رسائل للعلامة المجاهد/ الشيخ محمد الحامد ص ٩و٨.

بەساوایی بەبێ تاوان، بەزیندوویی ئەخرایە چاڵ

بەگەورەییش لەگەڵ پیاوا کە ئەو ئەمرد ئەیانێژان

ئەسووتێنران، ئەبوونە گەرد، دەست و پەنجە، ئەگریجەو خاڵ.

هیوادارم ڕۆژێ بێتە پێشەوە لەهەموو شتێك بگەن، هەرچی قسەو باسێك کە بیستووتانە بەوردی سەر لەنوێ پیابچنەوە، هەتا ڕاست و ناڕاست لەیەکتر جیا بکەنەوەو پەیڕەویی ڕاست بکەن.

## فڕو فێڵ کردن لەگەڵ ئافرەتدا

دڵپاك: لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا ئافرەت میراتی نەئەدرایە، بەڵکو خۆی جۆرە میراتێك بوو کە ئەهاتەوە بۆ نێرینە، لەهەندێ شوێندا گەر بۆی بهاتایەتەوە ئەوەش چەسپاوو دیای کراو نەبوو، بەزۆریی مافی خاوەنداریێتی نەبوو. ژیانێکی ترش و تاڵ لە هەموو سەرێکەوە، چەوساوەو دەسبەسەر بوو.

ژیانی هاوسەرێتیی و خێزانداریی لەسەر بنەڕەتی مافی هاوبەش بنیات نەئەنرا، ئافرەت لارەمل بوو، بەستنەوەی ژن ڕێگەی زۆرو زەبەندەی هەبوون تەنانەت تەلاقدان فێڵ و تەڵەکەو ساختەی جۆر بەجۆری تێدا ئەکرا، کە هەمووشی لێدانی بەرژەوەندیی ئافرەتی بەسەزمان بوو، هەر بۆ نموونە ذەك بۆ هەڵدان:

پیاو بەژنەکەی خۆی ئەگوت "أنت علي كظهر امي". بەوە لێی حەرام ئەبوو، بەلام بە بەنی پیاوەکەوە کۆت ئەکراو نەی ئەتوانی خۆی دەرباز بکات لێی، یاخود پیاو سوێندی ئەخوارد کە لە (جێگە)دا نەچێتە لای ژنەکەی، کەچی ئەشچوو یان نەئەچوو، دیسان بەوە ژنەکە لەنێو تەلاقداریی و بێ تەلاقییدا ئەبەسترایەوە.

سکالا: *وەیی!!* ئەڵێت دواکەوتوو نەزان بوون ئاواز، بیستت؟! ئەها چەند زۆرزان و زیانەخەرۆو ستەمکار بوون!

دڵپاك: ستەمکارییان لەو ڕادەیەدا نەوەستاوەتەوە. هەر پیاوێك لەیەك کاتدا، بەئارەزووی خۆی، بەپێی دەسەڵات و بۆ لوان بۆی هەبووە چەند ژنی ئەوێ بیهێنێ و بیبێت. هەر بۆنموونە: (غەیلان کوڕی سەلمە ئەلسەقەفی) کاتێ کە موسڵمان بوو (١٠) ژنی هەبوو، (عومەیر ئەلسدی) هەشت ژنی هەبوو، ئەمانەو هاوچەشنەکانیان، یەکێك لە ئامانجەکانیان، لەزۆریی ژنهێنانیاندا ئازاردانی ژنەکانیان بوو، ناڕەحەتکردن و پەستکردنیان بوو.

ئاواز: ئەی! هیچ هۆیەکی تر بۆ پەستکردن نەبووە لەناوا!! ئەی نەیان ئەزانی کە ئافرەت لە هەموو سەرێکەوە پەست و ناڕەحەتکراوە؟

دڵپاك: ئافرەت کە لەکۆمەڵگەی نەفامیدا ژیا دیارە بەشی هەر مافخوراویی و ستەملێکردنە، ئەی بەتەمای چین؟

## جۆرەکانی هاوسەرێتی سەردەمی نەفامی

دڵپاك: هاوسەریی "الزواج" لەناو عەرەبدا، لەسەردەمی نەفامییدا، چەند ڕێگەو شێوازێکی سەیر سەیری هەبوو، لەوانە: هاوسەرێتی ئاسایی "شەرعیی" کە زۆر کەمبوو، هاوسەرگیری فالگرتن "الاستبضاع"، هاوسەرییەك بوو کە لە (١٠) کەس کەمتر لەیەکاتدا ئەچوونە لای یەك ئافرەت ئیتر سکی پڕ ئەبوو، ئەمجا کە منالی ئەبوو ئەینارد بەدوایاندا، ئەوانیش بەپێی باوو نەریت نەیان ئەتوانی نەیەن، پێی ئەگوتن: "وا ئەوەی چاندتان سەوز بوو، فلانەکەس ئەم منالە هی تۆیە". ئارەزووی چۆن بووایە ئەیکرد بەهی ئەویان، کابراش بۆی نەبوو سەرپێچی بکات، بەوەش منالەکە ئیتر باوکی خۆی ئەناسی. جۆرێکی تر لە هاوسەریی، ئەوە بوو پیاوان هەرکەس ئارەزووی ببوایە، ئەچوو بۆ لای ئەو ئافرەتانەی کە ئالای تیاترۆیەتییان بەسەر ماڵەکانیانەوە دائەکوتا، جا کە سکی پڕ ئەبوو منالەکەی لێ ئەبۆوە، ئەوسا بەپێی ڕاوێژی سەرناس "القافة" منالەکە ئەبوو بەهی پیاوێك[1].

---

[1] کتاب النکاح: بخاري.

سکالاَ: سەد خۆزگە ئافرەت هەر لە سەرەتاوە خەلق نەکرایە، توخوا مەرگ خۆشتر نییە لەو کارە پیسە چەپەلاَنە؟ ئۆف.. ئۆف!!

ئاواز: بەلاَم بەزەییم بەو منالَە بەسەزمانەدا دیَتەوە کە لەو ڕیَگەیەوە لەدایکبووە، ئۆشش! چەند بەدبەختو ناشاد بوون!!

دلَپاك: بەلاَم پیَویست بەو ئاخو داخە ناکات کە ئیَوە دەری ئەبڕن، نا.

ئاواز: تۆ کچیَکی سەیریت! چۆن پیَویست ناکات؟ کەی ئەوە ڕاستە، دە کەس یان هەرکەس ئارەزووی هەبیَت بچیَتە لای ئافرەتو منالَی ببیَتو هەروا بەکویَرانە بیدەن بەسەر کابرایەکدا؟ بەدبەختیی لەوە گەورەتر بۆ ئافرەت، بۆ ئەو منالَە بەسەزمانە ئەبیَ چی بیَت؟!

دلَپاك: چاوەکەم، (...) گەریی ئافرەت لەسەردەمی نەفامییدا سادەبووە، بەلاَم هی نەفامیی ئەمڕۆ زۆر لەهی ئەوکاتە پیسترە، چونکە هی ئەمڕۆ ئالَۆزە.. ئالَۆز. هەروەها ژمارەی ئەو زۆلاَنە کەمبووە لەچاو هی ئەمڕۆدا. بۆ نموونە: لە ئەمریکادا هەموو سالَیَك یەك ملیۆن زۆلَ لەدایك ئەبیَت[1]، بەبیَ ئەوەی باوکی خۆیان. با بەناویش بیَت. بناسن یان بزانن، لەکاتیَکدا بەو ئافرەتە زۆلَهیَنەرانە ئەلَیَن (کچە دایك) واتە (الأمهات العذاری)!! خۆ هەر هیچ نەبیَت زۆلَەکانی نەفامیی کۆن باوکیَکی درۆینەیان بۆ پەیدا ئەکردن، ئایا لەمنالَە زۆلَەکانی شارستانیەتی ئەمڕۆ بەختەوەرتر نەبوون؟ خۆ ئەگەر هەلَگرانی ئالاَی شارستانیەتی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاَتی ئەمڕۆ لەپەیداکردنی باوکدا بگەیشتنایە نەزانو سادەکانی سەردەمی نەفامیی، گویَی دنیایان پڕ ئەکرد لەهەراو گالَەو پڕوپاگاندە، گوایا چارەسەری هەموو گیرگرفتیَکی ئافرەتیان دۆزیوەتەوە، ئەیانکرد بە جەژن، بە جەژنی ڕزگاریی ئافرەتو ئەویشیان ئەدایە پالَ جەژنەکانی تری ئافرەت.

سکالاَ: بەلاَم هەرکەس باسی ڕۆژئاوا بەخراپە بکات، من وا ئەزانم کە ڕیشەی دلَم دەرئەهیَنیَ، چونکە ئەمڕۆ هەر ئافرەتی ئەویَ سەربەستە.

ئاواز: ڕۆژاوا لە ڕیَزگرتنی ئافرەتدا هەرگیز ناگات بە تۆزی پیَی ولاَتە سوسیالیستەکاندا، ئەمە ڕاستییەکە پیَویستی بەباسکردن نییە.

دلَپاك: با نەیکەین بە دەمەقالَەو خۆمان بە گەڕەلاوژەوە نەپەشۆکیَنین. هەر کە لە هەر لایەکدا، خەلَك خوای نەناسی، ترسی خوای لەدلاَ نەبوو، باوەڕی بەڕۆژی دواییو پاداشتو تۆلَە نەبوو، چی بۆ لوا ئەیکا، هەرچی توانی، سلَی لیَ ناکاتەوە، چونکە سروشتی کۆمەلَگەی نەفامیی لەهەموو سەردەمیَکدا هەر ئەوەندەی لیَدیَت.

لەسەردەمی نەفامییدا، لەناو عەرەبەدا، پیاو ئەیتوانی لەیەك کاتدا دوو خوشك ژنی بن، لەوەش زیاتر، بەپیَی هەوەسی خۆیان ژنیان ئەگۆڕییەوە، کچ بەکچیان ئەکرد، بەبیَ مارەیی، بابەژنی خۆیانیان ئەهیَنایەوە، "الزواج من زوجة الأب" پاش مردنی باوك، لەناویاندا خۆشیی لیَ دیتن، "المتعة" باو بوو، زیناکردنی ڕاستەوخۆ بەچەند شیَوەیەك، زۆرو زەبەندە بوو.

سکالاَ: ئەی قوڕم بەسەر! وام زانیوە لەئاژەلَ لەوەڕاندن بەولاوە هیچ جۆرە شتیَکی تریان نەزانیوە!!

دلَپاك: ژن کە میَردی ئەمرد، پیَویست بوو لەسەری یەك سالَی ڕەبەق تازیەی بۆ بگریَت. بەلاَم چۆن تازیەیەك! لەمالَ دەرنەچیَت، خۆی جوانو ئارایشدار نەکات، جلوبەرگی جوان لەبەر نەکات، ناوی شووکردن نەبات. نەهیَلَیَ هیچ کەس ئەو باسەی لەلادا بکاتەوە. کەسوکاری میَردەکەشی لەو کاتەشدا ناچار نەئەکران بەدابینکردنی شویَنو خۆراکو جلوبەرگ بۆی!

ئاواز: جا بیان کوشتایە یا خۆی خۆی بکوشتایەتەوە چاکتر نەبوو لەوە؟

---

١ صحيفة الشرق الأوسط، العدد الصادر في ١٩٨٢/١/٦.

دڵپاك: زۆریی ماوەیی و ڕەگەزپەرستیش لەلایەکی ترەوە بوو بووە هۆی مانەوەی زۆربەیان بەبێ مێرد، کە ئەوەش یەکێك بوو لە هۆیەکانی بێنرخیی و بەدبەختیی هێنان بەسەر ئافرەتدا، لە کاتێکدا مارەییەکەش باوك و براو کەسانی کچەکە یان ژنەکە ئەیانبرد و خەرجیان نەئەکرد بۆی.

دەی توخوا، فەرموون، بگەڕێن بۆ جێ پەنجەیەکی تاوانی ئیسلام لەو هەموو بەدبەختیی و چەوساندنەوەو کوێرەوەرییەدا کە تێکەڵی ژیانی ئافرەتی بەسەرزمان بووە لەسەرانسەری جیهاندا!

ئاواز: ئاخر ئەوەی تۆ باست کرد هی سەردەمەکانی کۆنە، هی چەرخەکانی پێش دەرکەوتنی ئیسلامە، ئیتر بۆچی لەئیسلام بدوێین؟

دڵپاك: ئاه! ئەی چۆن حوکمێ بوو ئەو حوکمەی کە لەسەرەتاوە داتان بەکۆمەڵی ئیسلامدا؟! لەبیرتان چۆوە کە گوتتان: "ئیشی سەرەکیی ئیسلام چەوساندنەوەو کۆتکردنی ئافرەت بووە"؟

سکاڵا: دڵە گیان، تۆ باسی ڕابوردوو پێش ئیسلامت کرد، زۆرچاکیش باوەڕم بە ڕاستیی باسەکانت هەیە، ڕابردووش ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە.

دڵپاك: خوشکان، منیش مەبەستم لەو باسە مێژووییە ئەوەبوو کە بزانن، ئەوانەی ئەو جۆرە قسانەیان فێری ئێوە کردووە لەدژی ئایینی ئیسلام ڕاستگۆو ڕاستناس نەبوون، نایانەوێت ئێوەش ڕێگەی ڕاستی ژیان بگرنە بەر.

هەروەها وەك گوتمان ئەم قسەیە "ڕابردوو هیچ نییەو ڕۆیی و ناگەڕێتەوە" لەتەرازووی ڕاستییدا هیچ سەنگێکی نییە. ئەی ئێستامان زادەی ڕابردوو نییەو نابێتە دایکی دواڕۆژ؟

سکاڵا: ئەوەش ڕاستە. بەڵام نازانم بڵێم چی؟ گیروگرفت زۆرە.. زۆر!

ئاواز: بەڵام ئێستاش ناتوانین بڵێین ئافرەت گەیشتووەتە ئاواتی خۆی.

دڵپاك: لەوەدا لەگەڵتانم، ڕاست ئەکەن، بەڵام کام ئاوات؟ ئایا هەموو ئاواتێك هەر ڕەوایە؟ ئایا ئەو ئاواتە زادەی بیری خۆیەتی یاخود پیاوان بەشێوەی کەڵکەڵە "مەراق" بۆ سەرلێ شێواندنی ئافرەت دروستی ئەکەن؟ داواتان لێئەکەم کە کەمێك دووربین بن، وردبین و خاوەن سەرنج بن، هەرچی کە دەیبیستن، یەکسەر باوەڕی پێمەکەن، لەپێشەوە لێی بکۆڵنەوە، بیری لێ بکەنەوە، ئەوسا بیخەنە گەنجینەی بیرتانەوە.

## ئافرەتی کورد

دڵپاك: لەناو کوردەوارییدا، پێش هاتنی ئیسلام، نەك هەر تەنها ئافرەت، تەنانەت پیاوانیش بەندە و ژێر دەستەی فارسەکان بوون، هەر بزووتنەوەو ڕاپەڕینێکیان ساز کردبێت دەمودەس لێی دراوەو کپ کراوەتەوە. جۆرەها چەوساندنەوەیان چەشتووە، ئازار دراون.

ئافرەتی بەسەزمان چوارمێخە کێشراوە، خۆڵ و دۆی بەسەرا کراوە، کۆت و زنجیر کراوە، بەزۆرو زەبری خەنجەر دراوە بەپیاوێ کە ئەو پێی ڕازی نەبووە، ئاغا داوێن پیسەکان، هەر کچێ جوان بووبێت بەزۆر سەندوویانە لە خاوەنەکەی، باوی عەشایەریی و هۆزایەتیی باڵی ڕەشی کێشاوە بەسەر زۆربەی کوردستاندا، تەنانەت کوردستان پێش هەڵهاتنی خۆری ئیسلام ناوی کوردستان نەبووە، کوردەکانیش بە (شاخ نشین) ناوبراون[1].

هەروەها ئەتوانین بڵێین زۆربەی ئەو باوو نەریتە نەشیاوانەی کە لە خاکی فارسدا هەبوون، لەناو کوردەکانیشدا هەبوون، چونکە هەمیشە میللەتی ژێردەستە لاسایی ئەو میللەتە ئەکاتەوە کە زاڵە بەسەریا، خۆ ئەگەر هاتوو داگیرکردن چەند سەدەیەکی خایاند، دیارە وردە وردە میللەتە ژێر دەستەکە شێوازی ژیانی خۆی لەبیر ئەچێتەوەو ئەوسا شێوزای ژیانی نوێی ڕەنگدانەوەی جۆرو شێوەی ژیانی زاڵبووەکە ئەبێت.

ئاواز: باشە، پێم ناڵێیت پیاو چی لەئافرەت ویستووە؟ بۆچ وەها؟

---

[1] تأريخ الطبري.

دڵپاك: وەڵامی ئەو پرسیارەت بە ڕستەیەك یان دوو ڕستە تەواو نابێت، ئەگەر خوا مۆڵەتی داین‌و لەسەر باسەكەمان بەردەوام بووین، ئەوە وەڵامەكە هەر خۆت ئەتوانی بیدەیتەوە، ئەوەندەت پێ ئەڵێم كە پیاو خۆی لەخۆیدا ئەوەندەش دڕندە نییە، بەڵكو ڕێگای ژیان‌و بێباوەڕیی وای لێئەكەن.

سكاڵا: ئاه! هەرچەندە ئەو ژیانە ئەدەمە بەر ئەندێشەم خەریكە شێت ئەبم!

دڵپاك: هەتا بڵێیت ژێردەستەو چەوساوەو ژێر چەپۆك بووە.

مافی خاوەنداریێتی نەبوو، مافی ئەوەی نەبوو فێر بێت

لەمیراتا ڕەوا نەبوو وەكو براكەی جێگیر بێت

میراتێك بوو، یان بەشێك بوو لەو شتانەی میرات ئەكران

وەها باوبوو ژێر چەپۆك‌و بێبەش‌و نرخ‌و ئەسیر بێت.

ئافرەت‌و بەندایەتی

دڵپاك: سكاڵا خان، پێویستت بە یارمەتیی هەیە بێم دەسبارت بدەم؟

سكاڵا: نەخێر نەخێر، سوپاست ئەكەم، هەموو شتێكم ئامادە كردووە، بەڵام دوای نانخواردن كارم پێتەو دیسان ئەبێ بچینەوە سەر باسەكەمان.

دڵپاك: بەسەرچاو، ئامادەم، چۆن حەز ئەكەن با وابێت.

(پاش نانخواردن‌و چا خواردنەوەو تەواوكردنی ئیشوكار دانیشتنەوە).

سكاڵا: دوێنێ شەو، لەژێر لێفەكەمدا ئەندێشە فڕاندمی.. فڕاندمی هەتا بردمییە سەر باسی بەندەو بەندایەتیی، لەمەوبەر كە ئەو باسانەم ئەبیست باوەڕم پێیان نەئەكردو عەقڵم پەسەندی نەئەكردن، بەڵام ئێستا بیرم گۆڕاوە، ئا، باشبوو كە زانیم ئەو بەندانەی مێژوو باسیان ئەكات ئەو ئافرەتانە بوون، وانییە دڵپاك؟ ئەو ئافرەتانە نەبوون؟

دڵپاك: نا، نا، سكاڵا خان، ئەو ئافرەتانەی كە باسمان كردن هەموو ئافرەتە ئازادەكان بوون، هی چینە ئازادەكان بوون، باشبوو، كە بەندەو بەندایەتیت بیر خستمەوە، گوێبگرە بۆ ئەو باسە:

بەندایەتیی‌و بە بەندەكردن لەسەرانسەری گێتییدا هەبووەو باو بووە، چ لەو شوێنانەدا كە باسمان كردن، چ لەو شوێنەكانی تری سەر زەوییدا.

سەرچاوەی بەندایەتی زۆرو هەمەجۆر بووە، لەوانە: قەرزاریی، دیلیی، فڕاندن، دزینیی منداڵ‌و گەورەكردنی، بەندایەتیی بە كەلەپوور "العبودية الوراثية" ڕش پێستێتی.. هتد.

ئەو دەردە پیسە لەلایەن ئایینە دەسكاریكراوەكانەوە، لەلایەن دەوڵەت‌و فەلسەفەشەوە پشتگیری ئەكرا، بەئاشكرا بڕیاری لەسەر ئەدرا، ژمارەی بەندە ئێجگار زۆر بوو! هەر بۆ نموونە: لەشاری ئەسینادا سەد هەزار بەندە هەبوو، لەكاتێكدا ژمارەی ئازادەكانی ئەو شارە لە بیست هەزار كەس تێنەدەپەڕی!! ئەو "ئەسپارتە"یەی كە ئێوە ناوتان برد، كاتێ كە ژمارەی بەندەكانیان زیاتر لەپێویست بوایە، زیادەكانیان ئەكوشت‌و تەنها ئەوانەیانیان ئەهێشتنەوە كەپێویست بوون!

ئاواز: وی.. وی!! ئۆف، ئەم هەواڵە بەجارێ دڵی داگرتم!!

دڵپاك: پێویست بەگریان ناكات خوشكە سكاڵا، من‌و تۆ لەوەدا تاونبار نین.

سكاڵا: ئاخر ئەو ئەسپارتییانە تاوانبار‌و خوێنمژ بوون، دڕەندەو كێویی بوون، تاوانە.. تاوان! ئەی ئەو بەندانەش ئادەمیزاد نەبوون؟!

دڵپاك: بەڵێ ئادەمیزاد بوون، قسەكانی تریشت هەموویان ڕاستن، بەڵێ، تاوانە، منیش بە گەورەترین تاوانی دائەنێم، بەڵام ڕوویداو بڕایەوە ئەگەر وشەی "بڕایەوە" بۆ باسە مێژووییەكە بەكار بێنین.

خوشكان، ژیانی ئەو هەژارانە ئەوەندە تاڵ‌و خراپ‌و پیس بووە لەباسكردن نایەت، ئاغاكانیان بە گەلێ شێوە مەرگیان ئەكرد بەقوڕگیاندا، كۆت‌و زنجیر ئەكرایە دەست‌و قاچ‌و گەردنیان، ڕەش‌و ڕووت‌و برسیی، ئەوەندەیان پێنەئەدان كە تێر بخۆن، كەچی هەمیشە ئیش‌و كاری قورس‌و گرانیان بەسەرا ئەدان، ئاخ! زۆرجار ئازادەكان، بۆ ڕاهێنانی گەنجەكانیان

هەندێکیان وەك تۆ ئافرەت بوون .. ئافرەت

حەیفە کەئێوەش وەك ئەوان نەژین

ڕەنگە لەبیرتان نەچووبێتەوە کە باسمان کرد، ئوم هانیئ پەنای دوو پیاوی بتپەرستی داو پێغەمبەریش ﷺئەو دەسەلاتە ڕامیارییەی لێزەوت نەکرد، هەتا ئەو ڕووداوە ببێتە بەڵگەی دەستەلاتی ڕامیاریی ئافرەت هەتا هەتایە.

لەوەش گرنگتر، "صاحب الاستیعاب" بۆمان ئەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب "ئەلجارود ئەلعەبدی" لەگەڵ بوو لەڕێگادا خەولەی کچی سەعلەبە–یان پێ گەیشت، عومەر دووەم خەلیفەی پێغەمبەر ﷺسەلامی لێکرد، ئەویش پاش وەڵامدانەوەی سەلامەکەی پێیوت: "ئەی هاوار عومەر، من تۆم ئەناسی ئاژەڵت ئەلەوەڕاندو لەبازاڕی (عکاظ)دا پێیان ئەگوتی عومەر لە (عومەیر)! ڕۆژگار زۆری نەخایاند پێت گوترا عومەر! دیسان زۆری نەخایاند هەتا پێیان گوتی گەورەی موسڵمانان! دەی بەرامبەر ژێر دەستەکانت لەخوا بترسە.."

جارێکیان عومەر خوای لێ ڕازی بێت، ناڕەزایی خۆی دەرئەبڕی بەرامبەر بەرزبوونەوەی مارەیی ئافرەت، کە ئەوەش عومەر باسی ئەکرد بەرژەوەندیی گشتیی موسڵمانانی تێدا بوو نەك هی خۆی، کەچی ئافرەتێکی موسڵمان ڕێی لێگرت و وتارەکەی پێبڕیو وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان ئەی نەتبیستووە کە خوا ئەفەرموێت (وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئاً)"؟ عومەر فەرمووی: "ئافرەتێك پێکای کەچی عومەر کەوتە هەڵەوە".

بەڵێ، ئافرەتی موسڵمان ئەوەندە سەربەستو خاوەن ڕا بووە کە ترسو لەرز لە دڵیا جێیان نەبۆتەوە، ڕای خۆی دەربڕیوەو ڕاکەشی بیستراوە قسەی خۆی بەوپەڕی ڕووسوورییەوە کردووە تەنانەت بەرامبەر سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی، چونکە ئەو کارەی بە بەشێك لە ئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە کە لەڕاستیشدا وەهابووە.

یەکێك لە ئافرەتانی موسڵمان بەناوی (سەمرای کچی نەهیك ئەلئەسەد) بە بازاڕەکاندا تێئەپەڕیو فەرمانی بەچاکەکردنو نەهیی لەخراپەکاریی ئەکرد، قامچیەکی پێبوو تەنانەت بەو قامچییەی لەخراپکاری ئەدا[1]. ئەمەش لە سایەی ئەو ئیسلامەدا کە ئافرەتی خوێندەواری نەفامی ئەمڕۆ وا ئەزانێت ئافرەت ئەبێ ئەو ئایینە بەدوژمنیی خۆی بزانێت، چونکە وەها تێیان گەیاندووەو فێریان کردووە! وەها گۆشیان کردووە!

سکاڵا: بەڵام خوشکە دڵپاك، کەسیش نەبووە ئەم ڕاستییانە بگەیەنێ بە ئافرەت، لەکاتێکدا بەهەزاران کەس بوون چەوتییان فێرکردوون.

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، زۆر ڕاست ئەکەی. بەڵام ئەوەش تاوانی ئیسلامیی تێدا نییە، بەڵکو تاوانەکە هی ئەو کەسانە بووە کە کەمتەرخەمییان لەوەدا کردووە.

لەڕووی چالاکیی سەربازییەوە ئیسلام لەو ئەرکەدا چاوپۆشی لە ئافرەت کردووە، واتە قەرزە نەکردووە لەسەری. ئەمەش حیکمەتی دیارو ئاشکرایەو وردە وردە بۆتان دەرئەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا قەدەغەی ئافرەتی لەچوونە دەرەوە لەگەڵ سوپادا بۆ جەنگ نەکردووە، بەڵکو بۆی هەیە بچێت لەگەڵ سوپادا، بەشداریی جەنگ بکات، بەئامادەکردنو پێشکەشکردنی خواردنو خواردنەوە بۆ سەربازەکان، بۆ برینپێچیی و پزیشکێتیی و فریاکەوتنی بریندارو پێکراوو لێقەوماوان، بۆ هاندانو جۆشاندنی سەربازانو بەرزکردنەوەی ورەیان هەتا ئازاو خۆگر بن لە جەنگەکەدا.

مێژووی ئیسلام پڕە لە نموونەی پاڵەوانێتیی ئافرەتی موسڵمان کە لەژمارە نایەن، بەڵام هەر بۆ نموونە کەمێك ئەهێنمەوە یادتان:

خاتو فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئافرەتانی تردا بۆ جەنگ ئەڕۆیشتو بەشداریی ئەکرد، کوندەی ئەگرت بەکۆڵیەوە ئاوی ئەگێڕاو تینووان ئەیان خواردەوە.

نوسەیبەی کچی کەعب، لەگەڵ مێردەکەیدا زەیدی کوڕی عاصمو دوو کوڕیدا حەبیبو عەبدوڵلا، لە جەنگی ئوحددا بەشداریی کرد، لەسەرەتاوە ئاوی ئەگێڕاو دەووری پزیشکی ئەبینی، بەڵام کاتێ موسڵمانەکان شکستیان بۆ هاتو

[1] کلمات مضیئة مهدان الی المرأة ـ ناجی النجار، ص ٦٦ ـ ٦٧.

تەنانەت دەوروبەری پێغەمبەر چۆڵ بوو، دەستی دایە تیروکەوان‌و شیرو کەوتە جەنگەکەوەو وەك پڵنگ هەڵمەتی ئەبرد، پاش بریندار‌بوونیشی هەر کۆڵی نەداو لە هەڵمەت بردن نەکەوت، دیسان لە جەنگی یەمامەدا بەشداریی کردەوە، هەر ئەو ڕۆژە لە یەمامەدا جێگەی دوانزە برینداریی بەلەشییەوە گیرسایەوە، ئافرەتێك لەشی لە دوانزە شوێنەوە بریندار بووبێت!! ئەوە چی ئەگەیەنێ؟ نەشیاوی ئافرەت؟! ئاه.. ئاه!

خەنسا (تماضر کچی عمرو) لە جەنگی قادسیەدا بەو پیریی‌و کۆتایی تەمەنەیەوە، بەشداریی سوپای موسڵمانانی کرد بەهەر چوار کوڕەکەیەوە، شەو لە گەڵیاندا دانیشت‌و وتارێکی پاراوی کڵپەدراو ئاگراویی بۆ دان، وای لێکردن خواخوایان بوو زوو ڕۆژ بێتەوەو بکەونە جەنگەوە، کاتێکیش هەواڵی شەهیدبوونی بیست، شەهید بوونی هەر چواریان، سوپاسی خوای کرد کە دایکی چوار شەهیدە.

خوشکێ نوسەیبەی پڵنگی مەیدان
لەشکری چیای ئوحودی بەزان
یەکێك بوو وەك تۆ، بەس فەرقی تۆو ئەو
بیرە، ڕێگەیە، جیهادەو ئیمان
خوشکێ ئاسیە، خێزانی فیرعەون
مەریەم، هاجەرە، یان سارە خاتوون
یاخود، ئامینە فاتیمە، خەنسا
وانیش وەك ئێوە هەموو ئافرەت بوون

ئاواز: موسڵمانێتیی گەر بەو جۆرە زیندوو بێت هەموومان حەزی لێ ئەکەین.

## ڕۆڵی ئافرەت لەکۆمەڵگەدا

ئاواز: بەلام تا ئێستا ئافرەتی موسڵمان، ڕۆڵی لەناو کۆمەڵگەدا نەزانراوە، ئەکرێ پێم بڵێت، بزانم چ ڕۆڵێکی هەیە؟

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، ڕۆڵی ئافرەتی موسڵمان لەناو کۆمەڵگەدا زۆر لەوە فراوانترە کە لەباسێکدا جێگەی ببێتەوە، لەوەش بەرزترە کە بە من باس بکرێت، بەڵکو شارەزاو پسپۆڕی ئەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا کورتە باسێك ئەدەم بەگوێتا بۆ تامەزرۆ.

ڕۆڵی ئافرەت ناتوانین سنوورێکی بۆ دیاریی بکەین، چونکە خۆی بێ سنوورە، بەپێی شوێن‌و کات‌و ژیان‌و ژینگەو پێویستی‌و پلەی پێشکەوتن‌و جۆری شارستانییەت ئەگۆڕێت، بەو مەرجەی لەگەڵ گیانی پاکی ئیسلامدا دژایەتیی دروست نەبێت.

ئەو بەدیهێنەرەی کە شیاوی ئافرەت‌و پیاوی لەیاساکانیدا بەیەکسانی ڕەچاو کردووە و هێشتوویەتییەوە، ڕۆڵی ئافرەتی فەرامۆش نەکردووە، گرنگیی ئافرەتی نەخستۆتە پشتگوێ، ئەی خۆی وەهای بەدی نەهێناوە کە نیوەی کۆمەڵگەو دایکی نیوەکەی تری بێت؟ ئایا ئێمە لەو زاناترو شارەزاترین بە بەرژەوەندیی ئادەمیزاد؟

ڕۆڵی ئافرەتی موسڵمان لەناو کۆمەڵگەدا ئەگەر لەهی پیاو مەزنتر نەبێت، بالاتر نەبێت، گچکەو نزمتر نییە، ئەی ئافرەت کارگەی بەرهەمهێنانی مرۆڤ نییە، یەکەمین نەخشی پەروەردە لە پەنجەکانی ئەوەوە ڕەنگ ناداتەوە؟ کام کارگە، پەروەردیار، قوتابخانە، ئەگاتە دایك‌و سۆزە بەرزەکەی؟ توخوا حەق نییە هەموومان ئەم سروودە بەسەر زمانمانەوە بێت؟

خوشکێ، بزانی‌و نەزانی وایە
ئافرەت بەرزترین کارگەی دونیایە
بەه لەو کارگەیە بەه لەو بەرهەمی
ئەو بێ نموونە، ئەم بێ هاوتایە
خوشکێ، یەك بەیەك لەپێغەمبەران

شاهان، زانایان، چاکان، ڕابەران

ئایا ئەزانی ڕۆڵەی ئێوە بوون

بەژەکی پاکی ئێوە گۆش کران![١]

سکالاّ: ئای لەمن! قەت ڕۆژێ لەڕۆژان بیرم لەمە نەکردۆتەوەو هەر نەشهاتووە بە ئەندێشەما، هیچ کەسێکیش ئەم جۆرە باسانەی نەداوە بەگوێمدا! ئای لەمن! بۆچی ئەوەندە بێئاگابووم؟!

دڵپاك: ئاخر هەری بێبەلاّ بی، تۆو هاوچەشنانی تۆ یان پاڵ ئەدەنەوەو واز لەخوێندنەوە ئەهێنن، یان ئەگەر بخوێننەوە، تەنها ئەو گۆڤارو پەڕاوانە ئەخوێننەوە کە لاپەڕەکانیان پڕە لە وێنەی ئافرەتی ڕووتنی دوور لەمرۆڤایەتی، لەبارودۆخێکی قێزەوندا! دیارە ئەوانەش ئەگەر شتی چاك و بەکەڵك بنووسن، ئەوە خۆیان بەدەستی خۆیان گۆڕو مۆڕ بۆ خۆیان هەڵئەکەنن، بەلاّم من وەك خوشکێکی دڵسۆز پێتان ئەڵێم کە ئەو جۆرە گۆڤارو پەڕاوانە زانیارییان تێدا نییە.

بالەوە گەڕێین و بێینەوە سەر باسی ڕۆڵی ئافرەت، با دیسانەوە ئافرەت بخەینەوە ژێر تیشکی یاسای ژمارە (٧١)ی سورەتی (التوبة)، کە کورتەکەی ئەو ڕۆڵەمان بۆ دەردەخات: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ). پێشەکی من ئەم پرسیارەتان لیّ ئەکەم: وتارەکە، یانی یاسا قورئانییەکە، بەلقەکانیەوە ئاراستەی کێ کراوە؟

سکالاّ: ئەزانم مەبەستت چییە! ئاشکرایە کە ئاراستەی باوەڕداران بەنێرو مێیانەوە کراوە، ئەوەتا (المؤمنون) پیاوانن، (المؤمنات) ئافرەتانن، واتە ئاراستەی هەردوولایان بەیەك شێوەو لەیەك پلەدا کراوە.

دڵپاك: لەخوا بەزیاد بێت، هەستت کراوەتەوە، بەڵێ زۆر جوانت زانی، ئیسلام تەماشای تاك (الفرد) بە تاکیی و دوور لەکۆمەڵ ناکات و نایکاتە قوربانیی لەپێناوی کۆمەڵدا، چونکە ئەزانێت کە کۆمەڵ لە تاکان پێکدێت، کۆمەڵیش بە کۆمەڵە تاکێکی دژ بەیەکتر تەماشا ناکات، بەڵکو تەماشای هەردوولا لەسەر بناغەی باوەڕ بەخوا ئەکات و ئەو باوەڕە ئەکاتە بەستەر "رباط"ێکی بەهێزو پێی ئەیان بەستێ بەیەکەوە، بەلاّم نەك بۆ دروستکردنی دژایەتیی، نەخێر بەڵکو بۆ دروستکردنی دۆستایەتیی و دیتنی ڕۆڵی خۆیان لە کۆمەڵگەو ژیانی خۆیان و نەوە داهاتووەکاندا، چونکە کاری پاك، لەسەر بناغەی خۆشەویستی و دۆستایەتیی ئەوەستێت، نەك دژایەتیی و زۆرانبازیی و ماددەپەرستیی.

جا بەم جۆرە ئەبینین پیاوو ئافرەت لەناو کۆمەڵگەدا ڕۆڵیان یەك ڕۆڵە، ئەرك و ئامانجی هەردووکیان لەو ڕۆڵەدا سازاندان و بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤانەی پاکە، کە کارچاکیی و دەست و دەم و داوێنپاکیی باڵ بکێشێت بەسەر هەموو ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا، وەك گوتمان دۆستایەتیی و خۆشەویستی و هاوکاریی لەو ڕۆڵە گرنگەدا نێرو مێ کۆئەکاتەوەو بەیەکیانەوە ئەبەستێ.

هەروەك زانراوە، مانەوەی هەموو کۆمەڵگەو شارستانییەتێك، لە هەموو کاتێکدا بەستراوە بە دوو هۆی سەرەکییەوە، گومکردن و دەست هەڵگرتن لەو دوو هۆیە، یانی گومکردنی ئەو کۆمەڵگەو شارستانییەتە، یانی تیاچوونی ئەو شارستانییەت و کۆمەڵگەیە، ئەو دوو هۆیەش ئەمانەن، فەرمان کردن بەچاکە، نەهی کردن لەخراپە "الأمر بالمعروف والنهيي عن المنكر".

دیارە فەرماندان بە چاکە یانی پاککردنەوەو پاکڕاگرتنی کۆمەڵگەو شارستانییەت، یان پەرەپێدان و بەرەو پیشبردن و بەردەوامییان، نەهیی کردنیش لەخراپە، بریتییە لە قەلاّچۆکردن و نەهێشتنی هەموو ئەو ناتەواویی و کەموکوڕیانەی کە کۆسپن لەڕێی گەشەکردن و مانەوەی کۆمەڵگەو شارستانیەتدا، بریتییە لەڕامالینی هەموو دەردو دیاردەو کارێکی زیانمەند پێیان، ئەمەش نەك بەپێی بۆچوونی من، بەڵکو شتەکە ڕوون و دیارو ئاشکرایە.

دەی ئافرەت لەم هەموو ئەرك و کارە فراوانەدا وەك پیاون بە قەد پیاو بەشدارن هەروەك لەیاسا قورئانییەکەدا دیتان، ئەبێ دەس بەکاراو وریا بێت، ئاگادارو چالاك بێت، ئایا ڕۆڵ لەمە گەورەو گرنگ و پیرۆزتر ئەبێت؟

---

[١] سروەی بێداریی.

سکالآ: ئەی هاوار! کە ڕۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا ئەوەندە بەزرە، ئەی موسڵمانان لەکوێ خەوتوون؟ بۆچ ئافرەتان تێناگەیەنن؟!

دڵپاك: منیش ئەو پرسیارانەی تۆم چەندەها جار کردووەو لەتۆیش بەپەرۆشتر ئەیانکەمەو ئەیانکەمەوە! بەڵام واز لە تاوانبارکردنی خەڵك بێنن و ڕوو بکەینە ڕاستییەك کە ئەمەیە: ئیسلام بەئیسلامێتیی خۆی ماوەتەوەو ئەشمێنێتەوە، دەبا لەئێمەوە دەست پێبکات.

## پێویستت بەشیرین کردنە

ئاواز: دڵپاك خان، قایل بووم بەوەی کە ڕۆڵی ئافرەت بەرزو گرنگەو هاوشانە لەگەڵ هیی پیاودا، بەڵام وا تێئەگەم کە بۆ ئافرەت، شیرین کردنە "ترغیب"ە، واتە بەئەرك‌و پێویستی لەسەری دانانرێت.

دڵپاك: خوشکی بەڕێز، تۆ وەهای ئەزانی، ئەگینا وانییە؟ کێ ئەوەی پێ گوتوویت یان لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرتگرتووەو بەڵگەت چییە؟

ئاواز: کەس پێی نەگوتووم، تەنها تێگەیشتنی خۆمە، ئەی وا نییە؟

دڵپاك: نەخێر، وانییە. قسەش ئەگەر لە کەسێکەوە وەرنەگیرابێ‌و بەڵگەش بەدەستەوە نەبێت‌و سەرچاوەش دیایی نەکرێت، بێگومان ئەوە بە ڕایەکی کەسیی دائەنرێت‌و مەرجیش نییە کە ڕاست دەرچێت.

بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئیسلام لەهەموو فەرمانەکانیدا بۆ چاکەکردن‌و لە نەهیی کردنیا بۆ خراپە، شیرین کردن بەکارئەهێنێ، بۆ نموونە: نوێژکردن شیرین ئەکات لەبەر چاومان بەوەی کە کەڵکی بۆ ئەم ژیان‌و ئەو ژیانمان هەیە، دوورکەوتنەوە لەدەستدرێژیکردن بۆ شەرەفی خەڵکی شیرین ئەکات لەبەر چاومان، تا بەوە بەرەو یەکەم بڕۆین‌و لەدووەم دوور بکەوینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوو شتە پێویست‌و فەرزن، لەسەر موسڵمانان.

بەڵێ‌و خوشکەکانم، چاککردنی کۆمەڵ‌و کۆمەڵگە خراوەتە ئەستۆی ئافرەت‌و پیاو، سپاردەیەکە لەئەستۆی هەردوویاندایە، هەریەکەیان بەرانبەر ئەو چاککردنە بەرپرسیارە، ئەو کارەش هەموو لایەنەکانی ژیان، گیانیی تا بەڕێوەبردن، ئابووریی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتی، پەروەدەیی، سەربازی.. هتد. ئەگرێتەوە، هیچ کام لە نێرو مێ نابێ هەڵوێستی ساردو سڕی هەبێت‌و بەرامبەر حوکمی خراپ، گیروگرفتی هەژاریی، ستەمکاری، نەخۆشیی، نەزانیی، ماف زەوت کردن، ئیستغلال، بەدخوویی‌و بەدڕەفتاریی یان هەر شتێکی تر کەدژ بە بەرژەوەندیی‌و چاکەی کۆمەڵگەی ئیسلامیی بێت بێدەنگ بێت‌و سەر دابخات، چونکە پێغەمبەرﷺفەرمانی داوە بەسەریاندا کە بجووڵێن‌و نەیهێڵن: "من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الايمان"[١].

هەروەها ئەفەرموێ: "من لم يهتم بامر المسلمين فليس منهم"[٢]. گومان نییە لەوەدا کە ئەزانن وشەی (من)کێ ئەگرێتەوە.

ئاواز: تەبعەن.. تەبعەن، بۆ ئادەمیزاد بەکار دێت چ نێر چ مێ.

دڵپاك: هەروەها (شؤن المسلمين) کارو باری موسڵمانان فراوانەو سەراپای ژیانیان ئەگرێتەوە، بێگومان ژیانیشیان بەپێی ڕۆژگارو پلەی پێشکەوتن فراوان تر ئەبێت، جا ڕۆڵی ئافرەت سەراپای ژیان بگرێتەوە لە کۆمەڵگەی موسڵماندا، لەوە زیاتر ئافرەت بەرەو کوێ بفڕێت؟

---

[١] رواه مسلم

[٢] رواه مسلم

ئەوانەی کە خۆیان بە حەرەکیی "دیالێکتیی" دائەنێن‌و شانازیی بەخۆیانەوە لەپاڵ دیالێکتیکەکەیانەوە ئەکەن‌و ئیسلام بەبەستوو "جامد" ئەزانن، بەهۆی تێنەگەیشتنیانەوە لەئیسلام وێنە ڕاستەقینەکەیان هەڵگەڕاندۆتەوە، ئەگینا کەی ئەگەن بەتۆزی پێی بەرنامەی حەرەکیی ئیسلامدا؟

دواجار زەق‌و ڕاست‌و ڕەوان پێتان ئەڵێم: ڕۆڵی ئافرەت، ئەگەر مەلهەو تیاترۆخانەو باڕو سینەماو شانۆکانی وەك هی ئەمڕۆ بێت، ئەگەر سەما و سووڕدان‌و مەلەکردن بێت لەگەڵ بێگانەدا بەلەشی ڕووت، بێگومان ئیسلام تف ئەکاتە ناوچاوی ئەو ڕۆڵەو نای سپێرێ بەئافرەت، هەروەها ئەگەر ڕۆڵی بریتی بێت لەبەرەڵڵایی‌و بەدڕەوشتی‌و داوێنپیسی‌و هێنانە خوارەوەی مرۆڤایەتیی بۆ ڕیزی ئاژەڵ، پشت هەڵکردن بێ لەبەهرەو تایبەتمەندییەکانی ئادەمیزاد، ئیسلام تف لەو ڕۆڵە ئەکات‌و ئافرەتی لێ ئەشارێتەوە.

سکالآ: باشە خوشکە دڵپاك، تۆ ئەم زانیارییانە لەچییەوە فێر بوویت؟

دڵپاك: لەدراسەی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، لەخوێندنەوەوە، خوێندنەوە پێویستە، بیکەن بەخوو خوشکەکانم، ئەوەی بخوێنێتەوە لەهەموو شتێك تێئەگات، هەرکەسیش واز لە خوێندنەوە بێنێ ئەوەش کە ئەیزانێ لەبیری ئەچێتەوە، بخوێننەوە باتێبگەن، باخۆتان بناسن، باڕۆڵی خۆتان لەژیاندا بزانن‌و پێی هەڵسن.

خوشکێ، خاوەنی زۆر پلەو پایەی
گەنجێنەی چاکی سەر ئەو دونیایەی
دارێکی بەزری پڕ بەرو سایەی
بۆ باوەڕداران چاکترین سایەی
خوشکێ، مەردم گەل ئای! هیوای پێتە
هەرکە ئەبینێ ڕێی ڕاستیی ڕێتە
دەی تۆش ژیرانە هەنگاو هەڵگرە
وەکو ئێستا بیت گلەییم لێتە[1].

[1] سروەی بێداری، چاپی یەکەم.

# بەشی شەشەم

## گەواهیدان تایبەتمەندییە نەك شتی تر

سكالاَّ: ئا.. باشبوو كە بیرم كەوتەوە، زۆرجار سەربەستو هاوڕێكانی گاڵتە بەمنو خوشكو دەستەخوشكەكانم ئەكەنو ئەڵێن: دوانتان لە ئیسلامدا بەقەدەر یەك پیاون.

كە لێیان ئەپرسم ئەم قسەیان لە چ سەرچاوەیەكەوە هێناوە، ئەڵێن لە قورئاندا هەیە، بڕۆ بیخوێنەرەوە بەچاوی خۆت ئەیبینی. ئایا شتی وەها كە دوو ئافرەت بەقەدەر یەك پیاو بن، لە قورئاندا هەیە؟

ئاواز: بەڵێ.. بەڵێ هەیە، سەبارەت بە گەواهیدان. شایەتیدان. دوو ژن ئینجا بەقەدەر یەك پیاو نرخو ڕێزیان هەیە!

دڵپاك: پێشەكی، سەربەست ئەگەر (سەربەست) بوایە، ڕێگەی قەت بە هاوڕێكانی خۆی نەئەدا بەوشێوەیە بێنە ناو خوشكەكانیو دەستە خوشكانی خوشكەكانیو گاڵتەیان پێ بكەن، هەرچەندە لەوانەشە ئەم قسەیەمت پێگران بێت خوشكە سكالاَّ، ئەی سەربەست نابێ هەست بەو مافە بكات؟

بەدڵنیاییەوە پێتان ئەڵێم: سەربەستو پێرەكەی ئەو قسەیان لە خەڵكی ترەوە وەرگرتووەو بەچەشنی تووتی ئەیڵێن و ئەیڵێنەوە، بەبێئەوەی لەباسو بابەتەكە هیچ شتێ بزانن، پەی بە گیانی مەسەلەكە بەرن، هەر ئەوەندەیان لەسەرە بیڵێنو بیڵێنەوە.

هەرچیمان فێركەن منەت بەگیانە

هەر فەرمانێ هات، بەڵێو قوربانە

ئەوەندە بیرو حاڵمان وێرانە

ژاری كوشندە لامان دەرمانە

ئەوەی كە ئەوان بەكوێرانەو لەسەر سرووشتی تووتی بەدەوری گوێی ئێوەدا هێناویانە، شتێكی ترەو دوورە لەو مەبەستەی كە بۆی چوون، باسەكە هی خریدو فرۆشە، هی قەرزو مامەڵەیە، نەك شتێكی تر، واتە لە سنووری قەرزو مامەڵە ناچێتە دەرەوە، بەستراوە بە خریدو فرۆشو سەنەدو كارییەوە.

ئەو یاسا قورئانییە لە سورەتی (البقرة) دایە، لەژێر ئایەتی (٢٨)دا، كە ئەفەرموێ (..وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ..). خۆ عەرەبی دەزانن‌و چاك دەزانن هۆیەكەی چییە خوشكەكانم.

ئاواز: كوا باسی مامەڵەو خریدو فرۆشو قەرز لەباسەكەدا؟

دڵپاك: سەرەتای یاسا قورئانییەكە خۆی باسی قەرزو گەواهیدانە بۆ ئەو پارستەیە، ئەمەش سەرەتاكەیەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ..).

گەواهییدان لە ئیسلامدا، لەهەموو ڕوویەكیەوە بۆ هێنانەدیو دامەزراندنو چەسپاندنو ڕەخساندنی حەقو پاراستنیەتی، بۆ نەهێشتنی جەورو ستەمە، هەتا مافی خاوەن ماف پێشێل نەكرێتو زەوت نەكرێت.

گەواهییدەریش ئەبێ موسڵمان و ژیرو پێگەیشتوو بێت، بەڵێ، ئافرەت و پیاوی موسڵمان زۆربەیان ئەو مەرجانەیان تێدا هەیەو ئیسلام بڕیاری لەسەر ئەوە داوە، بەڵام ئەی بۆچ دوو ئافرەت لەو مەسەلەیەدا واتە لەقەرزو مامەڵەدا جێگەی یەك پیاو ئەگرنەوە، ئەمەیان هۆی تایبەتی خۆی هەیەو خوا یار بێت ڕۆشنی ئەکەینەوە.

ئاواز: ئاخر نابێت هۆیەکەیمان پێ بڵێییت؟ نابێ بزانین چۆن؟

دڵپاك: بۆچ نا؟ مەبەست لەو بڕیارە، واتە لە حیکمەتی ئەو یاسا قورئانییە، هێشتنەوەو پاراستنی گەواهییەکەیە بە شێوەیەکی ڕاست و پاك و نەگۆڕ، ئیتر ئەو گەواهییە چ لەدژی تاوانبارکراو بێت یاخود بۆ بەرژەوەندیی تاوانبارکراو بێت.

جا وەك ئەزانین، ئافرەت بەسرووشت بەسۆزە، سۆزی هەمیشە قوڵ ئەدات، خێرا هەڵئەچێت، بەهۆی ئەوەوە لەوانەیە شتی لەبیر بچێتەوە، بەڵام ئەگەر دووان بن، ژیریی نایگرێت کە هەردووکیان ئەو ڕووداوەیان لەیەك کاتدا لەبیر بچێتەوە، ئەگەر یەکێکیان لەبیری چووەوە، ئەویتریان ئەیخاتەوە بیری (..أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى..).

خۆمان ئافرەتین و شارەزای چەند لایەنێکی سرووشتی ئافرەتین، جا بیهێننە بەرچاوتان، لەوانەیە ئەو کەسەی کە گەواهییەکەی بۆ ئەدرێت یان لەدژ ئەدرێت، ئافرەتێکی جوانی شۆخ و شەنگ بێ، بەهۆی ئەوەوە بەخیلیی و حەسادەت کاری خۆیان بکەنە سەر ئافرەتە گەواهییدەرەکە، یاخود ئەو کەسە گەنجێکی نێری جوان و پێ کەوتوو بێ، شارراوەکانی ئارەزوو یان دایکێتیی بەو گەنجە لەخەو ڕاپەڕن و وشیار ببنەوە، چەندان تر لەم جۆرە سۆزو تاسانە لە ناخی ئادەمیزاددا بەتایبەتی لەئافرەتاندا بەجۆشتر هەن، کە پاڵ بەگەواهییدەرەکەوە ئەنێن تا بەرەو لاربوونەوە چ بەهۆشیاریی و چ بەبێ ویست و دەسەڵات، بەڵام ئەگەر دووان بن زۆر کەم ڕوو ئەدات کە هەردووکیان لەسەر گۆڕینی ئەو گەواهییە ڕێکبکەون، بەڵکو یەکێکیان نیازی ئەویتریان دەرئەخات و ڕاستییەکە ون نابێت، هیچ زیانێك ناوەشتێتەوە .

سکاڵا: بەڵام هێشتا بەتەواویی لە مەبەست و ناوەڕۆکی باسەکە نەگەیشتووم.

دڵپاك: خوشکەکەم، لەم گەواهییدانەدا سووکیی یا بێ نرخیی یان هەست بریندارکردنی ئافرەت بەهیچ کلۆجێگ بەدی ناکرێت، بەڵکو سرووشتی ئافرەتی تێدا ڕەچاو کراوە، ئەوەتا یاسا قورئانییەکە هەر خۆی هۆیەکەی دەست نیشان کردووەو ئەڵێت: کە یەکێکیان لەبیری بچێتەوە ئەویتریان ئەیخاتەوە بیری (..أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى..). واتە: چارەی مەسەلەکە هەر بەئافرەت کراوەتەوە.

ئاواز: بۆچی ئەبێ ئافرەت لەبیری بچێتەوە، بەڵام پیاو لەبیری نەچێتەوە؟

دڵپاك: لەکۆمەڵگەی موسڵمانییدا کە ئەڵێن موسڵمانیی مەبەستمان هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگەیەیە. لەکاروباری مامەڵەکردندا داوا لەپیاو ئەکرێت بۆ گەواهییدان نەك ئافرەت، چونکە ئیشەکە زیاتر پەیوەندیی بە پیاوەوە هەیە، هی ئەوە، لە ئەستۆی ئەودایە، ئافرەت پێویست نییە لەسەری کار بکات و خۆی بهاوێژێتە دەریای ئابووریی پەرستییەوە، ئەگەر کار نەکات و خۆی خۆی نەژێنی لەبرسا دەمرێت و کەس نەبێت ئاوڕی لێ بداتەوە، بەو پێیە مەسەلەکە پەیوەندیی بەتایبەتمەندیی (اختصاص)ەوە هەیەو قەرزو مامەڵەو سەنەدکاریش تایبەتمەندیی پیاوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا.

بەڵام ئەو لایەنانەی کە تایبەتمەندن بەئافرەتەوە، شایەتی ئافرەت نەك هەر بەقەدەر پیاوێکە بەڵکو شایەتیی یەك ئافرەت زیاترە لە شایەتی گشت پیاوانی سەر زەویی، تەنانەت شایەتی لەهیچ پیاوێ، تا ئافرەت وەستا بێت وەرناگیرێت، بۆ نموونە: کچێك تاوانبار ئەکرێت بەتاوانی دڕانی پەردەی کچێتی، "غشاء البكارة"، بۆ دڵنیایی لەڕاستیی و ناڕاستی ئەو باسە، نیشانی پزیشکی ئافرەتی تایبەتیی ئەدرێت، شایەتیی ئەو پزیشکە ئافرەتە بەتەنیا، بەتەنیا بەڵگەنامە ئەژمێرێ و هەر ئەو گەواهییە وەرئەگیرێت، لەهیچ پیاوێك ئیتر گەواهیی وەرناگیرێت.

پیاوێك ئەمرێت، سامانێکی زۆری هەیەو هیچ منداڵی نییە، بەڵام ژنەکەی سکی پڕە، کاتی منداڵبوون منداڵەکە بەمردوویی لەسەر قۆناغە ئەبینرێ، لێرەدا تەنیا گەواهیی مامانەکە. کە ئەویش ئافرەتە. وەرئەگرێت، ئایا منداڵەکە کە لەسکی دایکی هاتە خوارەوە زیندوو بوو دوایی مرد یان بە مردوویی لێی هاتە دەرێ؟ لەحاڵەتی یەکەمدا، میراتی باوکەکە ئەبێ بەهی ئەو، جگە لە (یەك لەسەر هەشت)ی کە هی دایکەکەی ئەبێ، ئەمجا (یەك لەسەر سێ)ی بەشی منداڵەکەش دێتەوە بۆ دایکەکەی،

بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا، سامانی پیاوەکە (یەك لەسەر چوار)ی بۆ دایکەکە ئەبێ‌و ئەویتر هی میراتگرە، لێرەدا گەواهیی تەنیا لە مامانەکە وەرئەگیرێت، نەك پیاوان، ئایا ئیسلام ئافرەت بەنیوەی پیاو ئەژمێرێت؟

ئاواز: ئەی ئافرەت بۆچی پێویستی بە کارکردن نییە؟ نابێ بژی؟

دڵپاك: چونکە پێداویستییەکانی ژیانی ئەوان لەئەستۆی پیاودایە، ئەو کاری تایبەتی خۆی هەیە، کارکردنی وەك پیاو ئەبێتە کۆسپی ڕێگای کارەکەی خۆی، پێگەیاندن‌و پەروەردەکردنی بەنرخترین گەنجینەی دنیامان کە جگەرگۆشەکانن‌و پیاوان‌و ئافرەتانی دواڕۆژ ئەوانن لەئەستۆی ئافرەتدایە، ئایا ڕەوایە واز لەوە بێنێ لەپێناوی پارووپەك ناندا؟ ئای لەو دڵ‌و بارو شارستانییەت‌و پێشکەوتنەی کە ئەو ئەرکە پیرۆزە بەهیچ ئەزانن!!

مامەڵەو سەنەدکاریی‌و وردەکاری خریدو فرۆش پێویستی بە بیرکردنەوە، نەك سۆزو هەڵچوون هەیە، ئافرەتیش سۆزاوییەو لەبیرچوونەوە لێی ڕوو ئەدات، بەڵام پیاو بەسرووشت بیری بەسەر سۆزیدا زاڵترە، مەسەلەکە ئەوەیە نەك شتێکی تر، خوشکەکانم.

سکاڵا: های های! بێئاگایی ئێمە لە ئیسلام ئەوانی زاڵ کردووە بە سەرمانا!!

## هاوسانیی گەواهیی ئافرەت‌و پیاو

سکاڵا: یانی ئێستا ئەتوانین بڵێین: گەواهیی ئافرەت‌و پیاو جگە لە مەسەلەی قەرزو مامەڵەو سەنەدکارییدا هاوسانە، ڕاست نییە کە بگوترێت دوو ئافرەت ئەمجا پیاوێکیان پێوەیە؟

دڵپاك: بەڵێ، تێگەیشتنەکەت تەواوە، ئەوە بوو گوتمان بابەتەکە پەیوەندیی بەتایبەتمەندییەوە هەیە، دوو نموونەشمان هێنایەوە، جا با دووبارەی بکەمەوە کە گەواهییدان بۆ نەفەوتاندنی حەق‌و ڕاستییە، بۆ نەهێشتنی ستەم‌و ماف پێشێلکرنە، دەی خۆ چەندەها کارەسات و ڕووداوی جۆر بەجۆر لەئیشوکاری داراییدا، لەلایەنەکانی تری ژیاندا کتوپڕ ڕوو ئەدەن، وا ڕێکئەکەوێ لەو کاتەدا هیچ پیاوێك لەو ناوەدا نابێت، بەڵام ئافرەتێك یان چەند ئافرەتێك لەو کاتەدا ئامادەی ئەو ڕووداوو کارەساتە ئەبن‌و ئەیبینن، دەی جا ئەگەر گەواهیی لەو ئافرەتانە یان ئەو ئافرەتە وەرنەگیرێت، بێگومان ئەوە ئەبێتە هۆی ونبوونی حەق‌و جێ نەگرتنی، ئەبێتە هۆی شاردنەوەو فەرامۆشکرنی، تاوان‌و ستەم‌و خراپەکارییەك کە لێکۆڵینەوەی ئەنجامی نابێت بەزۆریی، لێ نەکۆڵینەوەشی دژ بەگیان‌و بەرنامەی پڕ لەدادگەریی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، ئەمە جگە لە هەندێ ئیشوکار کە هی ئافرەتەو گەواهیی تەنها لەو، نەك پیاو وەرئەگیرێت تیایاندا.

ئەوەی کە باسمان کرد هیچ ئایەتێك یان فەرموودەیەك نییە کە لە دژی بوەستێت‌و بەدرۆی بخاتەوە، هەروەها میهرەبانیی خواو وردبینی پێغەمبەرﷺ زۆر دوورن، لە گومکردنی حەقەوە، لە شاردنەوەی تاوان‌و هەموو کارێکی نابەجێوە، لەشێواندنی حاڵەتێکی شەرعییەوە، تەنها لەبەر ئەوەی کە ئافرەت تیایدا گەواهییدەر بێت، نا، ئافرەت لەئیسلامدا بەڕێزەو گەواهیشی نرخی خۆی هەیە. (ابن القیم) لە (اعلام الموقعین)، لە بەرگی یەکەمدا لەم مەسەلەیەی کۆڵیوەتەوە، تا گەیشتووەتە ئەوەی نووسیویەتی: "دەقە قورئانییەکان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺگەواهیی ئافرەت نابڕن بەسەر هەندێ کاروباردا بەبێ هەندێکی تر، بەڵکو گەواهیی ئافرەت لەهەموو ڕوویەکەوە ڕەوایە".

لەوەدا پشتی بە (..وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ..). هەروەها (يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ..). بەستووە.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەر دواندن "خطاب"ێك لەشێوەی کۆی نێردا (جمع المذکر)دا لە قورئاندا هاتبێ، مادام "قرینة"ی لەگەڵدا نەبێت نێرو مێ بە هاوسانیی‌و وەك یەك ئەگرێتەوە، هەروەها وشەی منکم "لێتان"، بانگەوازی خوا لە باوەڕداران "يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ"، لەنێوتانا "بینکم"، دیسان "منکم" لێتان، هەمووی ئاراستەی هەموو موسڵمانان کراون بەنێرو مێیانەوە، نەك بەتەنیا نێرەکانیان.

بەمجۆرە دیارە، ڕاستە کە ئەڵێن: دوو ئافرەت دوو گەواهیدەری تەواون لەو حاڵەتەدا کە باسکراون لە ئایەتەکانی دوو سوورەتی "الطلاق" و"المائدة"دا. دیسانەوە ئەگونجێت کە ڕستەی (وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ)[1] زیاد بکرێت بۆ باسەکەو بخرێتە پاڵ بەڵگەکانی ئیبن قەییم.

هەروەها لەیاسای ژمارە (٤)ی "النور"دا، (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء..) و ڕستەی (فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ)دا، لەوانەی پێشووشدا، وا ئەگەیەنێ ئەو شاهیدانەی کە خوا فەرمانیداوە بەسەریاندا تا گەواهیی بدەن، هەموویان گەواهیدەری بەسەرهاتو ڕووداوێکی کتوپڕیی نین، بەڵکو ئەوانەن کە داوای کردووە لێیان کە ئامادەبن و گەواهیی بدەن.

لەوەوە ئەگەینە ئەم ئەنجامە: لەئەنجامی باسو گیانی ئایەتەکانو ئەو ڕێسا قورئانییانەی کە بەهەموو شێوزاێك پلەی ئافرەتو پیاو، لەکاروباری کۆمەڵایەتییو ڕامیارییو ئابوورییو خوو ڕەوشتیو شیاوی تەواوییدا، ڕاگیر ئەکەن بەهاوسانیی، گەواهیی دوو ئافرەت لەگەڵ یەك پیاودا تەنها لەباسی قەرزدایە، ئەمەش نزمکردنەوەی پلەی ئافرەت نییە، نا یەکسانیی پیاوو ئافرەت ناگەیەنێت، بەڵکو هۆیەکانی ئەوانەبوون کە باسمان کردن نەك شتێکی تر.

خوشکەکانم کوفر چەندەها سەدەیە درۆو دەلەسە ئەتاشێت، تەڵە ئەنێتەوە، فڕو فێڵ ساز ئەکات، بۆ شێواندنی بیروڕای موسڵمانان، بۆ تەشویش خستنە سەر مێشکی ڕۆڵەکانیان، بۆ گومان ڕواندن لەدڵو دەروونیاندا سەبارەت بە ئایینەکەیان، چونکە زۆر چاك ئەزانێت ئاسانترینو سەرکەوتووترین ڕێگە بۆ زاڵ بوون بە سەریاندا دروستکردنی گومانە سەبارەت بەبیرو باوەڕیان بەئیسلام.

سکالا: باوەڕم بەقسەکانت زۆر بەهێزە، بەڵام خوشکە (دڵپاك) ئەی چی بکەین بۆ ئەوەی خۆمان نەدەین بەدەست کوفرەوە؟

دڵپاك: ئەبێ خۆمان چەکدار بکەین بەچەکی زانیارییو ڕۆشنبیریی، ئەبێ لەئایینەکەمان بە باشی تێبگەین، نەك هەروا بەسادەیی نوێژ بکەینو ڕۆژوو بگرینو ئیتر وا بزانین ئیسلام هەر ئەوەیە، پێویستە ئاگادارو وشیارو زیتەڵ بین، چەکمان باوەڕو زانیاریی بێت.

سکالا: ئۆخەی.. ئۆخەی! دڵم ئاوی خواردەوە، ئەمشەو تێر ئەخەوم، ئای (سەربەستو هەڵکەوت) ئاخۆ نەتان بینمەوە!!

ئاواز: تێلایەکیان بۆ ئامادە بکەو دەمیان کردەوە، بەدەمیاندا بکێشە.

دڵپاك: های.. های!! مامۆستا سکالا، تۆ ڕێگەی خۆت بگرە، سەربەست بە، گوێ مەدە بەو جۆرە قسانە، ئەوانە خۆیشیان لەخۆیان تێناگەن، نازانن کێ هاوردونیەتیە ئەم ژیانە، بۆچی هێنراون، ئەرکی سەرشانیان چییە، بۆ کوێ ئەڕۆنو ئەنجامیان بەچی ئەگات؟!، وا ئەزانن ژیان تەنها خواردنو خواردنەوەو خەوتنە، گوێیان مەدەرێ:

چەقەڵو گورگو سەگی سەرە ڕێ

با بقوولێنن، هەر با بوەڕێ

ئەزیەت ئەکێشن، کاروانی حەق

سڵ ناکاتەوە، ڕێی خۆی هەر ئەبڕێ

هەرچەندە شەوگار دوورو درێژ بێ

ڕۆشنایی ڕۆژگار جێگەی پێ لێژ بێ

شەو ئەبێ بڕواو ڕۆژ بیێتەوە

شەمشەمە کوێرەش چش نەڕۆی وێژ بێ[2]

سکالا: بەڵام حەز ئەکەم ئەو پەڕاوەم پێ بڵێیت کە ئەم باسەی تێدایە.

دڵپاك: ناوی "المرأة في القران والسنة"یە لە دانانی (محمد عزة دروزة).

---

[1] لەئایەتی (١٥)ی سورەتی (النساء).

[2] سروەی بێداری - چاپی یەکەم.

## لەلایەنی هەستیدا نەك جەوهەریدا

سکالاً: مامۆستا دڵپاك، پێریّ‌و دوێنیّ شەو، لەماڵی خۆمان زۆربەی ئەو باسانەم کە بۆت کردووین، بۆ دایکم‌و باوکم‌و براو خوشکەکانم گێرانەوە، دایکم‌و باوکم گەلێ دڵخۆش‌و شادوومان بوون، بەو هۆیەوەشە سەلامیان بەگەرم‌و گوڕی پێ سپاردم بۆت، بەلاّم سەربەستی برام ترش‌و تاڵ وەرگەڕاو زۆری پێگران بوو، تەنانەت ئارەقی وەڕسیی‌و پەستی لەنێو چاوی ئەچووڕایە خوارەوەو پەیتا پەیتاش ڕەخنەی ئەهێنایە کایەوە.

دڵپاك: سەلام بۆ ئەوان‌و بۆ تۆش، خوا پاداشتیان بداتەوە، بەلاّم ئەی سەربەست ڕەخنەی بەرامبەر کێ هەبوو؟ من یان تۆ؟

سکالاً: بەرامبەرئیسلام، نەك من یان تۆ، ئەیگوت: نەبڕایەوە؟ باسی ئیسلام هێشتا هەر ماوە؟ ئەو ئیسلامەی کە ئافرەت ئەتاسێنیّ، ناهێڵێ سەر دەربێنیّ، چۆن ئێوەی ئافرەت لەڕووتان دێ باسی ئیسلام بکەن؟

ئاواز: جا تۆ ئەو باسەت بۆ چی گەیاندەوە ماڵ سکالاً؟ بۆچی نایبڕیتەوە؟

سکالاً: بۆچی بیبڕمەوە؟ بۆچی تیایە نەیگەنمە ماڵەوە؟ چی تیایە؟

دڵپاك: گرنگ نییە، سەربەست سەربەستە، بەلاّم ئایا ڕەخنەکانی ژیریی‌و ویژدانی زیندوو پەسەندیان ئەکەن؟ئایا سەرەکیی‌و بەجێن؟ تۆ خۆت بەڕاستیان ئەزانی؟

سکالاً: تاڕاددەیەکی زۆر بەلێ، ئەتوانم بڵێم ڕاستن‌و لایەنی واقیعییەتیان تێدایە، سەربەستیش بەباسێکی دوورو درێژ توانی قایلم بکات.

دڵپاك: ئەکرێت یەکێك لە ڕەخنەکانی سەربەست بخەیتە ڕوو؟

سکالاً: بۆچی ناتوانم؟ تەبعەن، تەبعەن ئەکرێت، یەکێك لەوانە لە قورئاندا نووسراوە (وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَة..). باشە، ئەبێ پیاو لە بەرچی پلەیەکی بەسەر ئافرەتدا هەبێت؟ ئەو پلەیە بۆچی زیاد بێت؟

دڵپاك: چاوەکەم ، ئادەمیزاد نابێت ئەوەندەش سادەو خۆش باوەڕ بێت، جاریّ هەر لە نیشاندانی یاسا قورئانییەکەدا گزیکارییەك کراوە، ئیتر بەهۆی نەزانییەوە بێت یان بە ئەنقەست، ئەوەیان نازانم، چونکە مەبەستە سەرەکییەکە قرتێنراوە، یاسا قورئانییەکە ژمارە (٢٢٨)ی سورەتی (البقرة)یەو بەشێکی بەم شێوەیە (..وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكُيم).

خوشکە سکالاً، چێشتکەری لێزان‌و بەسەلیقە بەو جۆرە سەرو قنگی بامیە ناکات! لەبەرو دواوە ئایەتەکەی قرتاندووەو نیشانی تۆی نەشارەزای داوە، ئەمەش وا نەبێت کاری (سەربەست) خۆی بێت، نەخێر، سەر بەستیش نەشارەزاو بەسەزمانە، وەهایان پێگوتووەو فێریان کردووە، هەرگیز لێی ناگرم، ئەو تەنها گوتنەوەی لەسەرە، ناحەزانی ئایینی خوا زۆرو هەمەجۆرن، ڕێگەو شێوازی هەڵخەڵەتاندن‌و تەفرەدانیان زۆرو هەمەجۆرو ئاڵۆزە، هەموو کەسێك پەییان پێنابات.

ئێمە لەسەرەتادا باسی ئەوەمان کرد کە ئیسلام ئافرەت بەنیوەی کۆمەڵ‌و دایکی نیوەکەی تری دائەنێت‌و باسی ئەوەشمان کرد کە ئافرەت‌و پیاو لە یەك دەروون "النفس" خوڵقاون، با نەگەڕێینەوە سەری‌و دیسان درێژەی پێنەدەینەوە، چونکە شتەکە ئاشکراو دیارە.

ئەو یاسا قورئانییە، ئەوە ناگەیەنێت، کە ئافرەت لە پیاو، لەڕووی مافەوە جیا بکاتەوەو مافەکانی پلەیەك لەهی پیاو لەخوارەوە، وەك (سەربەست) بەدوورو درێژیی بۆ تۆی باسکردووە، بەڵکو ئەوە لە هەندێ ڕووی ترەوەیە، وەك: تەلاّق بەدەستبوون، ژنهێنان، پەیداکردن "الکسب"و خەرجکردن، پاراستنی گیان‌و سامان‌و ئابڕوو، وەك سەروکارییکردنی خێزان، کە هەموویان بەپلەی یەکەم ئەکەونە سەر شانی پیاوو ئەبێ بەزۆریی لەئەستۆی ئەودا بن نەك ئافرەت.

ئاواز: دەی بۆچی ئەبێ ئەوشتانە لەئەستۆی پیاودا بن، نەك ئافرەت؟

دڵپاك: ئەی بۆچی پزیشکەوانی‌و پزیشکیی کردن لەئەستۆی پزیشکدا بن، نەك ئەندازیار؟

ئاواز: ئاخر ئەوە پەیوەندیی بەتایبەتمەندییەوە هەیەو ئەبێ وابێ.

دڵپاك: دەی ئەویتریش هەروەهایەو هەمان سیفەتی هەیە، لە سپاردنی ئەوکارانەدا بەپیاو مەبەست ئەوە نییە کە کان "معدن"ی پیاو پلەیەك لەهی ئافرەت بەرزترە، چونکە کانی هەردوو لایان یەك دەروونە، بەڵام وەك ئەزانین پیاو بە سرووشت لەشی، ژیریی، بیری، لە هی ئافرەت بەهێزترە، پیاو لە ئافرەت ئازاو لێهاتووترە.

ئاواز: ئەوە ڕاست نییەو هەرگیز پیاو لە ئافرەت ئازاتر نییە.

دڵپاك: وەك گوتراوە "تاقیکردنەوە چاکترین سەلماندنە". جا فەرموو، تۆ کیژێکی باڵابەرزو بەژن تەواویت، لەو پەڕی هێزو توانای گەنجێتیدایت، مامە قالەیش کە فەڕاشمانە، مووی ڕەش بەسەرو سمێڵو ڕیشیەوە نەماوە، دەی فەرموو زۆرانێك بگرن، هەتا بۆت دەرکەوێ "عەلی کوڕی کێیە؟!" ئەیگریت؟

سکاڵا: بابچم بانگی کەم، تاقیکردنەوە چاکترین سەلماندنە.

دڵپاك: لەقورئاندا هەرکە ئەو پلەیە بەر چاوت بکەوێت، یان هەر ڕستەو بێژەیەك لەو جۆرە بێت، ئەوە تایبەتییە بە لایەنی حسییەوە یاخۆ هەستییەوە، بەلای جەوهەردا ناڕوات، بەڵکو لە جیاوازیی نێوان ئەندامەکانی ئافرەتو پیاوەوە هاتووەو لەسەر بنەڕەتی "تفرقة عضوية" بنیات نراوە، نەك لەسەر بنەڕەتو پەرگەماو جەوهەریان، ئەوەشتان با پێ بڵێم: بەگشتیی چاکییو پلە بەرزیی لەئیسلامدا یەك بنەڕەتی هەیە، ئەویش لەخواترسانە (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُم).

سکاڵا خان، سەربەست بیری لەوە نەکردۆتەوە کە لەهەموو نەتەوەیەکدا، لەهەموو چەرخێکدا کە پیاوو ئافرەت لەڕووی تواناو لێهاتنەوە، لەهەموو کارە ئادەمییەکان "الاعمال الانسانية"دا بەگشتی جیاوازییان هەیە، تەنانەت لەو کارانەشدا کە ملیۆنەها ساڵە ئافرەتان پێیان هەڵساون، یا بڵێین تایبەتیی ئافرەت بووە، کەچی ماوەیەك پیاو دەست ئەداتە ئەو کارانە، لەئافرەت پێشکەوتووتر ئەبێت تیایاندا، لەوانەیە بپرسین ئەو کارانە وەك چیی؟ منیش لەوەڵامدا ئەڵێم: وەك جلوبەرگ دوورین، چێشت لێنان، گریان بەسەر مردوودا، سەماکردن، گۆرانی وتنو چەندان شتی تر.

ئاواز: ئەو کارانە پیاوان سەپاندوویانن بەسەر ئافرەتدا، ئافرەت لەژێر پاڵەپەستۆی پیاودا لەکارەکانی تر کە هی پیاون دوور کەوتۆتەوە، پیاو هەموو دەمێ دەستی بەسەر ئافرەتدا ڕۆشتووەو توانیویەتی بیخاتە ژێر باری داواو ئارەزوورکانییەوە.

دڵپاك: ئای لەو قسەیەجا خۆ بەدەمی خۆت سەلماندت کە پیاو لەئافرەت ئازاتر بووە، لێزانو ژیرو لێهاتووتر بووە، جا ئەگەر وانەبووە ئەی چۆن پیاوان هەموو دەمێ توانیویانە ئافرەتان بخەنە ژێر باری داواو ئارەزووەکانیانەوە؟ ئەگەر تۆ لە من لێهاتووتر نەبیت، چۆن ئەتوانی زاڵ بیت بەسەرما؟ بیری لێبکەنەوە.

سکاڵا: بەخوا ڕاستە.. ڕاستە!! ئەیهاوار لەمن ئەوە بۆچی خۆم ناتوانم بەو جۆرە وەڵامانە وەڵام بدەمەوە، بەڵام ئەبێ فێرببمو بزانم.

## سەرپەرشتیاریکردن

سکاڵا: باشە، مامۆستا دڵپاك، ئەی سەروکاریی کردنی ماڵ، بۆچی دراوەتە دەست پیاو؟ بۆچی بەئافرەت نەسپێررێت؟

ئاواز: ئەی ئافرەتیش وەکو پیاو ئادەمیزاد نییە؟ بۆچی..؟

دڵپاك: ئەو ڕستەیەتان "ئەی ئافرەت ئادەمیزاد نییە؟" زۆر زۆر دووبارە ئەکەنەوە، ئەوەش جگە لە ڕقو نەزانییو دەمارگیریی بەولاوە هیچی تر نابەخشێت، ئادەی لەشوێنێکی قورئاندا، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺبۆم بدۆزنەوە، یان بۆتان بدۆزنەوە، ئەوە بگەیەنێت کە ئدان نەنێت بەمرۆڤایەتیی ئافرەتدا، با بەس بێت.

ئەو مەسەلەیە لە قورئاندا بەناوی سەرپەرشتیاریکردن، یان سەروکاریی کردن ناوبراوە، یاسا قورئانییەکە هەر خۆی هۆیەکەی دەرخستووە (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ..).

سەرپەرشتیاریی، حاکمیی کردن، شوانیی، یان بڵێین سەرۆکایەتی کردن، لە هەموو ڕێکخراوێکی پاكو سەرکەوتوو و خاوەن ئامانجدا کارێکی زۆر پێویستە، باوەڕ ناکەم ئادەمیزاد بتوانێ دەستبەرداری ببێت.

سکالاَ: بەڵێ، ئەوە زۆر ڕاستەو کەس ناتوانێ ددانی پیادا نەنێت.

دڵپاك: دەی خۆ ژیانی هاوسەرێتیی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە، بەژن و مێرد خێزان بنیاد ئەنرێ، خێزانیش کۆمەڵگەیەکی بچووکەو بنەڕەتی کۆمەڵگەیە، ئەی نابێت سەرۆکێکی هەبێت؟ ئایا کۆمەڵگە چ گەورە یان بچووك بەبێ سەرکردە ئەیکرێت؟ خێزانیش وەك کۆمەڵگە کەسەکانی بیروڕاو حەزی جیاوازیان هەیە، هەموویان وەك یەك نابن، لەوانەیە ئەو جیاوازییە، لەو ڕووەوە ببێتە هۆی تێکچوون و دووبەرەکیی ئەگەر سەرپەرشتیارێك نەبێت.

ئینجا بۆ پاراستنی ئەو کۆمەڵە یان ئەو خێزانە، بۆ هێشتنەوەی هێزو یەکیەتی هەریەکەیان، سەرۆکێك پێویستە، سەرپەرشتیارێك پێویستە کە چارەسەری گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەکان بکات، کە لەکاتی ناکۆکییدا ئەندامەکانی خێزان یان کۆمەڵگە ڕووی تێبکەن و یەکێیەتیی و پێکەوە گونجانیان بپارێزێ: ئێمە لەباسەکەماندا زیاتر خێزانمان مەبەستە، بەشی زۆری زانایانی لقە جۆر بەجۆرەکانی زانیاریی . گەر نەڵێین هەموویان . ئەو سیفەتانە لەپیاودا بەدی ئەکەن نەك لەئافرەتداو پیاو ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ چاکترە لەوەی ئافرەت بیگرێتە ئەستۆ.

ئاواز: بۆچ ئەو سیفەتانە لەپیاودا بەدی ئەکەن نەك لەئافرەتدا؟

دڵپاك: ئاوازخان، منیش لەتۆ ئەپرسم، بۆچی سیفەتی ڕەقی لەبەردو ئاسنا بەدی ئەکرێت نەك لەئاوو شیردا؟ بۆچی سیفەتی شیرینی لە شەکردا بەدی ئەکرێت نەك لە خوێ و تەماتەدا؟

ئاواز: های!! دەی شتەکە خۆی وایە، هەر بەسرووشت خۆی وایە.

دڵپاك: دەی ئەویش وایە. ئەی باسمان نەکرد کە مێژوو و واقیع گەواهیی ئەدەن لەسەر ئەوەی کە پیاو لەڕووی بەرژەوەندیی خێزانەوە، لە ئافرەت زاناترە؟ ئەوە شتێکی سەلمێنراوە خوشکە گیان، خۆ سامان و دارایی و پێداویستییەکانی خێزان وەك باسمان کردن، لە ئیسلامدا ئەرکی سەرشانی پیاوە نەك ئافرەت. ئەوەش خێرو چاکەی ئافرەتی تێدایە نەك شەڕو بێرەکوڵە، خانمیی بەئافرەت ئەبەخشێ، جا ئەگەر وەها بێت دژایەتیی و لێکتردان لەنێوان هیچ کامیاندا پەیدا نابێت، نابێتە مایەی فەوتاندنی مافی ئافرەت و بەرەڵاکردنی بەدوای پارووەیەك ناندا.

سکالاَ: ڕاستەو هەموویشی جوانە، ئێستا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە خێزان ئەبێ سەرۆکێکی هەبێت، بۆ سەرپەرشتی کردنی منداڵەکانی، دەستکەوتەکانی، خەرج بۆ کردنی، ڕاستکردنەوەی هەر چەوتییەك کە ڕوو ئەدات تیایدا، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هاوبەشیی "شرکة"یە کە لەنێوان ژن و مێرددایە، بۆ چارەسەرکردنی هەموو گیروگرفتەکانیان.

ئەوەش ئەزانم کە نەبوونی ئەو سەرۆکە ئەبێتە هۆی دروستبوونی ئاژاوە، لەئەنجامدا ئەو خێزانە، یان ئەو ڕێکخراوە بەرەو کاولیی و وێرانی ئەچێت، ئەی چی تیایە ئەگەر هەردووکیان ئەو سەرپەرشتییە یان سەرۆکایەتییە بگرنە دەست؟ ئایا چاکتر نییە؟

دڵپاك: سێ ڕێگامان بۆ ئەو مەبەستە لەبەر دەستایە: پیاو سەرۆك بێ، ئافرەت سەرۆك بێ، هەردوکیان پێکەوە سەرۆك بن.

ڕێگای سێیەم: کە تۆ پرسیارت دەربارەی کرد، تاقیکاریی زۆر چاك دەریخستووەو سەلماندوویەتی کە بوونی دوو سەرۆك لەیەك کاتداو لەیەك شوێنداو لەیەك کاردا، لەوە خراپترە کە سەرۆك هەر نەبێت، چونکە هەمیشە خراپکاریی و دژایەتیی و دوو بەرەکیی بەدەمەوەیە، خوای گەورە ئەفەرموێ، ئەگەر ئاسمان و زەویی دوو خوا یان زیاتریان هەبووایە ئەشێوان" (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا). ئەمە سەبارەت بەئاسمان و زەویی بەو فراوانییە! هەروەها سەبارەت بەنێوان خواکان!، جا فەرموو لەسنووری تەسکی خێزانێکداو دوو سەرۆك کە بنیادەم بن، بەراورد بکە، ئەبێ گوزەران چۆن بێ؟

هەر لەم ڕووەوە زانیاری دەروون "علم النفس"یش ئەڵێت: "ئەو منداڵانەی کە لە سایەی دایك و باوکێکی نێوان ناکۆکدا لەسەر سەرۆکایەتیی گرتنە دەست پەروەردە ئەبن، سۆزیان شێواو ئەبێت، لە دەروونیانا گرێ و ئاژاوە زۆر ئەبێت".

واتە بوونی دوو سەرۆك لەیەك خێزاندا نەشیاوە، تەنانەت لەناو کوردەواریی خۆماندا باوەو بووە بەپەندو ئەگوترێت: "تۆ من بیت و منیش هەر من بم ،ئەی کێ نێوەی من بێ؟". یاخو وەك ئەڵێت: "وێران بێ دەرەناخێ، چوار ماڵەو هەشت ئاغێ".

ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت لەماڵدا هیچ بەدەستە، نەخێر، پرسی پێئەکرێ‌و ڕای وەرئەگیرێ، قسەی ڕەواجی هەیە، گەلێ جار ئەو سەرۆك ئەبێ‌و سەرپەرشتیاریی ئەگرێتە دەست، یارمەتیدەری یەکەمی سەرۆکی ماڵە، لەوەش گرنگتر بەهەشت لەژێر پێی ئەوایە.

خوشکەکانم، ڕەنگە بەهەڵەدا نەچم ئەگەر بڵێم: گرنگترین هۆی مانەوەی ئافرەتە خوێندەوارەکان بەعازەبیی، یان کەمیی داواکردنیان لەلایەن پیاوانەوە، کە بۆتە هۆی شوونەکردنیان‌و مانەوەیان بەبێ شوو لەگیروگرفتی سەرۆکایەتیی‌و سەرپەرشتییکردندا خۆی مات داوە.

کابرا ئەڵێت: بۆچ بۆ ژنێ بگەڕێم کە خۆی بەمێرد، نەك بەژن دابنێ؟ ئەو مێردو من مێرد ئەی کێ ژن بێ؟

سکاڵا: مەردی خوابە دڵپاك، مەمان ترسێنە. ئەڵێی پیرەژنی سەد ساڵەی لە قسەی زلدا، ئەم باس‌و بابەتانە چۆن فێربوویت؟

دڵپاك: ناتان ترسێنم، بەڵکو وەك خوشکێکی خۆتان ئامۆژگاریتان ئەکەم، ڕێگاتان نیشان ئەدەم، کە ئەشترسن ئەبێ بپرسن.

ئاواز: ئەی ئەوە نییە بە بەردەوامیی ئەپرسین لێت؟

## دوو ڕێگاکەی تر

سکاڵا: بەڵام خوشکە دڵپاك، دوو ڕێگاکەی تری سەرپەرشتیارییکردنت باس نەکرد.

دڵپاك: لەبیرم نەچووبوونەوە، با ئێستاش لەخۆمان بپرسین، ئافرەت‌و پیاو بە پێی سۆزو بیر کامیان شایستە ترن بۆ سەرپەرشتیی کردن؟ ئایا ئەو کارە زیاتر پێویستی بە بیر، یان بەسۆز هەیە؟

کە ئەیدەینە بەر تیشکی ژیریی‌و لێی ئەکۆڵینەوە، زانیاریی‌و تاقیکاریی ژیان ئەسەلمێنن بۆمان کە کاروباری ڕێکو پێك بەبیر ئەبرێت بەڕێوە، نەك بەسۆز، تەنانەت هەندێ جار سۆز ئەیەوێ ڕێگە بە بیر بگرێت‌و چەواشەی بکات‌و ڕاستیی لێ تێك بدات.

ئاواز: مەرج نییە ئەو بۆچوونە ڕاست بێت، کێ ئەڵێ ڕاستە؟

دڵپاك: خوشکە ئاواز، ڕۆژێ لەڕۆژان ئەچی بۆ شوێنێك، لە ڕێگادا ئەبینی کابرایەك، کابرایەکی تر بەشەق‌و شەقەزللە داگرتۆتەوەو هەموو لایەکی سەروگوێلاکی کردووە بەخوێن، کابرای سەرو گوێلاك خوێناوی لێی ئەپاڕێتەوە، بەڵام ئەویتر وازی لێ ناهێنێ‌و هەر لێی ئەدات، باشە ئەگەر تۆ لەو کاتەدا دەسەڵاتت ببێت چی ئەکەی؟

ئاواز: ئەگەر هەقپەرست بم ئەبێ ئەم ستەمکارەیان چی کردووە لەوی تر منیش وەها بکەم لەمی ترو سەرو گوێلاکی بێنمە خوێن.

دڵپاك: دەی ئەوە پێی ناگوترێت هەقپەرستی، کتومت سۆزپەرستییە، ئەوە کاری سۆزە نەك بیر، بیر ئەتوانێ هەق بدۆزێتەوە نەك سۆز، ئەها ئەوەتا سۆزت باڵی زاڵبوونی کێشا بەسەر بیرتاو چەواشەی کرد.

ئاواز: چۆن.. چۆن؟ تۆ ئەتەوێ ڕێگەم لێ بگریت، چۆن؟!

دڵپاك: خوشکی خوێندەوار، کێ ئەڵێ کابرای لێدراو تاوانێکی زۆر گەورەی نەکردووەو شایەنی خنکاندن نییە؟ کێ ئەڵێت کەسێکی کابراکەی تری نەکوشتووە، یان دزی لێ نەکردووە، یان دەستدرێژی نەکردۆتە سەر ئابڕووی؟ کێ ئەڵێ پردێکی نەڕووخاندووە، شەمەندەفەرمێکی وەرنەگێڕاوە.. هتد؟

لەوەدا من سەرزەنشتی تۆ ناکەم کە بەزەییت بەکابرای لێدراودا دێتەوە، بەزەیی‌و سۆزت بۆی ئەجووڵێن، چونکە ئەو سیفەتانە بەشێکن لەبوون "کیان"ی ئافرەت، ئەوە ڕەسەنیی تۆ لە مێیەتییدا نیشان دەدات نەك شتێکی تر، بەڵام پیاو لە ڕووی سۆزو بەزەییەوە ناگات بە ئافرەت، ئەوە ڕەسنیی تۆ لەمێیەتیدا نیشان ئەدات نەك شتێکی تر، بەڵام پیاو لەڕووی

سۆزو بەزەییەوە ناگات بەئافرەت، بیری بەسەر سۆزی، بەسەر بەزەییدا زاڵترە، بەهۆی چییەوە؟ چونکە بەسرووشت وەهایە، بەهۆی زۆرانبازییەوە لەگەڵ کارەسات و زەحمەتا ژیان ئامادەی کردووە کە بتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەمارەکانیدا ڕاگیر بکات، زوو هەڵنەچێ، بەخێرایی بیری لەدەست نەدات، ئەمەش وای لە پیاو کردووە کە لە شیاوییدا جێگەی متمانەو پشت پێبەستن بێت بۆ سەرۆکایەتی خێزان.

با چاویش نەقوچێنین، هەر لەژیانی ڕۆژانەماندا ئەبینین و ئەبیستین، کە هەندێ ئافرەت ڕێزی مێردەکەی ناگرێت، ڕقی ئەبێتەوە لێی، بەسووك و بێ نرخی ئەزانێ، کە لەئافرەتەکە ئەپرسی بۆچی وا؟ یان لەشتەکە ئەکۆڵیتەوە، بۆت دەرئەکەوێ کە مێردەکەی کەسایەتیی "شخصیية"ی لاوازە، هۆی ئەوەش تەنها ئەوەیە مێردەکەی نەیزانیوە، یان نەیتوانیوە سەرۆکایەتییەکە باش بەرێت بەڕێوە، ملی شۆڕ کردووە بۆ هەموو ڕاوێژو تەگبیرێکی ژنەکەی، بەهەر بارێکدا هەوەسی بوو بێت هەڵی سووڕاندووە.

لەوەش زیاتر، دەرکەوتووەو ئاشکرایشە، تەنانەت ئەو ئافرەتانەی کە زۆر حەزیان لەو سەرۆکایەتییەیە لەسەرەتای شووکردنیانەوە، لەوکاتەدا کە هێشتا سەریان سووکە، منداڵیان نەبووە، ئیشوکاری ناوماڵ و منداڵ پەروەردەکردن نەیپەشۆکاندوون و دەمارەکانیان حەساوەن، کاتێ کە ئەو کارانە یەخەیان ئەگرن، هەر خۆیان بەبێ ئەوەی مێردەکانیان لێیان بپارێنەوە، واز لەو سەرۆکایەتییە ئەهێنن، پشتیی تێ ئەکەن، چونکە مێشکیان توانای ئەوەی نامێنێ، ئیتر حەزیشیان لێی نامێنێ، جا ئێستا من لەئێوە ئەپرسم، ئافرەت و پیاو کامیان بەشایستەتر ئەزانن بۆ سەرۆکایەتییکردنی خێزان؟

سکالاْ: بەو پەڕی قایلبوونەوە دانی پێدا ئەنێم کە پیاو شایستەترە.

ئاواز: دیارە ئەگەر کاری پیاو دەرەوەی ماڵ و هی ئافرەت ناوەوەی ماڵ بێت، پیاو شیاوترە، بەڵام ئافرەتیش شتێکی هەر لێ ئەزانێ و لێی دێت.

دڵپاك: دەی وا نەبێت ئیسلام ئەو شتەی فەرامۆش کردبێت، بگرە بەوپەڕی جوانیی ڕەچاوی کردووە، بەبێ ئەرك و بەرپرسیاریی نەیهێشتۆتەوە، ئەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته.. المرأة راعية في بيت زوجها". واتە ئافرەت بەرپرسیارە لە بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیا لە ماڵی مێردەکەیا، ئەوەش ئەرکێکی کەم و سووك نییە.

سکالاْ: ئاواز، هەرچییەك ئەڵێین، وەك تفەنگ لەتاریکەشەو بتەقێنین وایە.

## سرووشت ئافرەتی وا خەملاندووە

ئاواز: ئاه، قایلت کردم کە پیاو لەئافرەت، لە سەروکاریکردنی ماڵ و خێزاندا شیاوترە، بەڵام ئەبێ بۆچی ئافرەت لەو شکۆیە بێبەش بێت؟!

دڵپاك: ئەم حاڵەتە دەروونییەی تۆم بەلاوە هیچ سەیر نییە، بەڵێ، ئەو هەڵەیەی کە لەمێشکی ئادەمیزاددا ڕەگو ڕیشە دائەکوتێ، هەڵکێشان یان نەهێشتنی کاریگەرییەکەی، لەبیرچوونەوەی شتێکی سووك و ئاسان نییە، بەڵکو کارێکی قورس و گرانە.

خوشکەکەم، گوتمان ئافرەت لەو ئەرکە، کە تۆ بەشەرەف و شکۆ ناوی ئەبەیت و ئاخی بۆ هەڵئەکێشی، بێبەش نەکراوە، بەشی خۆی، بگرە بەزیادیشەوە بەرپرسیاری پێسپێردراوە، ئەگەر هەر ئەتەوێ سەهەندەیی و ملەجیڕێ بکەیت، ئەبێ بڵێیت: خوا بۆچی ئافرەتی وەهاو پیاوی وەها خەلق کردووە؟ ئەبێ لە سەراپای بوون هەمان هەڵوێستت هەبێ، ئەبێ بپرسیت: (بەرد بۆچی ڕەق و ئاو بۆچی نەرمە؟ شەو بۆچی تاریك و ڕۆژ ڕۆشنە؟ هاوین بۆچ گەرمو زستان ساردە؟) لەم جۆرە پرسیارانە کە لە ژمارە نایەن و ئادەمیزادی ژیریش ئەو پرسیارانە ناکات.

سکالاْ: ئاخر ئەگەر بەرد ڕق و ئاو نەرم نەبێت، نە بەرد بەردەو نە ئاویش ئاو، هەروەها ئەوانەی تریش کە باست کردن، ئەبێ وابن.

ئاواز: ئەوە زۆر ڕاستە، دەی ئەگەر ئافرەتیش سۆزاویی‌و پیاویش بیرتیژ نەبێت، خێزان لەوانەیە ئەو شێوە جوانە سرووشتییەی کە هەیەتی وەرنەگرێت، سرووست ئافرەتی وا خەملاندووە کە بکەوێتە خوێن "حیض"ەوە، بێزوو بکات، سکی پڕ بێت، منالّی ببێت، شیر بدات، بەسۆز بێت، شەوان هەڵسێتەوە بەدەم گریانی منالّەکەیەوە، ئەمیش بە ئەو ژێر ببێتەوە، چونکە مەمەی ئەداتێ‌و پیاو نییەتی، بە دەنگە نەرم‌و ناسکەکەی لایە لایەی بۆ بکات‌و بیکاتە خەو، نەرم‌و نیان بێ لەگەڵیا، لەباوک دڵ ناسکتر بێت بەرامبەری، لەگەڵیا گڕوگاڵ بکات‌و زۆر جار لەبەر دڵنەوایی منالّەکەی وەك ئەو قسە بکات، بڤڤە، کغغە، جزژە.. هتد، لە پەروەدەدا بالاترین دەستی هەبێ، ئەم سیفەتانە لەزۆربەی ئافرەتدا هەن، خۆ لە هەرکامیاندا نەبێت بەناوێزە ئەدرێتە قەڵەم، کەچی لەپیاودا نین! ئایا ئەکرێت پیاوان ئاهی ساردو پڕ لە دووکەڵ هەڵکێشن، چونکە لەم شەرەف‌و شکۆیانە بێبەش کراون؟

ئەگەر ئاخیش هەڵکێشن ئایا هەڵە نین؟ نەزان نین؟! هەروەها دڵرەقیی، بازوو بەهێزیی، لێهاتن، چاونەترسیی، کۆڵنەدان، ماندوو نەبوون، گورج‌و گۆڵیی، بیرتیژی، بەردەوامیی لەکاردا، تێکۆشانی بێ وچان، بەرگەگرتنی سەرماو گەرماو ئێش‌و ئازار، ئارامگرتن لەهەموو حاڵەتێکدا، فراوانی تاقیکاریی، سنگفراوانیی، ڕاوێژکاری.. هتد. ئەمانە لەپیاودا یان لەئافرەتدا بەگشتیی هەن؟

ئاواز: لەبەر ئەوەی کە ناوی "گشتیی"ت برد، بێگومان لەپیاودا.

دڵپاك: دەی چاوەکەم، چاك بزانن، من، ئێوە، هەر پیاوێك، یان هەر ئافرەتێك بەپێچەوانەی کایەو بواری سرووشتیی خۆی بجووڵێتەوە، بێگومان ئەیەوێ یاسای سرووشتیی هەڵوەشێنێتەوە، ئەوەش وەك ئاسن پانکردنەوە بە سەر وەهایە، (وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً). هەر لەبەرئەوەشە کە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لەو ئافرەتانە کە خۆیان ئەشوبهێنن بەپیاو، لەو پیاوانەی کە خۆیان ئەشوبهێنن بەئافرەت کردووە، دەی باهۆشێك بکەینەوە، ڕاستیی لەهەموو شتێك بەرزترە، دڵنیام ئەگەر ئافرەتان هەق ویست بن‌و بیانەوێ لەڕاستی بگەن‌و بە وردی لە مەسەلەکە بکۆڵنەوە، ئەو گومانانەی کە لە مێشك‌و دڵیاندا، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن رویێنراون، ئەو گومانانە ئەدەنە بەر شەق‌و لەقەو پێشێلیان ئەکەن، کەوتنە خوێنەوە، بێزوو کردن، سکپڕبوون، منالّ بوون‌و زەیستانی، پەشۆکان بەمنالّ پەروەردە کردنەوە، سۆزو هەست نەرمیی، ئافرەت وەها سست‌و بێهێز ئەکەن، کە نەتوانێ بجەنگێ لەگەڵ دوژمنا لەکاتی جەنگا، نەتوانێ سامان‌و گیان‌و ئابڕوو لەدوژمنان بپارێزێ، نەتوانێ پارێزگاری گەل‌و نەتەوەو نیشتمان بکات لەکاتی مەترسییدا.

ئەو کارانەو چەندەها کاری تری گران وەك: نان پەیداکردن، پۆشاك پەیداکردن بۆ خێزان، چارەسەرکردنی گیروگرفت‌و دەردەکانی تری ناو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگەو خێزان، هەموویان وان بەسەر شانی پیاوەوە، کە ئەرکەکانی ئافرەت بەگوێرەی هینەکانی سەرشانی پیاو زۆر کەمن، کەچی هێشتا ئافرەتان بۆڵە بۆڵ ئەکەن بەسەر پیاواندا: "ئای مردم، مردم بەدەست ئەرکەوە!". خۆ ئەگەر ئەو ئەرکانەی پیاو هی ئافرەت بوونایە لەوانەیە نیوەی پیاوانی گێتیی، بە برسێتیی‌و ڕووتەڵ‌و سك قوپاو ژینیان ببردایەتە سەر، بۆچی ڕاست نەڕۆین ئێمەی ئافرەت؟

سکالا: کچە بەخوا ڕاست ئەکەی. بەڵام، وەی.. وەی.. وەی! دڵپاك، نازانم بۆچ ئەوەندە بەرگری لە پیاوان ئەکەیت؟ خۆزگە پیاو ئەبووم‌و ئەبوویتە هاوسەرم، ئای کە ئەحەسامەوە!

دڵپاك: من بەرگریی لەپیاوان ناکەم، ئیسلام فێری کردووم بەرگریی لە حەق بکەم.

ئاواز: سەرم سوڕئەمێنێ لەوەی کە وشەی سرووشت بەکار ئەهێنی، چونکە موسڵمانان بەکارهێنانی ئەو وشە بەحەرام ئەژمێرن!

دڵپاك: بۆچی خانم، تۆ سرووشت بەچی ئەزانی؟ تۆ بەهەڵە تێگەیەنراویت، ئێوەمانان ئەو وشەیە بە هەڵگەڕاوەیی بەکار ئەهێنن، ئێمە بەشێوە ڕاستییەکەی بەکاری ئەهێنین‌و زۆر چاك لەواتاکەی تێئەگەین.

ئەگەر سەیرێکی یاسای زاراوەی عەرەبیی بکەین‌و لەوشەی (الطبيعة) ورد بینەوە، ئەبینین هاوتای وشەی (فعيلة)یە کە بەواتای (مفعول)ە، واتە: سرووشت پێبەخشراو، دەی ئەوەی کە سرووشتی بەخشی بەسرووشت، کێ بوو؟ ئایا کەسی تر

جگە لە خوا ئەو دەسەلاتەی هەیە؟ جا ئێمە کاتێ وشەی سرووشت بەکار ئەهێنین مەبەستمان لێی (خلقە)یە، (فطرە)یە، نەك شتێکی تر.

ئەوەی وای بۆ ئەچێت سرووشت ژیانی هێنابێتە بوون
داواکەی بێ سەرو بنە، دەس بەتاڵە لە بەڵگەی ڕوون
ژیان هۆیەکە، ملکەچی ویستی خالقی خۆی ئەکات
گەردنکەچی ویستی ئەوە، بەپێی ئەمری (کن فیکون)
بەلاَم ئەی ژیان خۆی چییە؟ ئەمەیان کەس نەیزانیووە
بێ کێشە، بێ بارستایی، تاکو ئێستا چاو نەیدیووە
کەچی ملیۆنەها ساڵە هەیشەو هەر وایش ماوەتەوە
هەموو مەخلوقێ چەپکی خۆی لە گوڵزاریدا چنیووە[1]

## سەرپەرشتیاریکردنی پیاو بێ سنوور نییە

سکالاَ: ئایا سەرپەرشتیارییکردنی خێزان لەلایەن پیاوەوە بێسنوورە؟

دڵپاك: ئێمە وتمان ئەو سەرپەرشتییە لەسەر بناغەی دادپەروەریی و ڕاوێژکاریی و بەرژەوەندیی پاراستنی خێزان دامەزراوە، واتە سەرپەرشتیکردن ئەرکێکە بە سەر شانەوە، نەك فەرمانڕەواییەکی جەورو ستەماویی، واتە لە سنووری حەق و دادپەروەریدایەو بێسنوور نییە، خۆ ئەگەر هاتوو لە سنووری خۆی و لەسەر هێڵی ڕاستی خۆی لایداو ترازا، واتە بەرەو ستەم و تاوان ڕۆیشت و بێ فەرمانیی خوای تێکەوت، ئەوا بۆ خۆی هەڵئەوەشێتەوە، ئیتر ڕێزگرتنی نەك هەر بەتاڵە، بەڵکو تاوان و گوناهە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق). واتە: گوێڕایەڵیی هیچ کەسێك نابێت بکرێت لەڕووی سەرپێچیی کردنی خواوە، دیارە لادانی سەرپەرشتیار لەدادگەریی سەرپێچی کردنی خوایە، چونکە خوا لەسەر بنەڕەتی دادپەروەریی ئەوەی بەپیاو سپاردووە، هەروەها خوای گەورە لەیەکێك لە یاساکانی سورەتی "العنكبوت"دا ئەفەرموێ: (وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا).

خوشکە سکالاَ، ئەو ترس و لەرزەی ناوێت کە تۆو هاوچەشنانی تۆی داگرتووە سەبارەت بە سەروکاریکردنی خێزان لەلایەن پیاوەوە لە ئیسلامدا، ئەو سەروکاریکردنە واتای ئەوە نییە کە پیاو ژن ئەتاسێنێ، دەوری بەندەو بەندایەتیی ئەبینێ لەماڵی مێردەکەیا، ئافرەت هەر کە چووە ماڵی مێردەکەی ئەوا هەست بەوە ئەکات کە ئێستا . نەك لەمەوبەر. خاوەن ماڵە، کە ماوەیەك لەگەڵ مێردەکەیا ژیاو چاك لەیەکتر گەیشتن و بوونە خاوەنی جگەرگۆشە، ئافرەت هەرگیز بیر لەزۆرانبازیی ناکاتەوە، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی خێزان بگرێتە دەست، سامەگەر کەسێکی وەك تۆ.

ئافرەت کاتێ ئەبینێ مێردە موسڵمانەکەی نەرم و نیان و میهرەبانە لەگەڵیا، کە ئەبینێ زۆر بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا ئەکات، هیچ شتێکی لێ دریغ ناکات، ناپاك نییەو دڵسۆزە لەگەڵیا، کە ئەبینێ هاوسەرێتیی سۆزبەخشینە، هاوکارییە، خۆشەویستیی یەکترییە، ڕاوێژکردنە، چەپککردنی تاڵی هیوای ئەو ژیانە تازەیەیە، ئارامیی گرتن و هێمنی دەروونە، ژیانی ڕاستەقینەیە، ئیتر هەرگیز بیر لە زۆرانبازیی و چەڵەمەکێشەی سەرپەرشتی گرتنە دەست ناکاتەوە، پیاو بەناحەزو بەرامبەر "الخصم" نازانێت، بەڵکو بەهاوسەری ژیان، بە پاڵپشت و هیوای خۆی ئەژمێرێت، بە تەواوکەری خۆی و بەنازکێشی خۆی دائەنێت، هەروەها پیاویش بەرامبەر ئافرەت هەمان هەست و بیری هەیە.

چۆن نا! لەکاتێکا خوا ئەفەرموێ: (..وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً..)، یان دەفەرموێت: (..هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن..). جا نازانم ئەوانەی کە لەدژی ئیسلام ئێوەیان تێگەیاندووە، ئەم یاسا خواییانەیان بۆ باس کردوون؟

خوشکێ، بێج لەوەی کارگەی ئینسانی
نیوەی کۆمەڵگەی، کێڵگەی ژیانی

---

[1] سروەی بێداری، چاپی یەکەم.

جێگەی متمانەش، بەرگی پیاویت

نیوەی تەواوی قەڵای ئیمانی!

ئاواز: من ئەمەوێ سنوورەکە لەچوارچێوەی یاسایەکی دیاریکراودا خۆی بنوێنێ، بەڵام لەئیسلامدا بەرچاو ناکەوێت!

دڵپاك: خوشکەکەم، ئەبوایە بتگوتایە من نەمدیووە، نەك بتگوتایە لەئیسلامدا بەرچاو نەکەوتووە، تۆ خۆتت لەئیسلام دوور گرتووەو خۆتت جیا کردۆتەوە، لەلایەکی ترەوە ئیسلام پارچە هەڵبەستێك نییە کە منو تۆ لەسەرەوە تا خوارەوە هەموویمان لەبەرکردبێت.

پەرگەمای سەرپەرشتیکردنی پیاو بۆ خێزانەکەی ئەم یاسا قورئانیەیە: (..وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوف..) بەچاکیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن، جا مەگەر هەر زاناکانی زمان لەناسکییو چاکیی نواندنی ئەو یاسایە بگەن، کە چۆنەو چی ئەنوێنێو مەبەستەکەی چەند قووڵە، ئەی ئەوە چوارچێوەو سنووری سەرپەرشتییەکە نییە؟

پێغەمبەری پێشەوامان ﷺئەفەرموێ: (خيركم خيركم لأهله، وانا خيركم لأهلي). ئەی ئەوە سنوور نییە؟ ئەمە تەنها بۆ نموونە، ئەگەر ئەتەوێ بە درێژیی لەسەر باسەکە بڕۆیت سەرچاوە زۆرو زەبەندەیە.

سپاردنی سەرپەرشتیی بەپیاو لە ئیسلامدا کەڵکی بۆ ئافرەتە نەك زیان، چونکە مافی ڕەوای ئافرەت پارێزراوە، دەسەڵاتی پیاویش سنووری بۆ کێشراوە، دەستدرێژیو تەماعو ناپاکیی نییەو نابێت، بۆ نموونە: ژن هێنان بەسەر ژنا بۆ ناڵکردن، فێڵو تەڵەکە بەکارهێنان، ماف فەوتاندن، بەهیچ کلۆجێك ڕێگەیان پێنادرێت، هیچ ناڕەواییەکی تریش.

وردەکاری ئیسلام لەم مەسەلەیەدا گەیشتووەتە ئەوەی کە سەرپەرشتی لەپیاو، لە حاڵەتی پیسکەیی . بەمەرجێ لە هەژارییەوە نەبێت . ئەسێنێتەو، یان کاتێ پیاو لێی ئەقەومێ لەڕووی ژیرییەوە، یاخود هەندێ لایەنی ترەوە چاوەڕوانیی چاکبوونەوەی لێ ناکرێت، دیسان لێی ئەسێنرێتەوە، ئایا ئەمەش سنووری نییە بۆی؟ یان ئێوە بەسنووری دانانێن؟

سکاڵا: وەڵڵا سنوورەو زۆر جوانو ڕێکو پێکیشە.

دڵپاك: لەوەش زیاتر، پیاو مافی ئەوەی نییە کە سەرپەرشتی ماڵو سامانو دارایی ژنەکەی بکات، سا مەگەر ژنەکەی مۆڵەتی پێبداو خۆی بەوە ڕازی بێت، ڕەنگە نەزانن کە تائێستا یاسا داتاشراوەکان نەگەیشتوونەتە ئەم ڕاددەیەو ئەم پلە بەرزە لە پاراستنی مافی ئافرەتدا، کەچی ئافرەت خۆی ئەوپەڕی سەربەستییو سەربەخۆیی هەیەو ئەتوانێ بکڕێت، بفرۆشێت، بارمتە بگرێ، بەکرێ بگرێ، خێر بکاتو ببەخشێ، بچێتە دادگا بۆ بەرامبەرییکردنی بەرامبەرەکەی، بەبێئەوەی پیاو مافی ئەوەی هەبێت ڕێگەی لێ بگرێت.

تەنانەت ئەگەر ژنەکەی گاور یان جوولەکە بێ بۆی نییە لەئایین وەری بگێرێ، خۆی بۆ خۆی سەربەستە ئەتوانێ موسڵمان ببێ یان نەبێ، توخوا یاسا هەیە بگاتە ئیسلام؟ ئەو سەرپەرشتییە چی لە شیاویی ئایینی، ئابووریی، ڕامیاریی، فێربوونو فێر کردن، یان کەسایەتی ئافرەت کەم ئەکاتەوە؟ چ مافێکی ئافرەت زەوت ئەکات؟!

سکاڵا: زۆر سەیرە!! ئەم ئیسلامەی کە تۆ باسی ئەکەیتو ئەو ئیسلامەی کە لەناو خەڵکدا ئەبینرێت زۆر لە یەکەوە دوورن، ئەمەی تۆ یەکەمین جارە کە ئەیبیستم، بەڵێ، پاکە، جوانە، دڵرفێنە، بێ وێنەیە، پڕ بەهیوای هەموو کەسێکە، بەڵام ئەوەی ناو خەڵك ترشو تاڵە، جۆرێکی ترە دڵپاك گیان!!

دڵپاك: ئیسلام هەر یەك ئیسلامەو ئەمەشیانە نەك ئەوەیان، ئیسلام لەشیوێك دایەو خەڵکیش لەشیوێکی تردا، ناحەزیش بەهەوەسی خۆی دەست ئەوەشێنێو ئێمەی ئافرەت هەڵئەخەڵەتێنێ، ئەها چی لێکردووین، تۆی ڕۆڵەی ئیسلام، زادەی دایكو باوکێکی نوێژگەری ڕۆژووگر، پەروەردەی سەر خاکی ئیسلام، ئەها چەندە دوور خراویتەوە لێی! بەبێئەوەی هەستی پێبکەیت!

سکاڵا: ئاخ (سەربەست)و (هەڵکەوت)و پێڕەکەتان بە (نەشمین)و (پرشنگ)و (جوان)و تەڕەسازەوە.. ئاخ! هەر ئەگەمەوە لاتان، سبەی نا دوو سبەی.

دڵپاك: بەڵام ڕاستیی بە کەفە دەمێو گەڕەلاوژێ جێی خۆی ناگرێت.

# بەشی حەوتەم

## ئافرەت و میرات

دڵپاك: ئێ مامۆستا سکاڵا، هیچ سپاردەیەکی تری کاك سەربەستو پێرەکەیت پێنەماوە؟

سکاڵا: بەڵێ پێم ماوە، بەڵام وا دیارە سپاردەکانیان ساختەکارییو پووچەڵن، لەبەر ئەوە پێویست ناکات بیانخەمە ڕوو.

دڵپاك: نا، خوشکەکەم، بیانخەرە ڕوو، با دڵنیایی بە دەست بێنی، تەنها باوەڕ بە پووچەڵیی شتێك یان مەسەلەیەك بەس نییە، ئەبێ پووچەڵیی ئەو شتە، یان ئەو مەسەلەیە بە بەڵگەوە بزانی، هەروەها باوەڕیش بە ڕاستیی مەسەلەیەك بەبێ بەڵگە کارێکی کوێرانەیە.

سکاڵا: یەکێك لەو بەڵگانەی کە ئەوان ئەیانهێنایەوە بۆمان، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئافرەت بە نیوەی پیاو دائەنرێت لەئیسلامدا ئەمەیە: "ئافرەت لەمیراتا نیوەی پیاو بەشی پێئەدرێت، دوو ئافرەت بەقەدەر یەك پیاو ئەبەن". ئایا ئەوە ڕاستە؟

دڵپاك: میرات لەئیسلامدا جۆری هەیە، باسێکی دوورو درێژە، دەیان پەڕاوی پڕ کردۆتەوە، لەتوانای منا نییە لەسەرەتاکەیەوە تا کۆتاییەکەی باسی بکەم بۆتان، (سەربەست)و ئەوان تەنیا یەك برگەیان بەگوێی تۆدا داوە، ئەویش بەمەبەستی چەواشەکردنو ڕق ناشتن لەدڵتا سەبارەت بەئیسلام، ئەگینا ئەو بابەتە لەوزەی (سەربەست)دا نییە.

بەڵێ، جاری وا هەیە ئافرەت نیوەی پیاوی ئەدرێتێو جاریش هەیە بەقەدەر پیاوی پێئەدرێت، بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت نیوەی پیاوە، هەروەك لەباسی گەواهییدانا (شایەتی) باسمان کرد.

ئاواز: ئەمەیان یانی چی؟ چۆن جارێ بەقەدەر پیاوو جارێ نیوەی پیاو؟

دڵپاك: هەر زوو هەڵنەچنو تووڕە نەبن تێتان ئەگەیەنم، تێتان ئەگەیەنم کە ئیسلام چەند ورد بینو دووربینو واقیعییە، چەند دادپەروەرو ڕێکو پێکە، هەر خۆی لەخۆیا بەڵگەیە کە یاسایەکی ئاسمانییە، خواییە، بەرژەوەندیی هەموو کەسێکی ڕەچاو کردووە.

ڕەنگە لەبیرتان مابێ کە لەباسەکانی پێشوودا. ئافرەت لەمێژوودا. باسمان کرد کە ئافرەت لەپێش دەرکەوتنی ئیسلامدا، میراتی پێنەئەدراو لەزۆر لای جیهاندا خۆی بەشێك بوو لەمیرات، ئەو کەسەی کە بکڕرێتو بفرۆشرێت، چۆن ماڵو میراتی ئەبێت؟ تاکو سەدەی یانزەهەمی زایین لەناو ئینگلیزدا ئافرەت ئەفرۆشرا. لە ساڵی (١٥٦٧)ی زاییندا، پەرلەمانی "ئیرلەندە" بڕیارێکی دەرکرد تیایا هاتبوو: "ئافرەت نابێ دەستەڵاتی بەسەر هیچ شتێکدا ببێ". لەناو عەرەبو ڕۆمانو فارسو هندو چینو ئەوانەی تردا کە ناومان بردن ئافرەت هەر بێبەش بوو لەمیرات، ئەگەر لە هەندێ شوێناو لەهەندێ کاتدا بەشی درابێ، بەشێوەیەکی زۆر تەسكو تروسكو سووکەڵە بووە، یاساکەشی چەسپاوو دامەزراوو هەمیشەیی نەبووە.

خۆری ئیسلام هەڵهات، هەموو تاریکییەکی ڕۆشن کردەوە، تیشکی زێڕینی بەرەو بەشی ئافرەت لەمیراتیشدا هاویشت، ئەو تاریکییەی کە ملیۆنەها ساڵ بوو باڵی بەسەر مافو بەشی ئافرەتدا کێشابوو ئیسلام ڕەواندییەوە. تەنانەت یارو هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، سەریان سوڕ ئەما ئەیانگوت: "ئافرەت چوار یەك یان هەشت یەکی پێبدرێت؟!! کچ نیوێکی بدرێتێ؟! بەشی منداڵی ساواش بدرێت؟! خۆ ئەوانە هیچ کام ناتوانن بجەنگن! ناتوانن تاڵان بکەنو بێ دەستکەوتن!".

تەنانەت ئەو یارو هاوەڵە موسڵمانە باوەڕ بەهێزانە، ئاواتەخوازی ئەوەبوون کە پێغەمبەرﷺئەو جۆرە یاسایانەی لەبیر بچێتەوە، بە یەکتریان ئەگوت: "ئەم باسە کپ بکەنەوەو لێی مەدوێن، بەشکوم پێغەمبەری خواﷺلەبیری بچێتەوە، یان پێی بڵێین بیان گۆڕێت".

ناهەقیان نەبوو، وەها فێر بووبوون کە ئافرەت میرات بێ لەناویاندا، نەك میراتبەر، بەڵکو گەلێکیان هەر بەزیندەیی ئەیانخستنە چاڵێك و ئەیانکردن بەژێر گڵەوە، ئەمەمان لەباسی زیندەبەچاڵکردندا باس کرد.

ئاواز: ئێمە ناڵێین ئیسلام یارمەتی ئافرەتی نەداوە، بەڵام لەمیراتدا بۆچ نیوەی پیاوی پێ ئەدرێت؟ بۆچی لەگەڵ پیاودا یەکسان نەبێت؟

دڵپاك: کچە ئاخر تۆ قسە بە بنیادەم ئەبڕی، ئەو نیوەبردنە تەنها لە حاڵەتی کوڕو کچدایە، نەك لەهەموو حاڵەتێکدا، فەرموو گوێ بگرە لە دەقی یاسای ژمارەی حەوتی سورتی (النساء) کە ئەفەرموێت: (لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيباً مَّفْرُوضاً) (النساء: ٧).

سکاڵا: یاساکە ئەڵێ، بەشێك بۆ پیاوان و بەشێك بۆ ئافرەتان، بەڵام نەیگوتووە پیاوان بەقەدەر ئافرەت بەش بەرن.

دڵپاك: ئافەریم، ڕاست ئەکەیت، بەڵام منیش پێم گوتن میرات بردن جۆری هەیەو لەهەموو حاڵەتەکانیدا وەك یەك نییەو پێشم گوتن کە باسێکی دوورو درێژە، بەڵام چەند نموونەیەکتان بۆ ئەهێنمەوە.

دایك و باوکێك کوڕێکیان ئەمرێت، منداڵی لەدوا بەجێ ئەمێنێ، لەمیراتەکەی، باوك شەش یەك و دایکیش کە ئافرەتە شەش یەکی بۆ دێتەوە، ئەی بەشەکەیان هەر وەك یەك نییە؟، ئەگەر کوڕەکەیان منداڵی لەدوا بەجێنەما دایك سێ یەك و باوك دوو سێیەکی بۆ دێتەوە، یان پیاوێك یاخود ئافرەتێك بەوەجاغ کوێری ئەمرێت، براو خوشکەکانی بەشیان لەمیراتەکەیا بەقەدەر یەکە، ئایا ئیسلام ستەم لە ئافرەت ئەکات؟

سکاڵا: لەم حاڵەتانەدا چڵەپۆپەی دادپەروەری خۆی ئەنوێنێت.

دڵپاك: لە یاسای ژمارە (١١)ی سورەتی (النساء)دا ئەفەرموێ: (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ..).

سکاڵا: ئا.. ئا.. ئەوەبوو (هەڵکەوت)و (سەربەست) بۆیان باس ئەکردین.

ئاواز: دەی ئەمەیان بڵێ، گوایە ئەمە دژ بە بەرژەوەندیی ئافرەت نییە؟ ئەی ئەوە نییە دوو ئافرەت ئەوسا پیاوێکیان پێوەیە؟

دڵپاك: وەڵامی ئەم هەموو هەڵچوونەت ئێستا تێئەگەیەنم، پەلەمەکە. ئاواز خان، با وای دابنێین ئێستا تۆ شووت کردووەو دوو کوڕی هەرزەکارت هەیە، لە (هەولێر)ەوە یەکێکیان بۆ (بەغداد)و ئەویتریان بۆ (فاو) ئەنێریت، بەوەی (فاو) ئەڵێیت: کە هاتیتەوە جووتێك قۆندەرەو دە تا دوانزە مەتر قوماش و هەندێ بۆنی خۆش و میوەش لەگەڵ خۆتا بهێنەرەوە، کەچی ئەوەی بەغداد داوای هیچی لێناکەیت کە بیهێنێتەوە لەگەڵ خۆیدا. ئایا ڕاست و دادگەرییە ڕێك و بەقەدەر یەك پارەیان پێبدەیت؟

ئاواز: نەخێر.. نەخێر، ڕاست نییە یەکێکیان ڕێگەی کورتەو داوای هیچیشی لێنەکراوە، ئەویتریان ڕێگەکەی دوورەو داوای چەند شتێکی لێکراوە، لەبەر ئەوە ئەبێ ئەم پارەی زۆری بدەمێ، واتە لەوی تر زیاتری پێبدەم، بەڵام ئەمە پەیوەندیی بەمیراتەوە چییە؟!

سکاڵا: ها، خەریکە بیزانم، بەڵام "لەبێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات".

## هەرکەس بەگوێرەی پێویستی خۆی

ئاواز: ئەوە یانی چی سکاڵا؟! ئەی ئەو نموونەی دوو کوڕە کە دڵپاك باسی کرد چ پەیوەندییەکی بە میراتی کوڕو کچەوە هەیە؟

دڵپاك: ئاواز خان، با من وەڵامت بدەمەوە، ئەو پەیوەندییەی کە تۆ لەو دوو شتەدا بە نەبوو باسی ئەکەی، زۆر گەرمو بەتینو ئاشکرایە، ئەزانی ئەوەیان کە ناردت بۆ فاو وەك کوڕەکە لەمیراتداو ئەویتر کە ناردت بۆ بەغداو داوای هێنانی هیچیشت لێنەکرد وەك کچەکە لەمیراتدا وایە، ئەی خۆت نەتگوت ئەبێ بەشی یەکەم زیاتر بێت لەدووەم؟

ئاواز: بەڵێ ئەوەم گوتو بەڕاستیشی ئەزانم، بەڵام لێت تێناگەم.

دڵپاك: خوشکە بەڕێزەکەم، تازەترینو داد پەروەوەرترین یاسای دانراوی ئەمڕۆی مرۆڤ گەیشتووەتە ئەم ئاستە: "هەرکەس بەپێی پێویستی خۆی ئەیدرێتێ".

ئاواز: دەی ئەوە یاسایەکی جوانەو باوەڕیشی پێ ئەهێنم.

دڵپاك: دەی چاوەکەم، لەئیسلامدا، پێکەوەنانی خێزان، ئەرکی بەڕێوەبردنی، لەئەستۆی پیاودایە نەك ئافرەت، دایكو باوكێك ئەمرن، میراتەکەیان دوو بەشی کوڕ ئەیباتو بەشێکی کچ، بەڵام ئەی نابێ بیر بکەیتەوە لەوەی کە کوڕەکە دەستگیران ئەگرێت، ژن ئەهێنێ، ئەبێ مارەیی بدات، مەسرەفی ئەو زەماوەندو ئاهەنگە بکێشێ، حانوو بەرەو کەلو پەلی ناوماڵ ڕێکبخات، ئەمجا خەرجیی ئەو ماڵە نوێیە هەمووی بەسەر شانی ئەو کوڕەوەیە، ئادەی بیر بکەرەوە بزانە چەندی تێئەچێتو چەند زەحمەتە!

کەچی لەولاوە خوشکەکەی شوو ئەکات بەپیاوێك کە مارەیی پێئەدرێت، جلوبەرگی بۆ ئەکرێت، خانووبەرەو کەلوپەلی ناوماڵی بۆ ڕێکئەخرێت، لەلایەن مێردەکەیەوە مەسرەفو هەموو شتێکی بۆ ئەکرێتو نازیشی ئەکێشێت، واتە سێ یەکی بەشە میراتەکەی گەر زیادی نەکردبێت کەمی نەکردووە، لەکاتێکا لەوانەیە کوڕەکە لەدوو بەشەکە هیچی بۆ نەمابێتەوەو قەرزاریش بووبێت، دەی توخوا کامیان براوەیە، براکە یان خوشکەکە؟

ئاواز: بەخوا بەمجۆرە کە تۆ باسی ئەکەیت، خوشکەکە براوەیەو قازانجییەتی.

سکاڵا: ئەی هاوار! من ئەمەم قەت لەبیردا نەبووەو نەهاتووە بەخەیاڵمدا، نازانم ئێمە بۆچی مێشکمان لە کار کەوتووەو بیر ناکاتەوە! ئۆخەی کە ئەم ڕاستییانە ئەبیستین، هەرچی فێربووین هەمووی کوێرانە بووە.

دڵپاك: کەواتە ئیسلام چواردە سەدە، واتە (١٤٠٠) ساڵ پێش یاسا زەمینییەکان زانیویەتی کە ئەبێ "هەرکەس بەگوێرەی پێویستی خۆی بەشی بدرێتێ". ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە یاسای ئیسلام پێشکەوتوو ترە لە هەموو یاسایەك. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نیوە بردنە وەك گوتمان تەنها لەمیراتی باوكو دایکیدایە، لەو سامانەدایە کە بەبێ ماندووبوون دێتەوە بۆ کوڕو کچ، بەڵام ئەو سامانەی کە پەیدا ئەکرێت "المکتسب" جیاوازیی لەنێوان نێرو مێدا نییە، ئیتر کرێی کارکردن بێت، بازرگانیی، بەرهەمی زەویی یان هەر شتێکی تر بێت.

ئاواز: ئەوە هەمووی جوانە، بەڵام لە مەسەلەی میراتەکەدا دووشتم هاتەوە یاد:

یەکەم: هەندێ پیاو هەن، بەشە میراتەکەیان بەخۆڕایی خەرج ئەکەن، ژن ناهێنن، ئیتر خێزان بەخێوکردنی چی؟ ئەی ئەمەیان چی لێئەکەی؟

دڵپاك: جارێ با ئەوەت پێ بڵێم، کە خەرجکردنی بەخۆڕایی لەئیسلامدا ڕەوا نییە، ئەو جۆرە کەسانەش زۆر کەمنو بە زۆڵەك "شاذ" ئەژمێردرێن، لە کاتێکدا یاساکەی ئیسلام بۆ گشتیی دانراوە، نەك بۆ زۆڵەك، لەگەڵ ئەوەشدا تێبینییەکەت وردو جوان بوو، ئەی دووەمیان؟

ئاواز: ئێمە ئێستا لە چەرخێکدا ئەژین کە ئافرەت کار ئەکات، دەستکەوتی ئەبێ، وەك جاران نەبەستراوە بەماڵەوە، تەنانەت لە خەرجکردنو بەخێوکردنی خێزاندا بەشداریی ئەکات وەك پیاو، ئایا ئەمە ناچێت بەگژ ئەوەدا کە ئافرەت .واتە خوشك .لەو میراتەدا نیوەی پیاو بەرێت؟ واتە دژایەتی دروست نابێت لەنێوان ئەو دوو مەفهوومەدا؟

دڵپاك: ئەم وتەیە بەدیمەنو ڕواڵەتو لە دەرەوەیدا وەك ڕاست ئەنوێنێ، بەڵام لەناوەڕۆكو جەوهەردا لەڕاستییەوە دوورە، چونکە ئافرەت بەزۆر نەك بەویستی خۆی چۆتە دەرەوە بۆ کارکردنو ماڵی بەجێ هێشتووە، واتە بەفڕوفێڵو هەڵخەڵەتاندن کراوەتە دەرەوە، خوا یاربێت لە دواییدا بە درێژیی ئەمە ڕۆشن ئەکەینەوە، ئەگینا جێگەی ڕاستەقینەو سرووشتیی گونجاوی ئافرەت ماڵەوەیە نەك دەرەوەی ماڵ، جگە لە هەندێ بارودۆخی تایبەتی، کە کاتی هات باسی ئەکەین.

ئاواز: بەڵام کارکردن پێویستە بۆ ئافرەت، ئەی بۆچی کار نەکات؟!

دڵپاك: سەیرە! خەڵك بۆچی کار ئەکات؟ ئایا بۆ ئەوە نییە کە بژی؟ کچ تا لەماڵی باوکیدا بێت ژیانی لەسەر ماڵی باوکییەتی، ئەمجا کە شووی کردو چووە ماڵی مێردەکەی، ژیانی لەسەر مێردەکەیەتی، ئەوەش نەك بە خێرو بەزەیی پێدا هاتنەوە، بەڵکو لەشێوەی پێویست، واتە "واجب"دا، کە مێردو باوکی مردن ئەو ئەرکە ئەکەوێتە ئەستۆی کوڕ، برا، یان کەسەکانی تری، خۆ ئەگەر قەرەچۆڵ بڕاوە بوو، ئەوا پێوستە لەسەر دەوڵەت کە ژیانی بۆ دابین بکات، ئەمەش مەسەلەیەکی حسابییە نەك سۆزدارییی، ئاواز خان.

بەڵێ ئافرەت بەهەر هۆیەك بوو لەماڵ کرایە دەرەوە ئەوەتا کار ئەکات، با بڵێین ئەتوانێ خۆی ماڵو منداڵیش بژێنێ، بەڵام ئایا ئافرەت بەهۆی ئەوەوە زیانمەند نەبووە؟ ئایا لەمێیەتییو دایکایەتیی خۆی هیچی نەدۆڕاندووە؟ ئەی سیفاتو تایبەتمەندییەکانی هیچ لێدانێکیان بەرنەکەوتووە؟ ئایا هێمنییو ئارامییو خۆشیی خێزان بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو پاك ماوەتەوەو ئەمێنێتەوە؟

سکاڵا: ئەی پەیوەندی نێوان کەسانی خێزان بۆچی ناڵێیت؟ ئایا ئەوەش بەشێوەیەکی ئاساییو سرووشتی ماوەتەوە؟ بەخوا بووە بە پارە پەرستییو کیسە جیایی، هەرکەس بۆ خۆی، دوور لەیارمەتیدان ئەژین.

دڵپاك: لەوەش گرنگتر، ئایا ئافرەت بەنرخترین دەسمایەی خۆی کە ئابڕوویەتیی بە سەلامەتیی لەدەستدا ماوەتەوە؟ کەرامەتی پارێزراو ئەبێ؟ پلەی مرۆڤایەتیی لەهینی ئافرەتەکانی کۆن کە باسمان کردن نزمتر نەبۆتەوە؟ ئەمەو دەیەها پرسیاری تر.

سکاڵا: باوەڕم بەو باسانە زۆر زۆر پتەوە کە ڕاستن، سامانو دارایی هەموو شتێك نینو قەرەبووی هەموو شتێکیش ناکەنەوە، ئەو دووانە ئەبێ هۆ بن بۆ ژیان، نەك مەبەست بن، هەرچۆنێك بێت گیروگرفتی ئێمە نەزانییە، تێنەگەیشتنە، نەناسینی خۆمانو ڕۆڵی خۆمانە لەژیاندا. بەڕاستی دۆڕاوین بەبێئەوەی هەست بەدۆڕان بکەین، بەنج کراوین بەبێئەوەی هەست بە بەنج کردنمان بکەین.

دڵپاك: دەی خوشکەکانم، لە هەموو شتێ چاکتر ئەوەیە کە ئادەمیزاد هەست بەهەڵەو تەنگو چەڵەمەی خۆی بکات، دوای هەستکردن ئیتر ڕاست وایە هەوڵی ڕاستکردنەوەو نەهێشتنیان بدات. هیوادارم خۆتان بجووڵێنن، بیروڕاتان تەتڵە بکەن، داوا ئەکەم لەخوا کە یارمەتییتان بدات، دڵتان بە تیشکی باوەڕ ڕۆشن بکاتەوە.

## نامەیەك

دڵپاك: لێم ببورە، سکاڵا خان، کە درەنگ هاتم، لە گەرمەی وانە گوتنەوەدا بووم کە فەڕاشەکەت ناردبوو بە دواما، دڵم نەهات وانەکە بەجێبهێڵمو کاتەکە بکوژم، خێرە؟ کارێکت هەبوو پێم؟

سکاڵا: بەڵێ خێرە، منیش لە پۆلدا بووم کە ئەم نامەیەم پێگەیشت، وەك ئەزانی بڕیار وابوو، دوای نیوەڕۆ بڕۆینەوە، کەچی ئەوەتا ئەم نامەیەمان بۆ هاتووە، جا فەرموو بیخوێنەرەوەو بڕیار بدە.

ڕۆژ باش

هاوڕێی شیرینم سکاڵا خان

زۆر تاسەت ئەکەم، هیوادارم لەش ساغو شادمانو کامەران بیت، (پرشنگ)و (نەشمین)و دەستە خوشکان هەواڵت ئەپرسن، ڕێزو خۆشەویستییمان بۆ ئاواز خان، سەلامم بگەیەنە بەدڵپاکی دەستە خوشکتان.

هاوڕێی خۆشەویستم، نیازم کردووە کە ئێوارەی پێنجشەممە، منو نەشمینو پرشنگ بێین بۆ لاتانو شەوی هەینی لاتان بمێنینەوە، بە قسەی خۆشو پاراوو خەم ڕەوێن ڕۆژ بکەینەوە، زۆر حەزیش ئەکەین ئەو مامۆستا "دڵپاک"ەکەتان ببینین، مەبەستم ئەوەیە بەشکو ئەویش لامان بێ، خۆ تۆ ئەوەندەت باس کردووە بۆمان خەریکە ئێمەیش..

هاوڕێت

جوان

دڵپاك: وادیاره زۆریان بەدەستەوەیە، بەڵام مادام دەستە خوشكو ناسراوی ئێوەن، با بێنو بەخێریش بێن، ئەوەندە هەیە كاغەزە كەكورتو زۆرگره، تەنانەت كۆتایی بەسێ خاڵ هاتووه، واتە نامەیەكی تەواو بووی تەواو نەبوو' بەڵام قسەی پاراوو خۆشو خەم ڕەوێن له قامووسی ئەواندا ئەبێ چ بێت؟

سكاڵا: من لە پرسیارەكانی تۆ تەقەی سەرم دێت، ئیتر چیت وەڵام بدەمەوە؟

دڵپاك: گوێی مەدەرێ، لەوە گەڕێ، با بیرمان بەلای ئێوارەوە بێ.

ئاواز: ئەوە چی ڕوویداوه؟ پۆلەكانتان لەچۆڵی ئەكرد لەم دواییەدا.

سكاڵا: ڕاست ئەكەی، وا بوو، نامەیەكمان لە جوانەوە بۆ هاتووه، لەگەڵ نەشمینو پرشنگ ئەم ئێوارەیە دێن بۆ لامانو شەو لەلامان ئەمێننەوه.

ئاواز: زۆر چاكە، یاخوا بەخێر بێن.

## ئەمەیان ناو بنێین چی؟

نەشمین: خوشكە دڵپاك، سكاڵا كە دێتەوه، ناوی تۆ زۆر ئەهێنێ، گەلێ باسی تۆمان بۆ ئەكات، تەنانەت ئەو وتووێژەی كە ڕوویداوە لە نێوانتاندا هەمووی بۆ باسكردووین، ئێمەش زۆر حەزمان ئەكرد كە بتبینینو بتناسین، لەگەڵ ئەوەشدا داوای لێبوردنت لێئەكەین كە بووین بەهۆی نەڕۆشتنەوەت.

دڵپاك: بەخێر هاتن بەسەر چاو، بەختیارم بە دیتنو ناسینتان، چی تیایە گەر لەبەر خاتری ئێوه ئەم هەفتەیە نەڕۆمەوە؟ بەخێربێن.

پرشنگ: مامۆستا دڵپاك، تا ئێستاش هەر بەرگی كۆن، مەبەستم بەرگی شۆڕ بوو، ئەپۆشیت؟

دڵپاك: بەڵێ، تا ئەو ساتەی كە دوا بەرگ ئەپۆشم، گرنگ نییە هەر جۆر ناوی بەرن، كۆن، شۆڕ، یان هەر ناوێكی تر.

جوان: شوێنەكەشتان جەوێكی گونجاوو لەبارە، بەتایبەتی بە شەواندا دڵپاك خان، لەم جۆرە شوێنانەدا كە هێمنو ئارامن، مێشك حەساوەیەو ئادەمیزاد مێشكی ئەكرێتەوەو ئەتوانێ كەڵك لە كەسانی تر، بەتایبەتی هاوڕێیی پێشكەوتنخواز وەربگرێت.

دڵپاك: قسەكەت زۆر جوانو ڕاستە، بەڵێ تێگەیشتن لەشوێنی هێمندا ئاسانترە.

نەشمین: دڵپاك خان: تەبعەن، بەرگەكەت بەرگی تەدەیینە، ئافرەتە موتەدەیینەكان ئەم جۆرە بەرگانە ئەپۆشن.

دڵپاك: ڕاستە، منیش نەك هەر بەرگەكەم، بەڵكو ژیانو گیانم، بوونم، هەموویان ئەبێ بەپێی یاسای خوا بنو بۆ ئەو بن، واتە بەرگەكەم هی خواناسییەو لەبەر خواناسییە.

پرشنگ: بەڵام مەرج نییە هەركەس ئەو بەرگە نەپۆشێت خواناس نەبێت، ئێمە هەموومان وەك تۆ، لەوانەیە لەتۆیش خواناستر بین، كەچی ئەمەتا بەرگی چەرخییش ئەپۆشین.

دڵپاك: من مەبەستم ئەوە نەبوو كە ئێوە خوانەناس بن، زۆر سوپاسی خوایش ئەكەم كە ئێوە لەمن خواناستر بن، ئەوە ئەو پەڕی ئاواتی منە، بەڵام لام سەیرەی كە ئادەمیزاد باوەڕی بەخوا هەبێتو باوەڕی بە فەرمانی خوا نەبێت!! باوەڕت بەشیرینی هەنگوین هەبێتو نەیخۆیت، ئەمەیان ناو بنێم چی؟

جوان: لەقسەكەت تێنەگەیشتم! داوات لێئەكەم ڕوونی بكەیتەوه.

دڵپاك: كاتێ باوەڕ بەخوا نرخی هەیە كە بنیادەم گوێڕایەڵی فەرمانەكانی بێ، ئەی داپۆشیینی لەش یەكێك لەفەرمانەكانی خوا نییە؟ جا من وام كردووە، ئێوەش بە پێچەوانەی فەرمانی خواوەن، خۆیشتان بە "چەرخیی" ناو ئەبەن، دەی ئەبێ یان ئێوە یان من لەسەر هەق بین، لەڕوانگەی ئیسلامەوە من هەر هیچ نەبێ لە بەرگەكەدا گوێڕایەڵ دیارم، ئەی ئێوە؟

پرشنگ: دڵپاك خان، جلو بەرگ حیساب نییە، دڵ حیسابە.. دڵ.

دڵپاك: ئەگەر باوەڕت بەخوا نەبێت ڕاست ئەكەی دڵ حیسابە، بەڵام ئەگەر باوەڕت بەخوا هەبێت، بێگومان خواو پێغەمبەر ﷺحیسابن، نەك دڵ، چونكە بەرگ پۆشیینی تەواو یاسایەكی قورئانییە، جگە لەوەش پێغەمبەر ﷺئەفەرموێ: (لیس الایمان بالتمني.. ولكن ما وقر في القلب وصدقه العمل). واتە: باوەڕداریی بەهیوابوون نییە، ئەبێ لەدڵدا بنج داكوتێو كردەوەش گەواهییدەری بێت.

ئەمڕۆ هەموو زانستو زانیارییەكی ئەم چەرخە پشتگیری ئەو ڕاستییە ئەكەن، هەر بۆ نموونە: من حەزم لە پزیشكیە، وانییە؟، حەز ئەكەم پزیشكێك بەو چارەسەریی نەخۆشیی بكەم، ئایا ئەو حەزە، گەرچی لە دڵیشمەوە هەڵقوڵێ من ئەكات بە پزیشك؟ یان كەسێك زۆر حەز لە مۆسیقا ئەكات، دڵی پێی دێتە جۆشو پێی ئەكەوێتە سەماكردن، ئایا بەوە ئەبێتە مۆسیقاژەن؟

پرشنگ: نەخێر.. نەخێر، ئەمە ئاشكراو دیارە.. بەڵام..م.

سكاڵا: ئێ؟ بەڵام چی؟ جارێ ئەوە تۆ فت، هەر لێرەدا بەزایت، ئیتر واز لە قسەكردن بێنن، چایەكەتان بخۆنەوە، ئەم شەوم پێ مەكوژن بەدیار قۆریی و پیاڵەوە، جارێ چایەكەتان بخۆنەوە.

دڵپاك: سكاڵا گیان، ئەگەر لە ئیشەكە وڕەسی، هەڵسە وەرە دانیشە، من لە جیاتی تۆ هەموو ئیشێك ئەكەم، واز لەو قسە ساردانەش بێنەو تكات لێ ئەكەم دووبارەیان نەكەیتەوە، بۆچ ئێمە بۆ دۆڕاندن یان بردنەوە دانیشتووین؟ ئەگەر مەبەست دۆڕاندنو بردنەوەو یەكتر بەزاندن بێت من هەر لەئێستاوە ئەكشێمەوە دواوەو قسە ناكەم، ئەگەر مەبەستیش لەیەكتر گەیشتنە ئەوە پێویست بەڕێزگرتن ئەكات نەك شتێكی تر.

سكاڵا: ببوورە.. ببورە، لە دەمم دەرچوو.

ئەبێ داواكار بەڵگەی هەبێت

نەشمین: خوشكە سكاڵا، ڕەنگە تۆ بەوە نەزانیت كە ئیسلام ئافرەت بە بەندەی پیاو دائەنێت! ئێ، خۆ هەمووشمان ئەزانین كە ئەم چەرخە چەرخی ڕزگاریی و سەربەستییە، چەرخی بەندایەتیی بڕایەوەو بەسەر چوو، تۆیش ئەبێت ئەوە بزانی كە جارێكی تر ئەو چەرخە ناگەڕێتەوە.. ڕۆی.

دڵپاك: ئاه!! سەد خۆزگە وەها بوایە كە باست كرد مامۆستا نەشمین، ئای كە ئادەمیزاد بەختەوەر ئەبوو! ئای كە ئەحەساینەوە، خۆزگە بەسەر ئەچوو، بەڵام ڕەنگە بەهەڵەدا نەچم ئەگەر بڵێم تەنها خوشكە سكاڵاو خوشكە ئاواز مانای بەندەو بەندایەتیی و ژیانی بەندایەتیی ئەزانن، لێرەدا ئەوەندەتان پێئەڵێم، كە جۆرە كۆنەكەی بەندایەتیی بەسەر چوو، نەك خۆی، جا یەكێك لە دەردەكانی ناو كۆمەڵگەی ئێمە ئەوەیە، بە گۆڕینی كاڵای شتێك، سا هەرچی شتێك بێت، لێمان تێكئەچێت و نایناسینەوە!

جوان: بەڵام سكاڵاو ئاواز بەدرێژی باسی بەندەو ژیانی بەندایەتییان بۆ كردووین.

دڵپاك: دەی هیچ كامتان، لە قورئاندا، یان لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا ﷺشتێكتان لەو ڕووەوە بەرچاو كەوتووە؟ ئادەی، كامەیە؟

پرشنگ: ئێمە ئەوانەمان نەخوێندووەو نە خوێندووەتەوە.

دڵپاك: ئەی ئەم قسانە لەكوێوە دێنن؟ ئەی ئێوە ڕۆشنبیری چین؟

نەشمین: زۆربەی خەڵك، خوێندەواران ئەوە ئەڵێن، گوایا درۆ ئەكەن؟! ئەی تۆ بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی كە ئافرەت لە ئیسلامدا بەندەی پیاو نییە؟!

دڵپاك: ئاخر بەڵگە لە داواچی داوا ئەکرێت، "الدلیل علی من ادعی"، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی ئەیزانم لەم ڕووەوە پێتی ئەڵێم، ئیتر خۆت لەقایل بوون یان قایل نەبووندا سەربەستیت، بەلای منەوە گرنگ ڕاستییە. ڕاستیی.

لە ئیسلامدان بەپێی قورئان‌و سوننەت، پیاوو ئافرەت لە بن پەرگەوە (سەرەتاوە) لەیەك سەرچاوەو ماهییەتەوە هاتوون، خوێندنەوەی قورئان ئەمەمان زۆر بەڕوونی نیشان ئەدات‌و چەند جارەش بۆتەوە، بۆ دڵنیاییتان فەرموون گوێ بۆ چەند نموونەیەك لە یاسا قورئانییەکان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بگرن.

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا). (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً). (هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا). (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن). جا نازانم ئەتانەوێت ماناکانیان بکەم بەکوردی بۆتان؟

نەشمین: قابیلە بەشی ئەوەش عەرەبیی نەزانین، ماناکانیان ئاشکرایە، بەڵام نەمزانی ئەوە قورئان بوو یان فەرموودە؟

دڵپاك: بەداخەوە! خوشکە نەشمین، مامۆستایەك بیت‌و خەڵك بەهیوا بێت کە ڕۆڵەکانی لەتۆوە فێر بن، کەچی تۆیش قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەیەکتری جیا نەکەیتەوە، ئەبوایە هەر بۆ دراسەش بوایە جارێك قورئانت بخوێندایەتەوە، چی ئەبوو؟ ئایا دونیا دەڕووخا؟ جا تۆ تەنها یەك جاریش قورئانت نەخوێندبێتەوەو لە فەرموودەی جیا ی نەکەیتەوە، ئەی توخوا چ ژیربێژی (منطق)یێك ڕێگەت پێئەدات کە ڕەخنەی لێبگریت؟ کەی ڕەوایە، شتێك کە هیچی لێ نەزانی، کەچی ڕەخنەی لێبگریت؟ ئەوە فەرمایشتی خوا بوو، خوای پەروەردگارت، بەڵام بەداخەوە!!

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (کلکم من آدم، وآدم من تراب). (الناس سواسیە کأسنان المشط). (النساء شقائق الرجال).

سەرچاوە، جەوهەرو ماهییەت، کە یەکێك بن لە ژن‌و پیاودا، یاخۆ کە بە خوشکی دایکی‌و باوکیی بە یەکتر بناسرێن، وشەی بەندەو بەندایەتیی ئیتر لەکوێدا جێگەیان ئەبێتەوە خوشکە ڕۆشنبیرەکان؟! بەداخەوە! ئێوە شارەزای گیانی ئیسلام، گەورەترین شۆڕشی ڕووی سەر زەمین نین!.

جاڕی ئازادی نێرو مێ بەجۆرێکی وەها درا

بۆ یەکسانیی هەموو مافێ شانەو دانەی دەستوور کرا

یەکیەتێکی وەهای چەسپان، دوژمنانی کردە برا

خێزانێکی لەش ئاسایی گەورەی جیهانیی ڕێکخرا[1].

پرشنگ: بەڵێ، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە سەرچاوەی ئافرەت‌و پیاو یەکێکە، بەڵام خۆ ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت بەندەی پیاو نەبێت.

دڵپاك: باشە، ئەم پارچە کاغەزەی کە بەدەستەوەیە پاش ئەوەی کە زانیمان تاڵ نییە تامەکەی، ئایا تاڵ نەبوونی ئەوە ئەگەیەنێ کە تامەکەی ترش بێت؟ ئەی بەڵگەمان لەسەر ترشێتییەکەی چییە؟

پرشنگ: نا، ئەوە ناگەیەنێ کە ترش بێت‌و بەڵگەشمان بەدەستەوە نییە.

دڵپاك: دەی یاسا قورئانیی‌و فەرموودەکان لە فەرزێکا، ئەم فەرزەش ڕاست نییە. ئازادیی ئافرەت دەر نەخەن، خۆ بەندایەتیی ئافرەت دەرناخەن. دەی کە سەرچاوەی هەردووکیان یەکێکە، چۆن یەکێکیان ئاغاو ئەویتریان بەندەیە؟ بەندە چۆن هاوسان ئەکرێت لەگەڵ ئاغاکەیدا؟ چۆن بەزادەی یەك دایك‌و یەك باوك ئەژمێررێن؟، لەکام یاسای سەر زەمینذا تا ئێستاش ئەو یەك هەستیی‌و یەکسانییە بەدی ئەکرێت؟

ڕەنگە ئێوە بەوە نەزانن کە پێش دەرکەوتنی ئیسلام، جیهان لەم پەڕیەوە بۆ ئەوپەڕی سەبارەت بە بەندە چۆن بۆچوونێکی هەبوو! بەجۆرە گیانلەبەرێك دائەنرا کە قوڕی دروستبوونی هەر لەسەرەتاوە پیس‌و خراپ بووەو بۆ خزمەتێکاریی دروست کراوە، ئەوەش ڕای کەڵە فەیلەسووفەکان بوو، خەڵکیش دوای ڕاکانیان کەوتبوو، لەوەش خراپتر، ئافرەتیان هەر بە خاوەن گیان نە ئەژمارد، دەی ئەوە لەکوێ‌و گێڕانەوەی کان‌و بنەڕەت‌و بناغەی دروستبوونی پیاوو

---

[1] سروەی بێداریی

ئافرەت بۆ یەك كان‌و بنەڕەت‌و بناغە، لەسەر دەستی ئیسلام لەكوێ؟! دەی توخوا ئیسلام هەر لەو گۆڕینەشدا بە تەنها بۆ ئەوەش بەراوردی بكەین، گەورەترین شۆڕش نییە؟!

جوان: ئەی بۆچی پیاوان لەگەڵ ژناندا وەك ئاغا لەگەڵ بەندەدا ئەجووڵێنەوە؟ ئەی ئیسلام دەسەڵاتی نەداوەتە دەست پیاوان؟

دڵپاك: ئا، ئەزانم مەبەستت سەرپەرشتیاری كردنە، ئیسلام دەسەڵاتی ئەوەی داوە بە پیاو كە سەرپەرشتیی‌و ئاگاداریی خێزان بكات، بژێویی بۆ پەیدا بكات، پەروەردەی بكات، نەك كاری چەوساندنەوەو بەندەكردن‌و سەركوتكردنی ئافرەت یان ئەندامێكی تری ئەو خێزانە بێت.

دەی خۆ گەلێ لە موسڵمانانی ئەم چەرخە بەنێرو مێیانەوە، پەیڕەویی یاساكانی ئیسلام ناكەن، لەوەش زیاتر دژیان ئەوەستن‌و دوژمنایەتییان لەگەڵدا ئەكەن، بەتایبەتی ئەوانەیان كە خۆیان بە "هاوچەرخ"و بە "ڕۆشنبیر" ئەزانن لەخوا یاخیی ئەبن، ئایا ئیسلام داوای ئەوەی لێكردوون؟، ئەگەر ئەوە بدەین بەكۆڵی ئیسلامداو ئەو بە كۆڵدادانەش ڕاست بێ، ئەوساش ئەتوانین خراپ جووڵانەوەی پیاوان لەگەڵ ژنەكانیاندا بدەین بە كۆڵی ئیسلامدا، بیرێك بكەنەوە خوشكەكانم!

جوان: دەی كە ئیسلام بەو ستەمانە ناڕازییە، ئەی بۆچی بەری پیاوان ناگرێت؟

دڵپاك: تا ئەو ڕادەیەش ساویلكەیی كەی جوانە، جوان خان؟هەق بەبێ دەسەڵات كەی دەستی ئەڕوات؟ جا بۆچی ئیسلام هیچ دەسەڵاتێكی هەیە لە دەستدا؟

## ئافرەت هاوژینی پیاوە، نەك بەندەی

نەشمین: ئەی ئیسلام بەپیاوان ئەڵێ، كە چۆن بن لەگەڵ ژنەكانیاندا؟

دڵپاك: وا دیارە یادەوەریت "الذاكرة" لاوازە، ئەی ئەوە نەبوو چەند یاسایەكی قورئانی‌و فەرموودەیەكی پێغەمبەرم ﷺبەنموونە بۆ هێنانەوە؟ جا ئەو یاساو فەرموودانە موسڵمان تێئەگەیەنێ كە ژنەكەی سوپەریەتی، هەروەك پیاوەكە سوپەرە بۆ ژنەكەی، نەنگ‌و شوورەیی یەكتر، ڕووتیی‌و پەنهانیی یەكتری ئەشارنەوە، تەنانەت ئیسلام پێشدەستیی داوەتەوە لای ژن، نەك پیاو، كە لەوەشا چاكە "فضل" بۆ ئافرەت ئەدرەوشێتەوە (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن). هێمنیی‌و ئارامیی دەروون‌و ناخی پیاو ئافرەت فرگەو مەنزڵیەتی،، ئاسوودەیی‌و دڵنیایی پیاو لە كن ژنەكەی خۆیدایە، واتە لە پاڵ كەسێكی تردا دەست ناكەون، (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا). (اليها) بەدەم ئەوەشەوە، زۆرانبازیی‌و كێشمەكێشمەو بە بەندەكردن كاری نێوان ئێوەو ژنەكانتان ئەی پیاوان، ئێوەو مێردەكانتان ئەی ئافرەتان، نییە، بەڵكو پەیوەندیی نێوانتان خۆشەویستی‌و بەزەیی بەیەكتردا هاتنەوەیە: (..وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً..).

جا خوشكەكانم، مەگەر پسپۆڕو زانایانی دەروونناسیی قووڵایی‌و كاریگەریی واتای (لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا) بزانن‌و بتوانن بەوردی لێی بكۆڵنەوە، ئەوا بە گرنگیی ئەو باسە ئەتبەنە جیهانێكی سەیرە!وە یان مەگەر زانایەكی زمانەوانیی، یاخود كۆمەڵناسیی واتای (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن) بزانن‌و هەست بە بەرزی ئاسۆی ڕۆشن‌و ورشەداری بكەن، نەك منو تۆی بەناو خوێندەوار.

باوكی بەسەزمان، شەو ئەخاتە سەر ڕۆژ، لەناوچاوی ئارەق ئەتكێ، تووشی دەیان شەڕەشەق‌و مەترسیی ئەبێت، زۆرانبازیی‌و گیانبازییەتی لەگەڵ ژیاندا، چونكە بژێویی ئەوێ بۆ خێزانەكەی، كارەسات‌و مەترسیی ڕووی تێئەكەن، چەرمەسەری‌و كۆسپ دێنە ڕێی، بەم هەمووەوە بەهەشت نە بەتەوقە سەریەوە، نە بە گلێنەی چاویەوە بەدی ناكرێت، كەچی دایك كە ئەوەندەش لە ئیسلامدا ماندوو نابێت بەهەشت لەژێر پێی ئەوایە، ئەی دایك ژنی پیاوێكی موسڵمان نییە؟

خوشكێ ئاخۆ تۆ بەوە ئەزانی

بەو موژدە بەرزەی ئەحمەد دركانی

كە بەهەشت لە ژێر پێی ئێوە دایە

ئای خودا چەندێ بەرزی خولقانی!!

سەرنج بدەن، پێغەمبەر ﷺ، تام و خۆشیی و چێژی ژیانی دنیای هەموو بە جارێکدا لەئافرەتی چاکدا کۆکردۆتەوە، نەك لە شتێکی تردا، کە ئەمەش ڕێزو شکۆی ئافرەت ئەگەیەنێتە لووتکەی بەرزیی: (ان الدنيا كلها متاع، وخير المتاع المرأة الصالحة). دەی بزانن ئایا ئیسلام ئافرەت ئەکاتە بەندەی پیاو؟، (خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي). واتا چاکترین موسڵمان ئەوەیانە لەگەڵ ژنەکەیا چاك بێت،، ئەوەتا ئەفەرموێ من لەهەمووتان بۆ ژنەکەم یا ژنەکانم چاکترم، دەی خۆ مامۆستاو سەرمەشقی موسڵمانان ئەبێ پێغەمبەر ﷺبێ. جا ئەمە لەکوێ و بە بەندەکردنی ئافرەت لەکوێ؟

بەرنامەیەك سەرچاوەی خەلقبوونی نێرو مێ بکاتەوە بەیەك، لە مافەکانی ژیاندا وەك یەك بەشیاویان ناو بەرێ، ئەو پەڕی ڕێزو بێگەردیی ئافرەت ڕەچاو بکات، بەهەشت لەژێر پێی ئافرەتدا نیشانی نێرو مێ بدات، کەی ڕەوایە کە بگوترێت، ئافرەت بە بەندەی پیاو دائەنێت؟

جوان: ئەگەر وەها بێت کە تۆ باسی ئەکەیت، ئافرەت لە پیاو زیاتر نەبێت کەمتر نییە. ئافرەت وەك پیاو سەربەستەو بەقەدەر یەك خاوەن ڕێزن، بەڵام ئەم ئیسلامەی کە تۆ باسی ئەکەیت، جۆرە ئیسلامێکی جیاوازە، لە هی خەڵك ناکات!

دڵپاك: خوشکێ "ڕۆشنبیر!" ئیسلام هەر یەك ئیسلامەو سەرچاوەکەشی قورئانەو سوننەت، جا نازانم کۆمەڵێك خەڵك ڕێگایەکی تەختی بێ کۆسپ لەبەر دەمیا بێت، کەچی لێی لا بدات و لە کوێرە ڕێگای پڕ لە کۆسپ و دڕك و داڵەوە بڕوا، تۆ ئەو کاتە ڕاستە گەر بڵێیت، ڕێگاکە ترازاوەو لایداوە؟

جوان: نەخێر ڕاست نییە، چونکە خەڵکەکە ترازاوەو لای داوە، بەڵام ئەو هەموو خەڵکەش بەئێمە ناخرێتەوە سەر ڕێگاو پێمان چاك ناکرێت.

دڵپاك: خەڵك کێیە؟ من و تۆو ئەم و ئەو نین؟ ئەی ڕۆشنبیرو پێشەنگی کاروانی شارستانییەت ئێمە مانان نین؟ باشە، ئەی بەکێ خەڵك چاك بکرێت؟ دەی کە ئەزانین خەڵکمان پێ چاك ناکرێت، ئەی بۆچی هەوڵی خراپکردنی بدەین، ئاخر بۆچی؟ هەر هیچ نەبێت با خۆمان چاك بکەین و لەخۆمانەوە دەست پێبکەین، کێ ئەڵێت کە خەڵك بەئێمە چاك ناکرێت؟ ئایا تاقیمان کردۆتەوە؟ بەندە ئەو کەسانەن کە بەبێ بیرکردنەوە ئەکەونە دوای قسەی خەڵك، خوشکە بەڕێزەکانم.

سکاڵا: ئح، جوان خان، پەرداخێ ئاوت بۆ ئەهێنم؟

دڵپاك: تکات لێ ئەکەم خوشکە سکاڵا، تکای خوشك لەخوشکی گەورەی خۆی.

## ئیسلام مرۆڤ ئەدوێنێ، نەك پیاو

نەشمین: دڵپاك خان، ئەگەر پێت گران نەبێت و زویر نەبیت، ئیسلام لە فەرمانەکانیدا ڕوو ئەکاتە پیاوو هەر پیاو ئەدوێنێ نەك ئافرەت، هەر وەك بڵێیت تەنیا ئایینی پیاوە، ئایا ئەوە بەڵگەی تەماشاکردنی ئافرەت بەبێ نرخیی نییە؟

سکاڵا: دەی خۆ ئەمە قسەکەی (هەڵکەوت)ە کە شەوەکەی پێوە کوشت.

دڵپاك: سکاڵا خان، لەسەر خۆبە، قەیدی چی ئەکات، هی هەر کەس بێت گرنگ نییە، هەموو کەسێ بۆی هەیە لە کەسانی ترەوە شت فێر بێت، ئەی کاتی خۆی کە ئێمە چووینە قوتابخانە هیچمان ئەزانی؟ لە مامۆستاکانمانەوە فێر نەبووین؟، بەڵام لێرەدا شتەکە خۆی دیارە، ئەی نەشمین خان خۆی ددانی پیادا نەنا کە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری ﷺنەخوێندووەو نەخوێندۆتەوە؟ کەواتە ئەپرسین: بەچیدا ئەزانێ کە فەرمانەکانی ئیسلام بەتەنها پیاو ئەدوێنێ؟

ئاواز: بەڵام لەهەر لایەکەوە فێر بووبێت، ئەوەیان گرنگ نییە دڵپاك.

دڵپاك: چاوەکەم، ئەوەی دیراسەی ئیسلامیی کردبێت و شارەزاییەکی ئەوتۆی هەبێت، زۆر چاك ئەزانێت کە زۆربەی بانگەوازە سەرەکییەکانی ئیسلام، لە فەرمان و پیادادان و لە نەهیکردندا بەمجۆرە ئاراستە کراون "يأأيها الناس، يا أيها الأنسان، يأأيها الذين آمنوا". ئەم بانگەوازانەش تایبەت نین بۆ پیاوان بە تەنها، بەڵکو دەنگدانەوەی ماناکانیان زۆر فراوانەو نێرو مێ ئەگرێتەوە وەکو یەك، وشەی (الناس، الانسان) و سیفەتی ئیمانداریی بۆ هەردوو لایانە، نەك پیاو بە

تەنها، لە فەرهەنگی ئیسلامدا (خەڵك، مرۆڤ، باوەڕدار)، بەنێرو مێ ئەوترێ، ئەی هەڵبەت ئێوە ئافرەت، بە (خەڵك، بە مرۆڤ، باوەڕدار)، دانانێن!

خۆ ئەگەر کەسێك، لەلای زمانەوانێکدا بڵێت: وشەی "الناس، الانسان"، بە پیاوان ئەگوترێت بەتەنیا، ئافرەت لەو وشانەداجێی نابێتەوە، ئەگەر ئەو زمانەوانە دەسەڵاتی ببێت، دەمی ئەو کەسە دائەخات، چونکە بەلای ئەوەوە گەورەترین هەڵەی زمانیی کردووە، ئەو وشانە لە عەرەبییدا بۆ جۆر (النوع)، نەك بۆ ڕەگەز (الجنس) بەکار دێن، دیارە ژن و پیاو بەهەردووکیان ئەوترێت جۆر، نەك بە تەنیا، کە جیایان بکەینەوە ئەوا جۆر ئەبێت بە ڕەگەز زاناکانی زمان ئەمەیان بەوردیی شیکردۆتەوە.

جەماوەری زانایان و تەفسیرکەران سەبارەت بە دەقە قورئانییەکان لەسەر ئەم ڕایە ڕێککەوتوون کە هەرچی دوواندن (خطاب)ێك لە قورئاندا هاتووەو ئاراستەی باوەڕداران و موسڵمانان کراوە لەئیشو کارو لایەنە جیاوازەکاندا، چ بەشێوازی تاکی نێرو چ بەشێوازی کۆی نێر، دەربارەی ئەرك سپاردن، ماف، کارە گشتییەکان، ئافرەتیش ئەگرنەوە، سا مەگەر قەرینەیەکی دیاری پێکەری تێدا بێت، ئەگینا ئەوانی تر ئافرەت و پیاو وەك یەك ئەگرنەوە.

ئەوەش بەجۆرو شێوەیەکی وەهایە کە وتراوە: "هەموو پێویست کراوێك لەسەر موسڵمانان، کە مۆڵەت یان چاو لێپۆشینی تیا بێت، یاخۆ سنووری بۆ دانرا بێت، یان یاساغ کرابێت لێیان، یان ڕەوا کرابێت بۆیان، یان داوایان لێکرابێت، یان وریا کرابنەوە بۆی، یان لەپێناویدا هەڕەشەیان لێ کرابێت، یان سەرنجیان ڕابکێشێ بۆی، وەك سەرنج ڕاکێشان بۆ بەڵگەو ئایەتەکانی خوا بۆ لێتێگەیشتن و زانین و جێبەجێکردنی ناوەڕۆکەکانیان، لە ئەرك و پێسپاردنی ئەرکەکانی پەرستش و سامانیی و لاشەیی، لەمافەکان و ئەو شتانەی کە ڕەوا، یان قەدەغە کراون و ئەو شتانەی بەمانەوە بەستراون، لە ئاداب و ڕەوشت و هەڵوێستی تاکیی و کۆمەڵایەتیی، هەر ئەنجامێکی سەلبیی یان ئیجابی کە پەیدا ئەبێت لێیانەوە، لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا پیاوو ئافرەت وەك یەك، بەبێ هیچ جیاوازیی و جیاکردنەوەیەك ئەگرێتەوە، ئایە خوشکەکانم ئێوە چەند لەسەر ڕێ ترازێنراون!"[1].

پرشنگ: من ئەمەوێ بە بەڵگەی ژیریی، واتە عەقڵیی ئەوەم بۆ بسەلمێنی.

دڵپاك: ئەی ئەوە کە باسمان کرد لەگەڵ ژیریی و ژیربێژی "المنطق"دا چ لێکدان و دژایەتییەك پەیدا ئەکات؟ گوایە لەوە ژیربێژیی تر هەیە؟

نەشمین: باسەکە قورس و قووڵ بوو، ئێمەش داوای بەڵگەی عەقڵیت لێ ئەکەین.

دڵپاك: وای دابنێن تۆ لەپۆلی شەشەمدا، کە (٣٠) قوتابیی بن، پانزە کوڕو پانزە کچ، وەرزشیان پێ ئەکەن، ئایا بەمجۆرە لەگەڵیاندا دەدوێی: کوڕان و کچان، پشوو بدەن، کوڕان و کچان وریا بن، کوڕان و کچان دەست بۆ سەرەوە، کوڕان و کچان دەست بۆ دواوە.. هتد؟

نەشمین: های.. های!! ناوەڵڵا هەرگیز وا ناڵێم، ئەڵێم: پۆلی شەشەم، پشوو بدەن، وریابن، دەست بۆ سەرەوە، دەست بۆ دواوە.. هتد.

دڵپاك: دەی هەروەکو وشەی پۆلی شەشەم، کوڕو کچەکان ئەگرێتەوە، هەر بەو جۆرەش فەرمان و نەهییەکانی ئیسلام نێرو مێ لەمرۆڤدا ئەگرنەوە، ئەی ئەمە بەڵگەی ژیریی نییە؟ هەر خۆمان لەواقیعیی خۆماندا بەجێی ناهێنین؟

نەشمین: ئێستا قایل بووم و لەو ڕووەوە قسەم نەما.

دڵپاك: قایل ببی یان نەبی، قورئان مرۆڤ ئەدوێنێ، ئەمەش حەقیقەتێکی گەورەیە لە حەقیقەتە گەورەکانی قورئان، هیچ خەوش و تەم و مژێکی پێوە نییە، شاردنەوەی تێدا نییە، ئەو ئایەتە قورئانییانەی لەم ڕووەوەن زۆرو زەبەندەن و بە ناو سورەتەکاندا بڵاوبوونەتەوە.

[1] المرأة في القرآن والسنة/ محمد عزة دروزه ل ٣٢ ـ ٣٩.

هەروەها جەماوەری زانایان‌و تەفسیرکەران، دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ، هەروەك دەربارەی دەقە قورئانییەکان، ڕێککەوتوون‌و هەمان ڕایان هەیە، هەزارەها فەرموودەش هەیە کە ئەمەی بەسەردا ئەچەسپێت، لە باوەڕو زانیاریی‌و لەخوا ترسان‌و خۆ پاك ڕاگرتن‌و ڕۆژوو زەکات‌و حەج کردن‌و خواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك‌و ڕەوشت‌و لایەنەکانی تردا.

خوشکەکانم، ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئیسلام بۆ مرۆڤ بەهەدوو لقەکانییەوە . نێرو مێ . هاتووەو فەرمان‌و بانگەوازەکانی بە گشتی بۆ ئادەمیزادن‌و ئاراستەی نێرو مێ کراون، نەك پیاو بەتەنها، جگە لەو شوێنانەدا کە وا پێویستکراوە یەکە یەکە بیاندوێنێ، ئەوانەش جیان‌و بەئاسانیی لە دەقەکانیی تر جیا ئەکرێنەوە، لەمەوە ئەگەینە ئەوە کە وشەی بێ نرخیی بۆ ئافرەت لە فەرهەنگیی ئیسلامدا نەبووەو نییەو هەرگیز ناشبێت، جا نازانم ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان بۆ سەلماندنی داواکەتان بەدەستەوە هەیە؟ فەرموون، ئەوا گوێتان بۆ شل ئەکەم، بیڵێن.

نەشمین: جا من کەی تاقەتی ئەوەم بووە بگەڕێم بەدوای بەڵگەدا، لە خەڵکم بیستووە، هەڵبەت ئەو خەڵکەش شتێکی لێ ئەزانێ، من چوزانم!

ئاواز: ئەی ئەو خەڵکەی کە ئەو قسەیە ئەکەن قابیلە لەسەر بنەڕەتێ نەیکەن؟

دڵپاك: خوشکە گیان، با تەماشای دەمی خەڵکی نەکەین، بەتایبەتی لەکاروباری ئایینەکەماندا، با تەماشای قورئان‌و سوننەت‌و تەفسیرو شیکردنەوەی واتاکانیان بکەین، ئێمە خەڵك بەخوێندەوارو ڕۆشنبیرمان ئەزانێ، با ڕێزی خۆمان بگرین، هەرچییەك کە بەدەم خەڵکەوە ئەیبیستین مەرج نییە ڕاست‌و خاوەن بنەڕەت بێ، باشە درۆیەکی نیسان کە بەدەم خەڵکەوە ئەیبیستین، چ ڕاستییەکی تێدایە؟ بنەڕەتەکەی کامەیە؟ ئەگەر هەشیبێت؟ ئایا چاکە یان خراپ؟

سکاڵا: جا ئەگەر ئێمە ئەوەندە ورد بووینایەو بەو جۆرە بیرمان بکردایەتەوە، مێشك‌و گوزەرانمان وەك ئێستا ئەبوو؟!!

## باوەڕو ژیری ئافرەت ناتەواو نین

جوان: خەڵك چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئەگێڕێتەوە، گوایە باوەڕو ژیری‌و ڕفتار "سلوك"ی ئافرەت ناتەواون، من ئەو فەرموودانەم لەبەر نییە، ئایا ئەوەش هێنانە خوارەوەی ئافرەت نییە؟

دڵپاك: جارێ (ش)ی ئیزافەکەت بە هەڵە بەکارهێناو لەجێی خۆیا دات نەنا، بەڵێ هەندێ فەرموودە لەو ڕووەوە هەن، بەڵام خەڵك نازانێ بە لێزانیی‌و بەوردیی شیتەڵیان بکاتەوەو ناوەڕۆکەکەیان دەربێنێ، ئینجا ناحەزانی ئیسلام بۆ مەبەستە جۆر بەجۆرەکانی خۆیان ئەو فەرموودانەیان بە هەڵەداوێنی خستە بازاڕەوەو بەوپەڕی جادوکارییەوە شتیان بۆ زیاد کردن‌و ڕەواج‌و برەویان پێدان‌و گەیاندیانە گوێی هەموو کەسێك، تا بەو هۆیەوە ئافرەتان، بەتایبەتیی ڕۆشنبیرە هاوچەرخییەکان لەئیسلام بسڵەمێننەوە.

قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، بڕیاری شیاویی ئافرەتیان لە هەموو ئەرك‌و پێ سپاردنێکی باوەڕداریی، کۆمەڵایەتیی، پەرستشیی، دارایی، تا ئەگاتە سەر جیهادو ڕەوشت، لە دەقە یاساییەکاندا بڕیار داوە، بەبێئەوەی لەوەدا جیاوازیی‌و جیاکردنەوە لە نێوان ژن‌و پیاودا، واتە، نێرو مێدا هەبێت، هەروەها قورئان‌و فەرموودەکان ژنیان هەروەك پیاو لە دونیاو دواڕۆژدا داناوەو بەرپرسیاریان کردووە بەرامبەر کردەوەکانی دنیای، ئەوەش هاوسانییە لەگەڵ پیاودا، ئەمانەش هەموو بە جارێکا هاوار ئەکەن‌و ئەڵێن: "بەرپرسیاریی عەقڵ تەواو هاوسان نابێت لەگەڵ بەرپرسیاریی کەسێکدا کە عەقڵ ناتەواو بێت".

سکاڵا: واتە مادام ئیسلام ئەرك‌و بەرپرسیاریی ژن‌و پیاوی وەك یەك داناوە، ژیری نایگرێت کە ئافرەت بەناتەواو ناوبەرێت، چونکە ئەگەر بە عەقڵ ناتەواو ئافرەت دابنێت، عەقڵ نایگرێت کە ئەرك‌و بەرپرسیاریی تەواوی وەك هی پیاو بدات بەسەرا.

پرشنگ: ئەها دیتان (سکاڵا)ش بووە بەنیمچە مامۆستایەك بۆ خۆی!

دڵپاك: ئافەرین خوشكە سكاڵا.. ئافەرین، بەڕاستیی جوانی بۆ چوویت، بەڵێ، بەپێی ژیربێژی ئەركی سەرشانی ژیرو ناژیر، یاخۆ نیمچە ژیر وەك یەك بێن، ئەگەر بێن هەڵەو نەگونجاوە، ئیسلامیش ئایینی خوایە، ئایینی خوایش لە هەڵە دوورەو نابێ هەڵەی تێدا بێت.

بەڵگەی تریشمان هەیە، ئیسلام بەشە میراتی بۆ ئافرەت دیاریكردووەو ئەبێ بیدرێتێ، مارەیی بۆ ڕەوا كردووەو ئەبێ بیدرێتێ، هەر بە یاسای ئیسلام سەربەستیی تەواو هەیە كە دەس بخاتە سامانیی خۆیەوە، سا ئەو سامانە هەرچەندو هەر جۆرێ بێ، بەبێئەوەی مۆڵەت لە مێردەكەی وەربگیرێ یان بەبێئەوەی مێردەكەی بتوانێ قەدەغەی بكات، بەڵكو خۆی بۆ خۆی ئەتوانێ، بكڕێت، بفرۆشێت، زەوی‌و زاری ببێ، خانووی ببێ، بەندە بكڕێت، بچێنێ، بدروێتەوە، قەرز بكات، یان بدات، ببەخشێ، دیاری وەربگرێت، وەسیەت بكات، وەسیەت وەربگرێ، بەكرێ بگرێ، بەندە ئازاد بكات، پەنای ناموسڵمان بدات، بەمەرجێ لەسنووری ئیسلام لەوەدا دەرنەچێت، ئایا ئەوە هەمووی بە عەقڵ ناتەواو ئەكرێت یان ئەسپێررێت؟ ئەی ئەو پایە بەرزە لەلایەن ئیسلامەوە بەئافرەت نەدراوە؟ كە ئیسلام خۆی ئەوەی بە ئافرەت سپاردووە چۆن بەناتەواوی دائەنێت؟

لەوەش زیاتر ئیسلام، كاری ئافرەتی داوەتە دەست ئافرەت خۆی، ئەوەتا ئەگەر كاڵ‌و كرچ "قاصرة" نەبێت، بۆی هەیە خۆی بدا بەشوو، لای مێردەكەی دانەنیشێ، یان لەدوای ناكۆكیی ئاشت ببێتەوەو بچێتەوە لای، تەنانەت ڕێگەی دراوەتێ كە دەمەدەمێ "المجادلة" لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بكات.

دیسان، هەرچی كە لەسەر پیاو لە ئیسلامدا پێویستكراوە، لەسەر ئافرەتیش كراوەو ئیسلام وای داناوە كە باوەڕداران بەمێ‌و نێریانەوە یارو دۆست‌و هاوكاری یەكترن‌و لەیەكترن، خوا بەیەك شێوە لەگەڵ یەكدا ناوی بردوون، پێكەوە وەك یەك دواندوونی، لە هەر لایەكیشدا پێویستی كردبێت لە شێوەیەكی تایبەتییدا دواندنی ئاراستە كردون: (وَالْمُسْلِمَاتِ، وَالْمُؤْمِنَاتِ، وَالْقَانِتَاتِ، وَالصَّادِقَاتِ، وَالصَّابِرَاتِ، وَالْخَاشِعَاتِ، وَالْمُتَصَدِّقَاتِ، وَالصَّائِمَاتِ، وَالْحَافِظَاتِ..). ئایینێ كە بەم جۆرە لەگەڵ ئافرەتدا بجووڵێتەوە، چۆن بەناتەواوی دادەنێت؟

سكاڵا: وەڵامەكەت هەڵبەت لای (جوان) خۆی متداوە، من چوزانم.

دڵپاك: جگە لەوەش، وەك باسم كرد بۆتان، ئیسلام ددانی بە كەسایەتیی ئافرەتدا ناوە لە چوارچێوەی دەوڵەتدا، تەنانەت بەسەربەخۆ، بێ پیاوەكەی پەیمانی موسڵمانبوونی لێوەرئەگیرێت، ئیسلام پێویستی كردووە لەسەری كە فەرمان بە چاكە بكات، نەهیی لەخراپە بكات، هاوكاریی پیاو بێت لەهەموو كارێكی چاك‌و چاكخوازییدا، لەخوا ترسان، بەزەیی پیادا هاتنەوە، حەق‌و ئارامگرتندا. ئایا ئەم هەموو یاساو ڕێبازانەی هەروا بەكوێرانە داناوە؟ حاشا.. حاشا. ئیسلام لەوەوە دوورە، گیانی ئیسلام زۆر لەوە بەرزتر، پاكترو بێگەردترە، كە كاری هەڵەو كوێرانە بێت[1].

ئاواز: بەڵام تۆ خۆتت گوت بەڵێ، هەندێ فەرموودە لەو ڕووەوە هەن.

دڵپاك: ئەوەم چاك لەبیرەو نەشم ئەویست لە بیری خۆمی بەرمەوە، ئەو تێنەگەیشتووانە كردوویانن بەداردەستی خۆیان، حوكمەكەیان گشتیی نییە، بەڵكو حوكمەكەیان تایبەتییە بەهەندێ ئافرەتەوەو لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیی ئافرەتدا. ئەگەر تەماشای پەڕاوە فیقهییەكان بەوردیی بكەین، وەها ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕۆشن ئەبێتەوە كە گومان لە دڵ‌و مێشكماندا هەرگیز جێی نەبێتەوەو قسەی ناحەزانیش بەتەواوەتیی پووچەڵ ببێتەوە.

نەشمین: لەڕاستییدا، ئەگەر ئیسلام ئا بەمجۆرە بێت كە تۆ باسی ئەكەی بۆمان، جوانترین‌و پاكترین بەرنامەی ژیانە بۆ ئادەمیزاد بەگشتیی‌و بۆ ئافرەت بەتایبەتی، بەڵام دڵپاك خان، ئەی بۆ چ پەیڕەویی ناكرێت؟ بۆچی خراوەتە پشت كەنوو و هەركەسیش هەڵئەسێت لەقەیەكی لێئەدات، بەبێئەوەی هیچ كەسێك بێتە دەنگ لەسەری؟!

---

[1] ئەم باسە بەدرێژی لە "المرأة في القرآن والسنة"ی (محمد عزه دروزه)دایە، لاپەڕە ٤٥ ـ ٤٨.

دڵپاك: خوشكە بەڕێزەكەم، ئیسلام زۆر لەوە فراوانترە، بەرزترو قووڵترە كە بە من باس بكرێت، ئەوەی كە ئەیلێم چەند پرش "شذرات"ێكە لە ئیسلام، نەك ئیسلام خۆی، ئەتوانم بلێم چەند دڵۆپەیەكە لە دەریایەكی هەڵئەگۆزم بۆتان، چ بكەم هەر ئەوەندەی لێ ئەزانم و توانام هەر ئەوەندەیە!

پرسیارەكانی ترت، پێویستییان بە باسێكی دوورو درێژ هەیەو ئێستاش كاتی ئەوەمان نییە، هیوادارم ڕۆژێ لەڕۆژان ئەوەندە تێ بگەیت كە بتوانی خۆت وەڵامی خۆت بدەیتەوە، ئێوەی ڕۆشنبیریش مادام ئەپرسن و بەدوای وەڵامی پرسیارەكانیشتاندا ئەگەڕێن، خوا یاربێ هەر تێئەگەن.

سكاڵا: سەیر لەوەدایە ئێمەی بەچكە موسڵمان ئا بەم جۆرە دژی ئیسلام ئەوەستین.

دڵپاك: ئەوەش هەر سەیر نییە، چونكە ئەگەر ئیسلام بناسین ئەوسا دژی ناوەستین، پەندێكی عەرەبیی ئەڵێت: "الانسان عدو لكل ما جهله"، واتە: ئادەمیزاد دوژمنی ئەو شتەیە كە نایزانێ، دیارە بەزانین و ناسینیی ئەو شتە دوژمنایەتییەكە ئەبڕێتەوە، لەوانەیە دۆستایەتیی جێی بگرێتەوە.

# بەشی هەشتەم

## هەردووکیان بەرپرسیارن

دڵپاك: ئەمشەو لە خەویشدا، وام ئەزانی پرسیارم لێ ئەکەن هەروەك ڕۆژ.

جوان: لێمان ببورە، دوێنێ شەو زۆر ماندوومان کردیت، تووشی سەرئێشەمان کردی، ئەها شەویش مێشکت شریتەکەی لێداوەتەوە!

دڵپاك: لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ خۆم بە بەختیار ئەزانم، کە لەگەڵ چەند خوشکێکی ڕۆشنبیری وەك ئێوەدا بکەومە گفتوگۆو باسی ئیسلامیان بۆ بکەم، یاخوا بەخێربێن، سوپاستان ئەکەم کە گوێتان بۆ گرتم لە کاتی وەڵامدانەوەدا، خوا یار بێت باسەکەمان ڕەنگدانەوەیەکی گەرم و گوڕو بەرهەمێکی ئەوتۆی ئەبێت.

نەشمین: دڵپاك خان، ئەڵێن ئافرەت بەپێی بۆ ڕوانیینی ئیسلام هەر لەبنەڕەتدا تاوانبارە، چونکە یەکەمین جار شەیتان لە بە هەشتا دایکە حەوای هەڵخەڵەتاند، ئەمیش باوکە ئادەمی هەڵخەڵەتاند، واتا بنپەرگی تاوانەکە لە ئافرەتەوە دەستی پێکردووە، جا بەهۆی ئەوەوە ئیسلام ئافرەت بەتاوانبار ئەزانێت.

ئاواز: ئەی.. ئەی، لەقورئاندا لەچەند لاوە باسی ئەو هەڵخەڵەتاندنەی کردووە.

دڵپاك: خوشکەکانم، ددانی پیادا ئەنێم کە کوفر لە داتاشینی درۆو دەلەسەو لەهونەری ئارایشدانیاندا کارامەو دەست ڕەنگینە، درۆو ساختە وەها لێ ئەکات و وای ئەڕازێنێتەوە کە نەزان و تەنانەت هەندێ مرۆڤی زانای دڵپاك بەڕاست و ڕەوانی ئەزانن و باوەڕی پێئەکەن، ئەو سەرگوزشتەیە، بەم باس و شێوە هەڵەیە لە ئیسلامدا نەبووەو نییە، ئەڵێن ئەمە لە "تەورات"دا هەیە، بەڵام تەوراتی ڕاستەقینەی یەکەم نا، بەڵکو تەوراتی دەستکاریکراو، تەوراتی گۆڕاو! ئەم قسەیە هی جوولەکەکانەو ئێوە ئەیکەن بەهی ئیسلام.

سکاڵا: نەشمین، خۆ ئەوە (هەڵکەوت) بۆ مەعلوومات نەك وەك ڕەخنە بۆی گێراینەوە.

نەشمین: ئەوە چیتە سکاڵا؟ بۆچی تۆ گرتووتە بە هەڵکەوتەوە؟

دڵپاك: تکاتان لێ ئەکەم واز لە هەندێ گاڵتەو تیرو توانج تێگرتن بێنن. باسی بەهەشت و ئادەم و حەواو پەندەکەی شەیتان لە قورئاندا، لەگەلێ شوێندا هاتووە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە ئێوە بیستووتانە، بۆ نموونە: لە یاسای ژمارە (٣٦)ی سورەتی (البقرة)دا، سەرەتای ڕووداوەکە بەمجۆرەیە: (وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ* فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ..). جا با سەرنج بدەین لە باسەکە.

"فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ، فَأَخْرَجَهُمَا" شەیتان کێی فریو داو کێی دەرکرد؟

پرشنگ: مەبەستەکە دیارو ڕوونە، ئادەم و ژنەکەی فریو داو دەری کردن، ئەها ڕاناوە لکاوەکە (هما) هەردووکیان نیشان ئەدات.

دڵپاك: لە یاسای ژمارە (١٩ ـ ٢٠)ی سورەتی (الاعراف)دا ئەفەرمویّت: (وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ* فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ).

دەی پێم بڵێن، ئادەمو حەوا کامیان ئەویتریانی هەڵخەڵەتاند؟

نەشمین: هیچ کامیان ئەوی تریانی هەڵنەخەڵەتاندووە، بەڵکو شەیتان ئادەمو حەوای وەك یەك فریوداوە، خۆ باسەکە وەك پرشنگ وتی: :زۆر ئاشکراو دیارە لەشتەکەدا''، ئادەمو حەوا پێکەوەن‌و جیانەکراونەتەوە، ئەها (فوسوف، لهما، لیبدي لهما، ماوری عنهما، سواتهما، نهاکما، ربکما، تکونا، ملکین، تکونا) لە هەموویاندا ڕاناوی (هما) یان (کما)یەو دووان دەرئەخات.

دڵپاك: دەی خۆ ئەگەر زیاتر لەسەر مەسەلەکە بڕۆین‌و لە خزمەتی قورئاندا بین، ئەگەینە سورەتی (طه) کە ئەفەرمویّت: (فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى* فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى). دەی خوشکەکانم، سەرنجی قورئان بدەن‌و ئەمجا بیر بکەنەوە لەو قسانەی‌کە ئەیاندەن بەگوێتاندا، فەرموو بزانن یەکەمجار شەیتان ڕووی کردە کێ لەبەزمەکەدا؟ ئەمجا کێ بەری دارەکەی خوارد؟ کێ لەخوا یاخی بوو بەپێی دەقە قورئانییەکە؟ ئادەی جوان خان

جوان: بەپێی دەقە قورئانییەکە یەکەمجار شەیتان خوڵکی ئادەمی کرد: (فوسوس الیە، قال یا ادم)، ئەمجا ئادەمو حەوا پێکەوە لێیان خوارد، بەڵام یاخی بوونەکە دراوەتە پاڵ ئادەم، نەك حەوا، (وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى)[1].

دڵپاك: دەی لە ئەنجامی باسەکەوە چیمان بۆ ڕۆشن بوەوە جوان خان؟

جوان: ئەگەینە ئەو ڕاستییە: ئافرەت لە ئیسلامدا، لە سەرەتاوە تاوانبار نییەو لەگەڵ پیاودا وەکو یەکن، چیرۆکی تاوانباریی ئافرەت بەهۆی هەڵەی دایکە حەواوە چیرۆکێکی دروست کراوەو هیچ ڕەگو ڕیشەیەکی نییە، پیاوو ئافرەت لە بەرپرسیاریی فریودانەکەدا وەك یەکن‌و هاوسانن.

## با لەڕێزمانەوە بۆی بڕۆین

دڵپاك: حەز ئەکەم جارێکی تر لەڕووی ڕێزمانەوە، ئەو باسە بخەینەوە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە، تا چاك دڵنیایی وەدەس بێنن.

سکاڵا: من بەوە زۆر دڵشادم، فەرموو.. فەرموو، با فێری ڕێزمانیش ببین.

پرشنگ: ئۆی کەڕقم لەڕێزمانە! هەمیشە گیرم خواردبوو بەدەستییەوە.

جوان: بەخوا دڵپاك خان، منیش لە عەرەبییدا، بەتایبەتیی ڕێزمان کۆڵم.

دڵپاك: بابەتەکەی ئێمەش ئەوەندە قورس نییە، لەڕاناوە لکاوەکان لانادەین.

(دڵپاك ئایەتەکانی پێشووی لە پەڕەیەکدا نووسییەوەو نیشانیدان، ئەمجا کەوتە پرسیار کردن، بەمجۆرە).

دڵپاك: ئەو ڕاناوە لکاوانەی کە دەیانبینین، کە لکاون بە (ناو، فرمان، ئامراز)ەکانەوە، لە حاڵەتی ئەرێ‌و نەرێ "اثبات و نفي"دا کام لەم سیانەیە: تاك، جووت، کۆ؟ ئەها، چاك تەماشایان کەن (کلا، شئتما، لا تقربا، فتکونا، فأزلهما، فأخرجهما، کانا، لهما، عنهما، سواتهما، ما نهاکما، تکونا).

نەشمین: ڕاناوەکان هەموویان بۆ جووت بەکار هێنراون.

دڵپاك: ڕاستە، بەڵام چی ئەوە ـ واتە جووت ـ ئەنوێنێ؟

سکاڵا: پێی ئەوترێت (الف الاثنین)، ئەمجا (هما، کما، تما) ئەینوێنن.

[1] بۆ ئەم باسە تەماشای "المرأه فی القران"ی عەباس عەققاد بکە.

دڵپاك: زۆر ڕاستە، ئاواز خان، بۆ چی دەنگت نایەت؟ ئەو ڕاناوەی کە بۆ جووت لەم ئایەتەدا هاتووە، جێی کێیان گرتۆتەوە؟

ئاواز: بێگومان جێی ئادەمو حەوایان گرتۆتەوە، واتە ئادەمو ژنەکەی.

دڵپاك: ڕاستە، دەی ئەگەر مانای (وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ)، بدەینەوە، بەپێی ئەوە کامیان لەپێشەوە چوون بۆ بەهەشت؟

نەشمین: هەردووکیان پێکەوە چوون، چونکە (و) لە عەرەبییدا کە پێی ئەوترێت (حرف عطف) بۆتەرتیبە نەك تەعقیب، یان تێپەڕبوونی کات لە کارەکەدا.

دڵپاك: ئەی دەست خۆش! ئەی لە فەرمانو نەهییەکەدا "کلا، شئتما، فتکونا، ولا تقربا.."، هیچ جۆرە جیاوازییەك بەدی ئەکرێت؟

ئاواز: نەخێر، هەردووکیان لەهەردوو حاڵەتەکەدا کتومت وەك یەکن، لە هەموو سەرێکەوە وەك یەك بەشدارن بەبێ جیاوازیی.

دڵپاك: لەوشەی (فأخرجهما)دا چی بەدی ئەکرێت جوان خان؟

جوان: زەق زەق دیارە کە ئادەمو حەوای پێکەوە لە بەهەشتدا کردە دەرەوە.

دڵپاك: ئایا بەتەنیا حەوای ئافرەت فەرمانەکەی خوای فەرامۆش کرد.

سکاڵا: نەخێر.. نەخێر، ئەها ئەڵێت (فأزلهما، فأكلامنها). هەردووکیان وەك یەك فەرامۆشیان کرد، ئەگەر تەنها دایکە حەوا بووایە ئایەتەکە ئەیگوت (فأزلها، فأكلت منها).

دڵپاك: دەی ڕاستە بگوترێ ئیسلام ئافرەت لەبنەڕەتدا بەتاوانیار دائەنێت؟

نەشمین: ئایەتەکان وا نینو ئەوەش نیشان نادەن، ئیتر چۆن بڵێم بەڵێ؟

سکاڵا: کەواتە ئەم بوختانەش ئەخرێتە ناو تەنەکەی بوختانەکانی ترەوە.

دڵپاك: دەی خوشکە شیرینەکانم، با چاك تێبگەن کە بوختان ئێجگار زۆرن نابێ هەرچیتان پێگوترا، یەکسەر بەنرخی ڕاستیی بیقۆزنەوە، وا چاکە ئادەمیزاد بەسەرنجو ورردبین بێت، بیری سەربەست بێت، تا لەڕاستی شتێك دڵنیا نەبێت وەری نەگرێتو بەکاری نەهێنێ.

ئادەمو حەوا پێکەوە لەبەری درەختەکەیان خوارد، هەردووکیان وەك یەك کەلو پەلەکانیان دەرکەوت، یەك کات، یەك بابەتو دانراو، یەك ئەنجام هەردووکیان وەك یەك کۆ ئەکاتەوە، ئیتر کوا باسی تاوانباریی ئافرەت کراوە؟

بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین کە تاوان کراون لە ئیسلامدا مرۆڤ ناخاتە بەر لەعەنەتی هەمیشەیی، چونکە دەروازەی لێبوردنی خوا هەمیشە وازە، ئادەمو حەوایش لەخوای گەورە پاڕانەوە، ددانیان بەهەڵەی خۆیاندا نا، خوای گەورەو میهرەبانیش لێیان خۆش بوو، هەردووکیانی لە بەهەشتەوە گواستەوە بۆ سەر زەوییو کردنی بە جێنشینی خۆی تیایدا هەتا ئاوەدانی بکەنەوە، ئەها قورئان ئەفەرموێ: (قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (الأعراف: ٢٣). ئەها هەردووکیان پێکەوە وەك یەك ئەپاڕێنەوە لە خوا! دوایییش خوا هەروا بەرەڵڵای نەکردنە سەرزەوییی و ڕێنموونیی خۆی بۆ ناردن، هەتا بزانن چۆن بژین، ئەوەتا ئێمەش کە ڕۆڵەی ئەوانین بەبێ ڕانماییکەر خوا نەیهێشتووینەتەوە، (..فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى) (طه: ١٢٣).

خوشکێ، تۆو پیاو لە نەفسێك خولقان

هەردوو پێکەوە بۆ بەهەشت بران

لەیەك سەرچاوە هەردوو دوێنران

کە هەڵەش ڕوویدا وەکو یەك دۆڕان

سکاڵا: ئاە! بەڕاستیی چاك مێشکمانیان تێکداوە، بەڵام..

# چەند ژنێتیی

جوان: خوشکە دڵپاك، بەڕاستی ڕاستەو ڕوویی‌و کراوەییت تێدا ئێجگار زۆرە! لەبەر ئەوە توخوا با دڵی خۆمت بۆ بکەمەوە، پرسیارێك لەناو دڵما ماخۆلانیەتی، بۆچ بیشارمەوەو لە تۆی نەپرسم؟

دڵپاك: فەرموو خوشکە گیان بپرسە، پرسیارکردن زۆر بەکەڵکە، نەپرسیین بەڵگەی نەزانیی‌و کەمتەرخەمیی‌و نەفامییە، پووچەڵیی مێشك ئەنوێنێ.

جوان: بەپێی ئەو باسانەی کە بۆت کردین، ئیسلام بەرنامەیەکی پاك‌و شیاوو ناوازەیە بۆ ژیان، چونکە ئافرەت و پیاو بەمیوەی یەك لق دائەنێ، ڕێزی ئافرەتی بەلاوە پێویستەو کردوویەتی بە هاوشانی پیاو لەهەموو مافێکدا، کەچی نازانم چۆن ڕێگە بەپیاو ئەدات کە لەیەککاتدا بتوانێ چەند ژنێکی هەبێ؟ ئەوە کەی ئەگونجێ؟ کەی ڕاستە پیاو ئارەزووی چەند ژنی هەبێت بیان هێنێ؟ ئەی ئەوە پێشێلکردنی مافی ئافرەتی تێدا نییە؟ فەزڵی پیاو نادرێت بەسەر ئافرەتدا؟

ئاواز: باشە دڵپاك، ئەبێ ئەو ئیمتیازە بۆچی بدرێت بە پیاو؟ ئاخر لەسەر چ بنەڕەتێك؟ ئایا ژیریی ئەوە پەسەند ئەکات؟

دڵپاك: ئەی سەد ڕەحمەت لە گیانی ئەو کەسەی کە گوتوویەتی "ئادەمیزاد دژومنی ئەو شتەیە کە نایزانێ!" بەڕاستی قسەکەی زۆر بەمانایە، بەڵام ئەو هێرشانەی کە کردتن، نە قسەی خۆتانەو نە یەکەمین کۆمەڵن لە کردنیدا، شریتێکی کۆنەو ئێوەش لێی دەدەنەوە، کەچی وەهایش تێئەگەن کە شریتێکی تازە گیراوەو کەسی تر لێینەداوە، ئەم شریتە نەك بە هەزارەها، بەڵکو بە ملیۆنەها جار لێدراوەو بیستراوە، بەڵام بە کوێرانە، بە نەزانانە، بەبێتێگەیشتن و وردبوونەوە، ئای کە کورت بینیی‌و هەڵەشەیی دەردی پیسن و بەزەحمەت چارەسەر کراون! ئای کە زانین‌و تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەو حوکمدان لەسەر ئەو بنەڕەتە نیعمەتی چاکن!

من زۆر چاك ئەزانم کە ئێوە خۆتان پاك‌و دڵ سافن، ئەو ملە جیرەیەش کە بەمشێوەیە ئەیکەن تاوانی خۆتان نییە، بەڵکو تاوانی کۆمەڵێکی ترە کە توانیویەتی کار بکاتە سەر مێشکتان، بەهۆی چاکیی‌و دڵسافیتانەوە، بەڵام پاکیی‌و دڵسافییش تا ئەو ڕادەیە، نزیکی گێلیتان ئەکاتەوە، ئێوەش خەڵك بەخوێندەوارو ڕۆشنبیرتان ئەزانێت، حەیفە گێل یان ئەوەندەش سادە بن، نابێ هەرکەس هەر قسەیەکی کرد یەکسەر باوەڕی پێبکەن.

ئەی نابێ بزانن کە دوژمنانی ئیسلام بەهەموو جۆرەکانیانەوە، هەمیشە لە هەوڵ‌و کۆششکردندان، لە دروستکردن‌و چاندنی تۆوی گوماندا، لەدڵی موسڵماناندا سەبارەت بە ئایینەکەیان لەهەموو ڕوویەکەوە؟! ئەی نابێ بزانن کوفر نەخەوتووەو هەمیشە داو ئەتەنێت‌و ئەینێتەوە تا بەچکە موسڵمانەکانی پێبگرن‌و بەوەش لە ئایینەکەیانیان دوور بخەنەوە؟! ئەی نابێ هەست بکەن بەوەی کە پەروەردەکراوەکانی کوفر یەکسەر پێتان ناڵێن وەرن کافر بن‌و واز لە ئیسلام بهێنن، بەڵکو لەڕێگەی گومان دروستکردنەوە ئەوەتان پێئەکەن! ئێوە زۆر سادەو سەیرن! جێگەی بەزەیی پیاداهاتنەوەشن!! گیروگرفتی چەند ژنێتیی یەکێکە لەو کەلەبەرانەی کە لەوێوە کوفر هاشاوڵمان بۆ دێنێ.

پرشنگ: ئاخر دڵپاك خان، خۆ درۆ نییە، ئیسلام ددان بە چەند ژنێتیدا ئەنێت.

دڵپاك: من ناڵێم‌و نەیشم گوت کە ددانی پیادا نانێ، یان نەناوە، بەڵام ئەو ددان پیادانانە تاوان‌و ستەم نییە، کارێکی خراپ‌و زیانمەند نییە بۆ ئافرەت، من گەلێ جار لە دەمی هەندێ ساویلکە بیستوومە کە گوتوویەتی: حای! چەند ژنێتیی توانەوەی خودی ئافرەت‌و داماڵینی کەرامەتییەتی، گوایە پیاو چی لەئافرەت زیاترە؟!

خوشکەکانم، ئەم جۆرە قسە زل‌و شیلە دارانە ئەگەر هەروا بەسەرپێیەکەوە گوێیان لێ ڕابگرین، بە ڕواڵەت ڕاست‌و هەنگویناویین، یەکسەر هەندێ کەسی بەرزە عەقڵ پێیان هەڵئەخەڵەتێن‌و بەڕاستیان ئەزانن، تەنانەت بەچکەو گەلێ لە ڕۆڵە موسڵمانە بەناو ڕۆشنبیرەکان بە حەقیقەتیان ئەزانن، وەهایش هەست ئەکەن کە هەنگیان لە کلۆریی دارا دۆزیوەتەوە!!

ئێمەش تووشی دەردێکی سامناکی گیانیی کوشندە بووین، بەبێئەوەی هەستی پێبکەین، نەخۆشین بە بێئەوەی هەست بە نەخۆشییەکەمان بکەین، ئەو دەردو نەخۆشییەش نەزانینە.. نەزانین، پێشئەوەی فێر ببین دەست پێئەکەین،

پێشئەوەی بپرسین‌و تێبگەین حوکم بەسەر شتاندا ئەدەین، دەی بۆ چ نەپرسین؟ بۆ چی گوێ نەگرین لە وەڵامی پرسیارەکانمان؟ بۆچی ئەو وەڵامەی کە ئەماندرێتەوە بەراوردی نەکەین‌و هەڵینەسەنگێنین؟ پرسیارکردن، بەدوای وەڵامدا گەڕان، لێ کۆڵینەوە بۆ ئادەمیزاد نەنگ‌و شوورەیی نین، نەنگ‌و شوورەیی لەوەدایە کە ئادەمیزاد لە بیابانی نەزانیدا بژی، لە تووله ڕێگەکانی گومڕاییدا بسوڕێتەوە، دوای هەموو قسەیەك بکەوێ، بەهەموو زوڕنایەك هەڵپەڕێ.

لا تأخذ العلم الا عن جهابذة — بالعلم نحيا و بالأرواح نفديه

أما ذوو الجهل فارغب عن مجالسهم — قد ضل من كانت العميان تهديه

## دەی نیو پیاویش لە نەبوون چاکترە

دڵپاك: باشە، خوشکەکانم، ئایا چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا بە گیروگرفت ئەزانن؟

ئاواز: ئای.. ئای!! جا گیروگرفت لەوە تاڵتر هەیە بۆ ئافرەت؟!

جوان: هەوێ.. هەوێ!! تۆ نەتبیستووە کە ژنان تا ئێستاش ئەم دیڕە ئەڵێن:

سەد کۆست کەوێ، سەد سەنگەرساریی

باوانت شێوێ، نەك هەوە ساریی

دڵپاك: ناوی هەوێم بیستووەو ئەم شیعرەشم لەبەرە، بەڵام هیچ نین ئەم شتانە.

نەشمین: ئاخر چەند ژنێتی ئەتکی کەرامەتی ئافرەتی تیایە دڵپاك خان!

دڵپاك: قسەیەکە کە سەرچاوەکەی نەزانیی‌و نەفامیی‌و خۆ پەرستییە.

سکاڵا: تۆ ئەتەوێ گاڵتە بکەی بەئێمە دڵپاك، چەند ژنێتیی بارێکی گرانە بۆ ئافرەت، ستەمەو لە ئافرەتی بەسەزمان ئەکرێت!

ئاواز: نەخێر گاڵتە ناکات، من ئەزانم ئێستا دەس ئەکاتەوە بە فەلسەفەکاریی.

دڵپاك: چەند ژنێتیی ئەرك‌و بارێکە بەسەر پیاوەوە، نەك بەسەر ئافرەتەوە، هەروەها گاڵتە بەئێوە ناکەم، چونکە ئێوە سادەو پاك‌و دڵسافن، بەڵام گاڵتە بەو کۆمەڵ‌و بەو لایەنانە ئەکەم کە ئەم جۆرە پڕو پەلاَنتانە دروست ئەکەن‌و بەناو خەڵکا بڵاویان ئەکەنەوە، وا ئەزانن ئێستاش موسڵمانان بە جارێکا خەوتوون‌و هیچ کەسێکیان لەخەو هەڵنەساوە، فەلسەفەکاریشم نەکردووەو نایشیکەم.

با منیش لە ئێوە بپرسم، هەندێجار پزیشك ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ ئەبرێت، تەنانەت جار هەیە چاوی کەسێك دەرئەهێنێ، دەی ئەو پزیشکە چۆنە بەلاتانەوە؟

ئاواز: ئاخر ئەوە چاکەی تیایە بۆ ئەو کەسە، لەبەر ئەوە پزیشکەکە بەدڵڕەق یان بە خراپکار دانانرێت، ئەمە لەکوێ‌و چەند ژنێتیی لە کوێ؟!

دڵپاك: لەبەر ئەوەی کە نازانێ، با جارێ هەر نەیزانی، ئەگینا وەکو یەکن، خۆ خۆمان بەچاوی خۆمان ئەبینین کە هەندێ جار دوو پۆل تێکەڵاو ئەکرێن، مامۆستاکەیان لە جیاتی ئەوەی هەر دەرسێك بە چل دەقیقە بڵێتەوە، ئەیکات بە بیست دەقیقە، واتە لە هەر دەرسێك بیست دەقیقە ئەقرتێنێ، ئەی ئەمەیان بۆچی؟

جوان: دەی خانم گیان، ئەوە لەبەر نەبوونی مامۆستایەکی ترە، ئەبێ تێکەڵ بکرێن، لەبەر ناچاریی، مامۆستا بیست دەقیقە وانە بە پۆلێکیان ئەڵێت‌و بیستیش بە پۆلەکەی تریان، لە هەمانکاتدا سەرپەرشتیی هەردوو پۆلەکەش ئەکات.

دڵپاك: دەبا چل دەقیقەکە بە پۆلێکیانەوە بەرێتە سەرو ئەویتریان واز لێ بهێنێ.

پرشنگ: ئاخر ئەوە نەگونجاوە دڵپاك، چۆن پۆلەکەی تر بەرەڵڵا بکات؟ ئەویش مافی خوێندن‌و فێربوونی هەیە، جا مامۆستا کاتەکە ئەکات بە دوو بەشەوەو بەوەش هەردوو پۆلەکە بێبەش نابن، بیست دەقیقە چاکترە لە هیچ!

دڵپاك: قسەكەت زۆر جوان و ڕێك و پێكە، بەڵام با ئافرەتیش خۆپەرست نەبێت، نیو پیاو لە كاتی پێویستدا لە نەبوون گەلێ چاكترە، ئەی بۆچی مافی ژیان ئەبێ هەر هی كۆمەڵێك ئافرەت بێ و ئەوانی تر بێبەش بكرێن؟

نەشمین: نا، هەموو ئافرەتێك وەك یەك مافی ژیانی هەیە، بەڵام نموونەكانی تۆ لە هیچ ڕوویەكەوە پەیوەندییان بە باسەكەوە نییە!

دڵپاك: ئێوەش ـ لەگەڵ ڕێزم بۆتان ـ لە هیچ ناگەن، تفەنگ بە تاریكە شەوەوە ئەنێن، ئەو قوتابخانەیش كە ئێوەی لێدەرچووە، بەرهەمی كرچ و كاڵەو هەرگیز سەركەوتنیش تا سەر بەدەست ناهێنێ، چونكە دوورە لە ڕاستییەوە.

ئاواز: قوتابخانەی چی و بەرهەمی كاڵ و كرچی چی؟ من لەمە تێناگەم!

دڵپاك: ئەگەر مەبەستت تێگەیشتن بێت، خوا یار بێت دوایی تێئەگەیت.

سكاڵا: دڵپاك گیان، چاوەكەم با دەریای فەلسەفەكاریی بەجێ بهێڵین و بگەڕێینەوە سەر باسە ساف و سۆڵەكەی خۆمان، تێمان گەیەنە، بزانین ئیسلام بۆچی ڕێگەی داوە بەپیاو كە بەهەوەسی خۆی چەند ژنی بوێ بتوانێ مارەیان بكات؟ فەرموو، ئەگەر ئەتەوێ هیچ كاممان ورتە ناكەین، دەی فەرموو.. دەی.

دڵپاك: نا.. نا، مەبەستم ئەوەیان نییە، حەز ئەكەم قسە بكەن و بپرسن، بەڵام چاك وایە پرسیار شێوەی سرووشتیی خۆی وەربگرێت، خۆ من دڵتەنگ نەبووم لێتان.

ئەوەندە هەیە، یاسای چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا، ئەبوایە ئێمەی بەچكە موسڵمان بەیەكێك لەو شتانەی ئیسلام كە جێگەی شانازیین بۆمان باسمان بكردایە، كەچی ئەمەتا بەشتێكی زەرەرمەندو بە لەكەیەك دێتە گوێمانەوە، چونكە بەمێشكی خۆمان بیر ناكەینەوە، ڕواڵەت بنین، نەزانینن، ئەمەش مایەی ئاخ و داخە!

ئەوانەی كە ڕەواج بەم درۆو دەلەسانە ئەدەن، ئێمە وا هەست ئەكەین كە ئافرەت پەروەرن، كە پەرژەوەندیی ئافرەتیان ئەوێ، كەچی لەڕاستییدا گورگن و خۆیان بردۆتە پێستی مەڕەوە، هەر ئەوانن ئافرەتیان چەواشە كردووەو خۆی لێگۆڕاوە، هەرچی بەدبەختییەك بەسەر ئافرەتی ئەمڕۆدا دێت لەناوچاوی ڕەشی ئەوانەوەیە، كەچی ئافرەتیش هەستی پێناكات!!

جوان: چۆن؟ ئاخر چۆن؟ دەی تێمان گەیەنە!

## چەند ژنێتیی لەپێش ئیسلامدا

دڵپاك: ئێوە بە هەڵە لە بابەتەكە گەیشتوون، چەند ژنێتیی كارێكی خراپ نییەو ئیسلامیش داینەهێناوە، بەڵكو لە دیرین ڕۆژگارەوەو لە شێوەیەكی بێسنووردا هەبووە، یەكێك بووە لە باوو نەریتی كۆمەڵگاكان و لە هەموو شوێنێكدا هەبووە، چ كۆمەڵگە پێشكەوتووەكان و دواكەوتووەكان، چ ئاییندارو بتپەرست و بێئاییینەكان.

پرشنگ: ئەگەر پێت ناخۆش نەبێت، ئەمەیان وەها نییە، ئەها گاورەكان چەند ژنێتیی قەدەغەیە لەناویاندا!

دڵپاك: نەخێر، چاوەكەم، لەناو هەموو نەتەوەكاندا هەبووە، ئەسینییەكان، چینییەكان، هندییەكان، بابلییەكان، ئاشوورییەكان، میسرییەكان، حەبەشییەكان و عەرەبەكان.. هتد، چەند ژنێتییان لەناوا هەبووە، تەنانەت لەناو زۆربەی ئەو نەتەوانەدا ژمارە بۆ ئەو كارە دیاریی نەكراوە، یاسای (لیكی) لە چیندا ڕێگەی ئەدا كە یەك پیاو سەدو سی (١٣٠) ژنی هەبێت، تەنانەت یەكێك لە ئەباتیرەكانیان ئەڵێن، (٣٠) هەزار ژنی هەبووە، هەر چەندە ئەم ژمارەیە لەوانەیە ڕاست نەبێت[1].

ئایینی جوولەكە ڕێگەی ئەدا، سنووریش دیاریی نەكرابوو، بەڵكو بەپێی هەوەس و ئارەزوو و دەستەڵاتی پیاو بوو، بۆی هەبوو چەند بتوانێ ئەوەندە ئافرەت مارە بكات، ئیتر كە نیزەك و بەندەو خزمەتكار ئەوە هەر بۆیان مەپرسە.

لە تەوراتدا یان لە ئینجیلدا هیچ دەست بەسەراگرتنێك لە بارەی چەند ژنێتییەوە بەرچاو ناكەوێت، بەڵكو ڕەوایەو یەكێكە لە سوننەتانی پێغەمبەرەكان، هەر لە ئیبراهیمەوە تا سەردەمی عیسا[2].

---

[1] تعدد الزوجات فی الاسلام/ عبدالله ناصح علوان.

[2] عقائد الاسلام وأطیل خصومه ـ عباس محمود العقاد.

لە ئایینی گاوردا. کە پەنجەتان بۆ ڕاکێشا. لە ئینجیلەکاندا هیچ ئاماژەیەك بۆ قەدەغەکردنی چەند ژنێتی نەکراوە، بەڵکو لە هەندێ نامەی (بولس)دا نووسراوەو هاتووە کە ڕێگە پێدراوە، ئەڵێت: "پێویستە ئەسقوف تەنیا یەك ژنی هەبێت" خۆ دیارە گاورەکان هەموویان ئەساقفە نین.

لەڕوانگەی مێژووەوە سەلمێنراوە کە گاورە کۆنەکان زیاتر لەیەك ژنیان هەبووە، تەنانەت (آباء)ەکانی سەردەمی کۆنی گاورێتیی هی وایان هەبووە کە ژنێکی هەبووە، لەسەردەمە کۆنەکانی گاوریشدا ڕێگادانی چەند ژنێتیی لە هەندێ جێگای تایبەتییو باری ناچارییدا ئەبینین، (عباس محمود العقاد) لە کتێبیی (المرأة في القران)دا نووسیویەتی: "زانای باوەڕپێکراو لە مێژووی هاوسەرێتیی (الزواج)، وستر مارك، ئەڵێ: "چەند ژنێتیی بەپێی ددان پیانانی کەنیسە هەتا سەدەی حەڤدەهەم ماوەتەوە، بەزۆری لە چەندان حاڵدا دووبارە ئەبووەو بۆ دەوڵەتو کەنیسە نەئەژمێررا".

دیسانەوە ئەم زانایە ئەڵێت: "پاشاکانی گاورەکان زیاتر لەیەك ژنیان مارە ئەکرد، (دیار مارت)، پاشای ئیرلەندە دوو ژنو دوو کەنیزەکی هەبووە، (شارلمان) دوو ژنو چەند کەنیزەکێکی هەبووە، ماوەیەك دوای ئەوەش (فیلیب أوهافیس)و (فردریك ولیام)ی دووەمی بروسی، یەکی دوو ژنیان بەڕەزامەندی قەشە (لوثریی)یەکان مارە بڕی، (لوثر) خۆی لەگەڵێ موناسەباتدا باسی چەند ژنێتیی ئەکردو ئەیگوت خوا قەدەغەی نەکردووە".

جوان: ئەی بۆچی ئەڵێن ئیسلام دایهێناوە؟ بۆچی ئەڵێن ئایینی گاور بەکوفری دائەنێت؟ ویی! خۆ خەریکبوو لە خۆشیی ئەوەدا خۆم بکەم بە گاور!

دڵپاك: ئەی چۆن؟! هەر ئەبێ ئاوەهامان پێبڵێن، هەموو شتێکمان لەبەرچاو شیرین بکەن جگە لە ئیسلام کە ئەبێ تاڵو ترشی بکەن لەلامان!

لەهەمان سەرچاوە، هەر لەوبارەیەوە مامۆستا عەقاد نووسیویەتی: "ئەنجومەنی فرنکیەکان لە نورمبرج بڕیارێکی دەرکرد، تێیدا ڕێگەیدا بە پیاو کە دووژن ڕەوایە بۆی، ئەوەش لەدوای پەیمانی وسنفالیا، لە ساڵی (١٦٥)ز دا، دوای ئەوەی دەرکەوت ژمارەی پیاوان بەهۆی جەنگەکەی سی ساڵەوە ئێجگار کەم بۆتەوە.. تەنانەت هەندێ لە هۆزە گاورەکان چەند ژنێتیی بەپێویست (واجب) ئەزانن، لە ساڵی (١٥٣١)ز دا (لامعدانییەکان) لە مۆنستر بەو پەڕی ڕاستییو ڕەوانیی هاواریان کرد کە گاور پێویستە چەند ژنێکی هەبێت، هەروەها (مورمون) چەند ژنێتیی بە یاسایەکی خوایی پیرۆز ئەژمێرێت".

ڕەنگە بڵێن: لەوانەیە عەقاد لەبەرئەوەی کە موسڵمانە لەڕێگەی تەئویلەوە ئەم شتانەی هێنابێ، کە ئەمەش ڕاست نییە، فەرموون گوێ لە یەکێك لەو نووسەرانە بگرن کە خۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی گاورو ماور (جورجي زەیدان)، گوێ بگرن بزانن چی نووسیوە!

پرشنگ: ئای، ئەوە نووسەرێکی بەرزو نایابەو هەموو کەسێك ئەیناسێ.

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، ئەزانم بەرزەو لەسەربانەوە سەیری خوارەوە ئەکات، دەی گوێ بگرن کە لەبارەی چەند ژنێتییەوە نووسیویەتی: "گاورێتیی دەقێکی ڕاستو ڕوونی تێدا نییە کە شوێنکەوتنی قەدەغەی مارەکردنی زیاتر لەیەك ژن بکات، ئەگەر بیان ویستایە، چەند ژنێتیی لەناویاندا ڕێگەی پێئەدرا، بەڵام سەرۆکە کۆنەکانیان یەك ژنێتییان بەچاکتر زانی، چونکە لە پاراستنی خێزانو مانەوەی یەکێتییەوە نزیکترە، جا ئەوەش لە دەوڵەتی ڕۆمانییدا بڵاو بووەوە، تا وای لێهات پەرەی سەند".

لەوەش زیاتر، گاورێتیی ئەم سەردەمە ددانی بەچەند ژنێتییدا، لەئەفریقادا بۆ گاورە ئەفریقییەکان نا، ددانێك کە سنوور بۆ ژمارەی ژنەکان دانانێت، تەماشای پەڕاوی (الاسلام والنصرانیة في اوسط أفریقیة)ی (نورجیة) بکەن کە تیایدا ئەڵێت: "ئا ئەو نێراوانە ئەیانگوت: لەژیریی نییە ئەگەر دەست بخەینە ناو ئیشو کاری کۆمەلایەتیی بتپەرستەکانەوە، کە لەمەوبەر لە سەری ڕۆیشتوون، لەژیریی نییە کە بێبەشیان بکەین لەو ژنانەیان کە هەیانن، مادام گاورنو باوەڕ بەئایینی گاور دێنن، بەڵکو ئەوەش زیانی تێدانییە، مادام تەورات، ئەو پەڕاوەی کە پێویستە گاوران پەیڕەویی بکەنو بیکەنە بنەڕەتی ژیانیان، ڕێگەی چەند ژنێتیی ئەدات، جگە لەوەی کە (مسیح) خۆی بڕیاری ئەوەی داوە، لە فەرمووەدەیەکیدا: "وا مەزانن بۆ ئەوە

هاتبم کە وێرانکار بم، بۆ ئەوە هاتووم کە ئاوەدانکەرەوە بم"، لە کۆتاییدا کەنیسە بەشێوەیەکی ڕەسمی، سەبارەت بەچەند ژنێتیی، بۆ ئەفریقاییە گاورەکان ڕێگەی ئاچۆغ کرد[1].

جوان: بەخوا چاکبوو ئەمەم زانی! ئای لەبەزمو بالۆرەی بێتانو پۆی ناو ئەم خەڵکە، دەی بە خوا ئەیان گوت مەسیحییەکان لەژنێ بەو لاوە ناهێنن!

ئاواز: بەڵام وابزانم ئەوە بەتەنها بۆ ئەفریقییەکانە نەك بۆ گشتیی.

دڵپاك: نەخێر، وا نییەو بۆ گشتییە نەك تایبەتیی، جا ئەوەی باسمان کرد تەنها سەبارەت بە ژنهێنانی مارەکردن بوو، ئەگینا زۆری کەنیزەكو بەندە کە لە ڕەگەزی ئافرەت بوون، وەهای کردبوو کە پیاوان نەیان پەردەژێ بەسەر ژنەکانیانەوەو ئەوەندە مەیلیان پێنەدەن.

## خۆرئاوایش ئاتاجی چەند ژنێتییە

سکاڵا: باشە دڵپاك، خۆ ئاواز گوتی، چەند ژنێتیی لە ئایینی گاوردا تەنها بۆ گاورە ئەفریقییەکانە، ئایا ئەو قسەیە ڕاستە؟

دڵپاك: وانییە خوشکەکەم، گەلە ڕۆژئاواییە گاورەکان، بەتایبەتیی لەدوای دوو جەنگی جیهانیی، خۆیان لەبەردەم گیرو گرفتیی زیادبوونی ژمارەی ئافرەت بەسەر ژمارەی پیاودا دی، دییان ئەوە گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتیی پڕ لە مەترسییەو تا ئێستاش گیریان خواردووە بەدەستییەوە، جا یەکێك لەو چارەسەرییانەی کە هێنایانە کایەوە، چەند ژنێتیی بوو.

پرشنگ: چۆن؟ شتی وەها دوورە لە خۆرئاواییەکان، باوەڕ ناکەم!

دڵپاك: گیانەکەم، پرسیاری ناوێ، باوەڕ بکەی یان نەکەی، ئەوە ڕاستییەو واقیعییە، لە ساڵی (١٩٤٨)دا، لە ئەڵمانیا، لە شاری (میونخ)دا، کۆنگرەیەکی لاوان گیراو باسی زیادیی ژمارەی ئافرەتان چەند قاتی ژمارەی پیاوانی تێدا کرا، ئەمجا هەموو چارەسەرێك بۆ ئەو گیرگرفتە خرایە بەرچاو، لەئەنجامدا لیژنەکە بڕیاری دا لەسەر خواستی کۆنگرەکە، کە داوای ڕێگەدان بکرێت بۆ پەنابردن بەچەند ژنێتیی، بۆ ئەوەی گیروگرفتەکە چارەسەر بکرێ.

لە ساڵی (١٩٤٩)دا، دانیشتوانی (بۆن)ی پایتەختی ئەڵمانیا، داوایەکیان پێشکەش بە دەسەڵاتدارە پسپۆڕەکان کرد، تیایدا داوایانکردبوو کە دەستووری ئەڵمانیی بەوێنەی دەق، ڕێگەی چەند ژنێتیی بدات[2].

نزیکەی دە ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە حکومەتی ئەڵمانیا ناردوویەتی بۆ لای شێخیی ئەزهەر. وەفد ناردن، کاغەز ناردن. داوای کردووە لێی کە چۆنییەتی چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا بۆ باس بکاتو ئەو یاسایەی بۆ ڕۆشن بکاتەوە، چونکە ئەیەوێ. واتە ئەڵمانیا. کەڵك لەو یاسایە وەربگرێتو گیروگرفتی زۆری ژنان لەپیاوان چارەسەر بکات پێی، دوا بەدوای ئەوەش نوێنەرێکی ئەڵمانیی پێکهاتووە لەزانایان چوون بۆ ئەزهەرو بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندییان بەشێخیی ئەزهەرەوە کرد.

سکاڵا: ئەی هاوار هەی! ئەم هەموو شتانەمان لێ شاراوەتەوەو هەموو ئیشو کارێکمان بەکوێرانە بۆتە تانەدان لەئیسلام! ئێمە لەکوێینو ڕاستیی لەکوێیە! ئەی ئەم باسانەمان بۆچی بۆ ناکرێت؟!

دڵپاك: خوا یاربێت تێئەگەن.

---

[1] تعدد الزوجات فی الاسلام: عبدالله ناصح علوان ـ ل١٤ ـ ١٨.

[2] المرأة بین فقه والقانون ـ د. مصطفى السباعي.

# ئیسلام لەوانی تر لەوەدا جیاوازە

نەشمین: بەڵێ، خوشكە دڵپاك، قایل بووم بەوەی كە گاورێتییش وەكو ئیسلام ڕێگەی چەند ژنێتیی ئەداتو كاتی خۆیشی ڕێی لێنەگرتووە، بەڵام ئەی ئەوە ستەم كردن نییە لەئافرەت؟

ئاواز: گاورێتیی و ئیسلامو ئایینو هەموو جۆرە یاساكان لەوەدا ستەمیان لەئافرەت كردووە، ڕاست ئەوەیە نەهێڵرێتو قەدەغە بكرێت.

دڵپاك: جارێ خۆ ئێمە نەگەیشتووینەتە ئەنجامی باسەكە تا حوكم بەسەر چاكیی یان خراپییەكەیدا بدەین، با كوێرانەو هەوانتە حوكمی بەسەرا نەدەین، دوایی زۆر چاك ستەمو هەق لە گیروگرفتەكەدا یەكێكیان خۆی خۆی دەرئەخات.

جا ئەگەر گاورێتیی و ئیسلامو هەموو ئایینو یاساكانی تر ستەمكار بن، ئەی كێ و چی ڕاست بوون، یان ڕاستن؟ ڕاستیی و ناڕاستیی ئەوەی لای تۆیش لە دواییدا باس ئەكەینو چاك بۆت دەرئەكەوێ، پەلە مەكە.

چەند ژنێتیی گیروگرفتێكی كۆمەڵایەتیی نەبڕاوەی ڕەگو ڕیشەدارەو لەدێرین ڕۆژگارەوە هەبووە، دەس لێهەڵگرتنی زیانێكی قەرەبوو نەكراوەی بەدەمەوەیە، كاتێ ئیسلام دەركەوت ئەو گیرو گرفتە لەبارێكی زۆر ئاڵۆزدا بوو، ئیسلامیش هەر وا بەبێ گوێ پێنەدان بەجێی نەهێشت، بەڵكو لای كرد بەلایەوەو یاسای تایبەتیی بۆ داناو بەهۆی ئەو یاسایانەوە هەر ئاژاوەیەك كە هەبوو لە گیروگرفتەكەدا نەیهێشت، زیانەكانی فرێداو گەشەی بە كەڵكەكانی كرد، ڕێكوپێكی كرد.

پرشنگ: تۆ ئەوەم پێبڵێ، ئەی بۆچی قەدەغەی نەكرد با ببڕێتەوە؟

دڵپاك: خانم گیان، ئیسلام ئایینێكە خوا كردوویەتی بە بەرنامەی ژیان، خۆ پاراستنی هەڵپەو قڕی هەوەسو ئارەزووی منو تۆ نییە، ئەی ئێستا پێم نەگوتن كە دەسبەرداربوونی زیانێكی قەرەبوو نەكراوەی بەدەمەوەیە؟ قابیلە زانیاریی منو تۆ لە هی خوا زیاتر بێت؟ ئێمە تەنیا بەردەمی خۆمان ئەبینین، هەرساتێ ئاواتو ئارەزوویەك یاری بە دەمارەكانمان ئەكات، ئەی داوام لێ نەكردن كە لە حوكمدانا پەلە نەكەن؟

جارێ با ئەوەتان پێ بڵێم، كە ئیسلام لەو مەسەلەیەدا جیاوازیی زۆر زۆرە لەوەی ئایینو یاساكانی تر، چونكە ئیسلام چەند ژنێتیی هەروەك قەدەغە نەكردووە پێویستیشی نەكردووە، سنووری بۆ دیاری كردووە لە چوار ژن زیاتر لە یەككاتدا تێپەڕ ناكات، لەهەموو كاتو بارێكیشدا ڕێی چەند ژنێتیی نادات، بەڵكو لەكاتی پێویستو باری تایبەتییدا مۆڵەت دەدات، لەپێش ئیسلامدا ئەگەر بۆ ناڵكردنی ئافرەت یان مەبەستێكی تر كرابێت، ئیسلام ئەوەی گۆڕی، كردی بە دەرمانێك بۆ زامی كۆمەڵگە، ژن، پیاو، بەتایبەتی بۆ زامی لەشی ئافرەت.

پرشنگ: وابزانم لە ئیسلامیشدا سنووری بۆ نییە، دڵپاك خان.

سكاڵا: كچە گرنگ ئەوە نییە، بۆ چی چوار كەمن، قوڕی كوێ بكەم بەسەرما؟

دڵپاك: ئاخر هەی بێ بەڵا بێت، وابزانم كەی قسەیە؟ چۆن پشتی پێئەبەسترێ؟ یاسای ژمارە (٣)ی سوورەتی (النساء) ئەو بڕیارەی داوە، دەی گوێ بگرە ئەها ئەفەرموێت: (..فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ..). لە هەمان یاسادا بەستراوە بەمەرجی دادپەروەرییەوە: (..فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُوا).

جوان: هەم، خەریكە تەپە تەپی دڵم كەم ئەبێتەوە، ئێ ئێ! دەی ئەوەتا ئەو پەڕەكەی چوار دانەیە پرشنگ، كەچی تۆ لە خۆتەوە ئەڵێیت وابزانم سنووری بۆ نییە!

دڵپاك: ئێوە تەپە تەپ ناكەوێ بەدڵتان لەنێو چنگی كوفردا، كەچی وایان لێكردوون هەركەس ناوی بەرنامەی خواتان لەلادا ببات یەكسەر تووشی دڵەتەپێ ئەبن! سكاڵا خان، بۆچ ئەترسی؟ لەبەرچی قوڕ ئەكەی بەسەری خۆتا؟ خۆ تۆ جارێ شووت نەكردووە، كێ ئەڵێ كابراكەت ژنی ترت بەسەردا ئەهێنێ؟ چییتە؟ ئەم لاو ئەولای زۆر ئەكەیت!

وەك پێم گوتن، ئیسلام چەند ژنێتیی واجب نەكردووە لەسەر پیاوی موسڵمان، شتەكە هەمیشەییش نییەو كات دەوری خۆی ئەبینێ تیایدا، هەروەها پێشێلكردنی ئافرەت نییەو بەزۆریی پاراستنی ئافرەتی تێدایە، ئەگەر لەبەر ناچاریش نەبێت

ئیسلام بەچاکیی دانانێت، سەربەستیشی بۆ ئافرەت لەمەسەلەکەدا هێشتووەتەوە، وا نەبێت کۆبوونەوەی چوار یان دوو ژن بەشتێکی ئاسان لە ئیسلامدا، بە بەنی پیاوێکەوە بەکارێکی ئاسان بدرێتە قەڵەم، بەڵام ناچاریی یاسای تایبەتی خۆی هەیە "ان للضرورة أحكام".

جوان: بەخوا چیتان لیٚ بشارمەوە من برسیمە.

ئاواز: کورە خۆ وا سەعات بەرەو یەکی پاس نیوەڕۆ ئەڕوات .

## چەند ژنێتیی ماف پاراستنی ئافرەتە

سکالاٚ: خۆ لەبڕیارەکەتان پەشیمان نابنەوەو ئەمشەویش ئەمێننەوە لامان.

پرشنگ: بەڵیٚ، بەیانی زوو هەڵئەستین و فریای دەوام ئەکەوینەوە.

جوان: دڵپاك خان، تۆ گوتت، چەند ژنێتیی دەرمانە بۆ زامی کۆمەڵگەو ئافرەت، توخوا پێم ناڵێیت ئەو ژەهرە چۆن ئەبیٚ بەدەرمان؟

دڵپاك: خانم گیان، هێرشکردن بەکوێرانە پیشەی ئادەمیزادی ڕۆشنبیر نییە. مادام ئەوەندە پەلەتانەو بۆی بەجۆشن، فەرموون با لێیبکۆڵینەوە .

ئێوە تەنها لەیەك سەرەوە ئەڕواننە مەسەلەکە، هەریەکەتان لەدڵی خۆیدا ئەڵیٚ، چۆن؟ ئەی من ئادەمیزاد نیم وەك پیاو؟ بۆچی بەشم نیو، یان چارەکە پیاوێك بێت؟ دیارە ئەمەش لەسنووری خۆ پەرستییدا دەرنەچوونە، ئێوە جگە لە خۆتان کەسی ترتان بەلاوە گرنگ نییە، خۆ پەرستیی تا ئەو ڕاددەیە جگە لە ژێربێژیو سرووشتێکی شێواو کەسی تر بەچاك و سوود بەخشی دانانیٚ.

خوشکەکانم، هەندیٚ حاڵەت بەبێئەوەی منو تۆ حەزی لێبکەین، دێتەکایەوەو خۆی ئەسەپێنیٚ بەسەرماندا، کە پێویست (الضرورية) ئافرەتو پیاو ناچار ئەکەن، کە پەنا بە هەندیٚ شتی تر بەرێت، جا مەسەلەی چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا یەکێکە لەو حاڵەتانەی کە دێنە کایەوەو ناتوانین ڕابکەین لێی.

نەشمین: بەنیسبەت پیاوەوە نازانم، بەڵام هەرگیز باوەڕ ناکەم هیچ پێویستییەك هەبێت کە بتوانیٚ ئافرەت ناچار یان قایل بکات لە چەند ژنێتییدا.

دڵپاك: گەلیٚ جار وا ئەبێت کە ژمارەی ئافرەتان لەهی پیاوان زۆرتر ئەبێت، وەك لە باکووری ئەورووپادا، نەك هەر لەکاتی جەنگدا، بەڵکو لە زۆربەی کاتدا، سەرژمێریی چەندەها جار دەریخستووە کە لە (فنلندە)دا، بۆ نموونە، لەسیٚ یان چوار منداڵ کە لەدایك ئەبن یەکێکیان نێرە، ئەوانیتر مێن، دەی کە گەورە بوونو کاتی ژنهێنانو شووکردنیان هات و هەر پیاویٚ بەیەك ژنەوە خۆی ببەستێتەوە، ئەی ئەوانەی کە بە بیٚ مێرد ئەمێننەوە چییان لێبکرێت؟ کیٚ زەرەر ئەکات، پیاو یان ئافرەت؟

لەکاتی جەنگدا ژمارەی پیاوان لەهی ئافرەتان ئێجگار کەمتر ئەبێتەوە، بۆ نموونە: مرۆڤایەتیی تەنیا لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا هەشت ملیۆن و حەوسەد هەزار کەسی لە دەست دەرچوو، کە بەشی هەرە زۆریان لە پیاو بوون، فەرەنسا (١٣٩٠٠٠٠)، ئەڵمانیا (١٩٥٠٠٠٠)، ڕووسیا (١٧٠٠٠٠٠)، بەریتانیا (٧٨٠٠٠٠)، نەمساو هەنگاریا (١٠٠٠٠٠٠)، ئەمریکا (١٢٠٠٠٠)، تورکیا (٤٠٠٠٠٠)، ئیتالیا (٥٠٠٠٠٠)، ئایا ژمارەی ئافرەتان لە هی پیاوان بەرز نەبووەتەوە؟ لە گوندەکانی ناوەڕاستی فەرەنسادا ڕێژەی ئافرەت بۆ پیاو (٥٠) بۆ(٨ - ١٠) بوو، سەرژمێران ڕایانگەیاند کە هەر لە فەرەنسادا بەتەنیا، دوو ملیۆن ئافرەت بیٚ پیاو ئەمێننەوە[1].

خۆ دیارە کوژراوانو تیاچووانی جەنگی جیهانیی دووەم چەند قاتی جەنگی جیهانی یەکەم بووە، بەوپێیەش ژمارەی ئافرەتان زیاتر زیادی کردووە، دەی ئەگەر ڕێگەی چەند ژنێتیی دابخرێت، ئەو ئافرەتە زیادانە چییان لێبکرێت؟

---

[1] المرأ القرن العشرين ـ جروان السابق ل ٨٧.

جگە لەوەی کە سووتەمەنی جەنگەکان هەمیشە بەزۆریی پیاوانن، پیاوان زیاتر لەئافرەتان بەدەرەوەن، لەبەر ئەوەش زیاتر بەر ڕووداوو کارەسات ئەکەون، بەهۆی کارکردنو جموجوڵو هەڵپەی پەیداکردنی ڕۆزییەوە بۆ ماڵو منداڵ، لەکاتی بڵاوبوونەوەی دەردو دژەدا زیاتر بەر تیاچوون ئەکەون، ئەوەش زانراوو سەلێمنراوە کە ئافرەت لەتووشبوونی نەخۆشییدا بەرگری لەهی پیاوان زیاترە، واتە لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە بەزۆریی ژمارەی ئافرەت لەهی پیاو زیاترە، دەی ئەگەر هەر پیاوێك ببەسترێتەوە بەیەك ئافرەتەوە لەهەموو کاتێکدا، ئەی ئافرەتە زیادەکان فڕێ بدرێنە ناو دەریاوە؟ ئایا ئەوانیش مافی خۆیانیان ناوێ؟ خۆ دیارە تەرازووی ژمارەی ئافرەتو پیاو لەو حاڵەتانەدا لارە سەنگ ئەبێت بەلای ئافرەتدا، دەی ئایا چەند ژنێتیی لەو کاتەدا نابێتە پێویستییەکی سەرەکیی ناو کۆمەڵگە، ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگە لەئاژاوەو وەیشوومە بپارێزین؟

جوان: دەی دڵپاك گیان، خۆ ئافرەتیش ئادەمیزادە، با قۆڵی لێ هەڵبکاو دەست بکات بەکارکردن، خۆیو مناڵەکانی چەند ساڵێك بژێنێ، ناکرێ؟

دڵپاك: بۆچی ناکرێ؟، بەڵام مافی ئەو ئافرەتە تەنیا خواردنو پۆشاكو خەوتن نییە!، ئەی بۆچی ناڵێیت کە بەزۆری دەوڵەت مووچەی بۆ ئەبڕێتەوە؟ لە هەموو وڵاتێکدا دەوڵەت مووچە ئەبڕێتەوە بۆ خێزانی کوژراوان، بەڵام ئەی بیر لە ئارەزووی (جنسي) ئەو ئافرەتە ناکەیتەوە؟ خۆ ئێوە مامۆستانو هەمووتان مووچە خۆرن، دەی شوو مەکەن!

سکاڵا: بەخوا لەخەتا گیراین! های!! چۆن شوو نەکەین؟ ئەوە قسەیە؟ بەڵام دڵپاك خان، ئافرەت هەوێیەکی بێت بەسەرا شتێکی کەم نییە!

دڵپاك: دەی لەزۆربەی کارچاکییدا ئەگەر زیانێکی بچووكو ئەوتۆ لەخۆمان نەدەین لە پێناوی نەهێشتنی زیانێکی گەورەدا، دادگەریی جێی خۆی ناگرێت.

جا ئەگەر ئافرەت بەشێوەیەکی ڕەوا یارمەتیی ئافرەت نەدا، بۆ بەسەربردنی پێویستی سرووشتی خۆی لە (جنسدا)، لێبوردنی نەبێت لەوەدا بەرامبەری، ئەبی ئەو ئافرەتە زیادانە چییان لێبکرێت؟ ئایا ئەتوانن ئارەزووەکەیان بپوچێننەوە و بمرێنن؟ دیارە نەخێر، ئایا ئەتوانن خۆیان ببەنە ڕیزی فریشتەوە؟ ئایا چەند ژنێتیی خراپترە لەوەی کە ئافرەت بەشێوەی داوێن پیسیو ناڕەوا ئارەزووەکەی هەر شەوێ لە باوەشی کابرایەکی بێگانەدا بەسەر بەرێتو ئەمجا هەریەکەیان بڕوات بەڕێگەی خۆیدا؟

جوان: کچە تۆ ئەو شتە وردەڵانە لەکوێوە ئەهێنی. بەخوا چەند ژنێتیی ئەگەر بەو جۆرە بێت زۆر بەکەڵکە، من هەرگیز پەیم بەمە نەبردووە.

دڵپاك: هەروەکو هەموومان ئەیزانین، منداڵ، قەرەچۆڵ (النسل) حەزو ئارەزوو ئاواتو هیوایەکی زۆر قووڵە لە دەروونی مرۆڤدا، بەجۆرێك لە بیربردنەوەی کارێکی مەحاڵە، چ بۆ پیاوو چ بۆ ئافرەت، لەڕاستییدا ئەو حەزە لە ناخی ئافرەتدا ڕەگی قووڵتر داچەقیووە، تەنانەت ئافرەت تامو چێژ لە ژیانی خۆی بەبێ بزەی منداڵ نابینێ، خۆ باوەڕ ناکەم ئافرەتی ئاسایی، ئاسایی لەخودی خۆیدا، بەوە ڕازی بێت کە ببێتە هەڵگری زۆڵو پەروەردیاری زۆڵێکی باوك نەزانراو، ئێ خۆ ژمارەی ئافرەتان زۆرو هی پیاوان کەمە، دەی بەبێ چەند ژنێتیی گەلێکیان بەبێ مێرد ئەمێننەوە، ئایا هەر بەبی مێردیی بمێننەوەو لەو بزەیەی منداڵ بێبەش بن؟ یان زۆڵ هەڵگرنو پەروەردەی بکەن! بەبێئەوەی پیاو لەو پەروەردە کردنەدا بەشداری بکات؟ جا بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنەش جگە لە چەند ژنێتیی کە ڕێگەیەکی پاكو ڕەوایە، هیچ ڕێگایەکی تر نییەو نابێ.

سکاڵا: بەخوا زۆربەی ئافرەتان ئەم شتانە نازانن، ئەمە وردەکارییەکی زۆر گرنگو پڕ لە عیبرەتە، هەق هەیە بە شێوەی وانە بە ئافرەتان بگوترێتەوە.

دڵپاك: ئەی چۆن! ئیسلام زۆر چاك ئەزانێت کە بوونی چەند ئافرەتێك لە ژێر سێبەری یەك پیاودا کارێکی سووكو ئاسانو حەسێنەرەوە نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری لەسەر داوە، چونکە ئەزانێ کە پێویستییەکی گرنگی پەیوەندیدارە بە مرۆڤەوە، هەر لەبەر ئەوەش یاساغی نەکرد، چونکە یاساغ کردنی، یانی بەرەڵڵاکردنی ئافرەت، یان ئافرەت خستنە ناو کەنداوی داوێن پیسییەوە، یانی لا نەکردنەوە بەلای نووزەی تاساوی ئافرەتەوە.

خوشکە ئازیزەکانم، ئەی چی ئەکەن لەو پیاوەی کە وەك ئافرەت ئەویش حەزی لە بزەی شیرین‌و گرِوگاڵی منداڵە، کەچی ژنەکەی نەزۆکەو یان بەهۆی نەخۆشییەکی چارە نەکراوەوە منداڵی نابێت؟ چی لەو پیاوە ئەکەن، پاش ئەوەی کە هەوڵو تەقەلایەکی زۆریش لەگەڵ ژنەکەیدا ئەدات‌و چاوەڕوانییەکی دوورو درێژیش ئەکات، بەڵام ئەنجامەکەشی بەهیچ دەرئەچێت؟ ئایا لەو حەزو ئاواتە بێبەش بکرێت؟ ئەی ئەو ژنەی تەلاق بدات‌و ئەو هەموو بیرەوەرییانەی ژیانی لەوەو بەریان بدات بە بادا؟ یان ژنێکی تر بێنێ؟ کام ڕێگەیان چاکترە؟

ئاواز: دیارە لەو حاڵەتەدا چەند ژنێتیی کارێکی چاکە، بەڵام ئەی ئەگەر پزیشك سەلماندی کە لەوەدا تاوان یان ناتەواویی لە پیاوەکەوەیە؟

دڵپاك: ئەگەر ئافرەتەکە خۆی حەز لە جیابوونەوە بکات لێی، ئیسلام ڕێی لێناگرێت. هەندێك پیاو هەن ئارەزووی سێکسییان بەهێزە، بە یەك ژن ئارەزوویان دانامرکێتەوە، ئایا ژنێکی تر مارە بکات چاکترە، یان ئەو ئارەزووەی بە ڕێگەیەکی ناڕەوای پیس‌و بە ناپاکیی کردن لەگەڵ ژنەکەیدا بەسەر بەرێ؟

جوان: بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین مارەکردنی ژنێکی تر چاکترە، چونکە بەپێی ژیریی، خاوێن‌و دامەزراوترە لەڕێگەیەکی تری ناڕەوا.

دڵپاك: هەندێك ئافرەت هەن بەسرووشت یان بە هۆی لێقەومانەوە، سڕو ساردن، حەز لە ژن‌و مێردایەتی (الجنس) ناکەن، یاخود حەزیان نامێنێ، کەچی مێردەکانیان ئەو حەزەیان هەیە، ئەوانیش بۆ ئەو مەسبەتە زۆر کەم بەدەم مێردەکانیانەوە دێن، ئایا ئەو ئافرەتانە بکوژرێن؟ ناچار بکرێن؟ تەلاق بدرێن لەکاتێکدا حەزیشیان لە تەلاق وەرگرتن نییە؟ پیاوەکانیان پەنا بەرنە بەر داوێن پیسی؟

پرشنگ: ئاخر تۆ ڕێگەمان بە پەرِۆو پینەکردن لێئەگریت، ئیتر قسەمان نامێنێ!

دڵپاك: وانییەو ئەوەش پەرِۆو پینەکردن نییە، بەڵکو ئەوانە هەموو بارودۆخی واقیعیین‌و زانیاریی سەلماندوونی، بەڵام تۆ بێئاگایت لێیان.

ئەی چی ئەکەیت لەو پیاوەی کە بەهەر هۆیەکەوە بێ لە ژنەکەی ماوەیەکی دوورو درێژ دوور ئەکەوێتەوە؟ خۆی بخەسێنێ؟ بە ڕێگەی ناڕەوا حەزو ئارەزووی بەرێتە سەر؟ یان ژنێك بهێنێ بەمارەکردن؟

یان وەك لەپێشەوە باسمان کرد، ژنێك کۆئەندامی ژن‌و مێردایەتی تووشی نەخۆشی ئەبێت، یان لەشی کزو لاوازو نەخۆشە، یان نەخۆشییەکەی جۆرێکی وەهایە کە ئەبێ جێگای لێ جیا بکرێتەوە، وەك نەخۆشییە درمەکان، دەی خۆ دەرکردن‌و تەڵاقدانی ئافرەتەکە لەم حاڵەتانەدا گەورەترین ستەمە کە لێیبکرێت، ئەی بێبەش کردنی مێردەکەشی لەمافی کاری جووت بوون، بەڕێگەیەکی ڕەوا، ستەم نییە لە پیاوەکە؟ خۆ هێنانی ژنێکی تر هەر وەك ئەو بارە لەسەر کۆڵی ژنە نەخۆشەکە لا ئەبات، یارمەتیدەرێکیشی بۆ پەیدا ئەکات.

جگە لەو خاڵانەی پێشوو، زۆرجار وا ئەبێت کە وڵات پێویستی بە زۆریی دانیشتوان ئەبێت، بۆ پارێزگاریکردنی لە دوژمن، بۆ ئاوەدانکردنەوە، بۆ بەرهەمهێنان‌و بەرزکردنەوەی ئابووری.. هتد، ئایا بۆ ئەو مەبەستە، ئەگەر ڕێگەی شەرعی، وەك چەند ژنێتیی بگیرێتە بەر چاکتر نییە؟ ئەی بۆچ زۆڵ خستنەوە بەچاك ئەزانرێ؟ یان سەنگ‌و پێوانە دەمەونخون بۆتەوە؟ جا ئێستا من لەئێوە ئەپرسم، چەند ژنێتیی بوونی چاکترە یان نەبوونی؟

سکاڵا: بەڕاستی من ئەم هەموو هۆو مەبەست‌و ئەنجامانەم هەر نەبیستووەو هیچیشم لەبارەیانەوە نەزانیوە، هەر چییەکیشم لەم ڕووەوە بیستبێ پێچەوانە بووە، وام زانیوە ئیسلام هەر نوێژو ڕۆژوویەکی ڕووتەو تەنیا بۆ پیرو پەککەوتووانە، هەرگیز نەمزانیوە کە ئەمەندە قووڵ‌و وردبین‌و پڕ لە یاسای بەرزە، چی بکەم؟ کەس پێی نەوتووم! کەچی بەسەدان کەس هەن درۆو دەلەسە ڕێکئەخەن‌و مێشکی خەڵکی پێئەئاخنن.

جوان: ددانی پیادا ئەنێم ئیسلام لە دڵو دەروونی ئادەمیزادەوە زۆر نزیکەو یاسای چەند ژنێتیی ستەمکردن نییە لە ئافرەت، بەڵکو چاکەوخێری ئافرەتی تێدا هەیە، بەڵام خەڵك لێی تێنەگەیشتووە.

**دڵپاك:** ئەوەی لە گیانی چەند ژنێتیی لە ئیسلام تێبگات، بۆی دەرئەکەوێ کە چەند ژنێتیی خزمەتکردنی ئافرەتە، پاراستنی مافی ئەوی تێدایە، بەڵام خوشکەکانم، ئەبێ ئێمە خۆمان بەدوای ڕاستییدا بگەڕێین، چونکە خوێندەوارین و خەڵکیش بە ڕۆشنبیرمان ناو ئەبات، بەڕاستی حەیفە ئێمەی خوێندەوار، دەماو دەم، یان لە کۆڵان و جادەکاندا، یا بەهۆی هەندێ کوڕو پیرەوە بمانەوێ ڕاستیمان بێتە باوەش، یان بەرنامەی ژیانی خۆمان لەسەر ئەو بنەڕەتە دابمەزرێنین! حەیفە مێشکمان نەخەینە کارەوەو ڕێگەی ڕاست نەگرینە بەر! ئێمە ئەبێ ڕێگە نیشانی خەڵك بدەین، نەك بە کوێرانە دوای خەڵك بکەوین.

# بەشی نۆیەم

## چەند مێردێتیی مەحاڵە

ئاواز: مەسەلەی چەند ژنێتیی ئەگەر دوو لایەنە بوایە، ئەوسا ئەمانتوانی بڵێین خزمەتی ئافرەت ئەکات، بەداڕشتنێکی تر، ئەی بۆچی ژنێکیش چەند مێردێکی نەبێت! لە کاتێکدا ژمارەی پیاوان زۆر بێت؟

دڵپاک: ئەو کارە ئەگەر بەکەڵك و لەبار بوایە، خوای گەورە کە لە هەموو زانایەك زاناترە، بەڕەوای ئەبینی و بڕیاری لەسەر ئەدا، دیارە بڕیار لەسەرنەدانی لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵگەیە لەسەر زیانی.

ئەم پێشنیارەی کە دەستت کەوتووە، سرووشتو ڕەوشتو واقیع دژی ئەوەستنو قێزی لێئەکەنەوەو کارێکی نەگونجاوە، چونکە هەر وەك ئەزانین ئافرەت لە ساڵێکدا یەکجار سك ئەکات، ئەوەش یەك پیاو یان دە پیاوی هەبێت زیاتر کەمی پێناکرێت، واتە بەرهەمی دوو، سێ، یان دە پیاو ئەوپەڕەکەی لە ساڵێکدا لەو ئافرەتە تەنیا یەك یا بڵێین دوو مناڵە. ئەویش ئەگەر دووانەی ببێ. دەی ئەو مناڵە بەهی کامیان دابنرێت؟ ئایا بەنۆرە بەخێوی بکەنو پێداویستی بۆ بکڕن؟ ئایا لەڕووی سۆزو میهرەبانییەوە هەموویان ئەتوانن جێگەی باوکێکی ڕاستەقینەی بگرنەوە؟ لە کاتێکدا ئەگەر تەنانەت دە ژنیش یەك مێردیان ببێ، بەرهەمی ئەو ژنانە لەڕووی مناڵەوە ڕەنگە بەشێوەیەکی سرووشتی بڕوات بەڕێوە، واتە: مەترسیی کەمبوونەوەی مرۆڤ لەئارادا نابێت.

با ئەوە بێنینە پێش چاومان کە کۆمەڵێك دانیشتوونو خەریکن چا ئەخۆنەوە، چوار پیاڵەو یەك کەوچکیان لایە، چۆن چاکانیان تێك هەڵبدەن، واتە چۆن شەکرەکە بتوێننەوە؟

پرشنگ: جا ئەوە چی تیایە؟ یەك لەدوای یەك کەوچکەکە بەکارئەهێنن.

دڵپاک: قسەکەت ڕاستو جوانە، ئەی ئەگەر یەك پیاڵەو چوار کەوچکییان لابێت، ئایا ژیریی پەسەندی ئەکات هەر چوار کەوچکەکە بخەنە ناو تاکە پیاڵەکە؟ ئەگەر ئەوە بکەن چا خواردنەوەکە وەك جاری پێشوو بەجوانی باری خۆی وەرئەگرێت؟

نەشمین: هەردوو پرسیارەکە لە نا بەولاوە وەڵامی تر ناگرنە خۆیان.

دڵپاک: دەی حالەتی یەکەم، واتە یەك کەوچكو چوار پیاڵەکە چەند ژنێتیی، دووەمیش، چوار کەوچكو یەك پیاڵە چەند مێردێتییەوە، ئایا ئێوەو ژیریو ژیربێژی ئەو کارە پەسەندە بەلاتانەوە؟

سکالا: ئێمە نا، بەڵام ئەوەتا ئاواز بۆی بۆتە داخواز.

ئاواز: باشە، چی تیایە ئەگەر یەکە یەکە لەکاتی تێکهەڵدانی شەکرەکەدا، هەر یەکەیان بەسەرە کەوچکی خۆی بەکار بهێنێو چای خۆی بخواتەوە؟ دەی با پیاڵەکە هەر جارەی بۆ یەکێکیان بێت، ناکرێت؟

دڵپاک: دەی تۆ چۆن ئەیسەلمێنی کە ئەو چوار کەسە ئەونۆرەو سەرەکارییەیان بەدڵەو پێی ڕازین؟ خۆ ئاشکرایە بەکارهێنانی یەك پیاڵە لەلایەن چوار کەسەوە لەیەککاتدا ناگونجێو مەحاڵە، ئایا ئەکرێت هەریەکەیان قومێکی لێبدات؟

جوان: کاری وەها مەگەر سەگ گەلو ئاژەڵەکان بیکەن، نەك ئادەمیزاد.

دڵپاك: خاڵێكی تر، وەك باسمانكرد لە زۆربەی یاساكانی كۆنو تازەی گێتییدا، سەرپەرشتیاریی كاری پیاوە، خۆ ئایینەكانیش لەوەدا هەموویان یەك قسەن، جا ئەگەر چەند مێردێتیی وەك چەند ژنێتیی ڕێی پێبدرێت، سەرپەرشتیاری بەكامیان بسپێردرێت؟ ژنەكە چوار سەرپەرشتیاری بەلاوە پەسەندە؟ خۆ ئەوەتا لەوەدا نەیاری یەك دانەیە، وەی لەوەی چوار دانەی هەبێت! ئەی ئەگەر تەنیا بۆ یەكێكیان گەردن كەچ بكات، ئەوانیتر نایكەن، بەهەراو گاڵە لەگەڵیا؟ ئەی ئەو پیاوە نادەن بە لووتا، بێدەنگ ئەبن بەرامبەری؟ ئەو كەسەش تۆسكاڵێ ژیری هەبێت، ئەزانێ كە ئافرەت لەو ڕێگەیەوە، بەتایبەتی لەڕووی كاری سێكسییەوە، تووشی چەندەها دەردەسەریی و وەڕسیی و نەخۆشی لاشەیی و دەروونیی دەبێت، چەندەها گیروگرفتی ناهەمواری ناخۆشو ئەنجامی نالەبار ڕوو ئەكەنە ئەو خێزانە، ئەگەر ناوی خێزانی بەسەرا هەڵبدەین، بەڕاستی زیانی ئەو كارە ئەوەندە زۆرە لە ژماردن نایەتو هەق هەیە پسپۆڕێك لەسەری بنووسێت.

ئەوەندە هەیە، چەند مێردێتیی بۆ ئافرەت، كارێكە ژیریی بە پیسو گونجاوو شەریعەت بە گوناحو تاوانو سرووشت بە مەحاڵی ئەزانن، هەركەسێك خۆی بە ئادەمیزاد بزانێ قێزی لێ ئەكاتەوە، مەگەر كەسێك ئەوەی بەلاوە چاك بێت، كە بەرەڵڵایی خوازو بێئابڕوو داوێن پیسو بەدناوو ڕەوشت، بۆگەن بێت، داوای لێبوردنیش لە خوشكە ئاواز ئەكەمو مەبەستم ئەو نییە، چونكە ئەزانم بیرەكە هی خۆی نییەو گەیەنراوەتە گوێی.

## چەند ژنێتی مەرجدارە

سكاڵا: چاك لەبیرمەو نەمهێشتووە لە بیرم بچێتەوە كە گوتت: "ئیسلام لەهەموو كاتو بارێكدا ڕێی چەند ژنێتیی نادات. ئادەی ئەوەمان بۆ ڕوون بكەرەوە، یانی چی؟

دڵپاك: ڕاست ئەكەی، زیاتر لەوەش، گوتمان چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا سنووردارە، مەرجداریشە، هەروەها پێویستیش نییە.

یاسا قورئانییەكە ئەفەرموێت: (فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء..)، ئەوەش ڕێی ڕەوایی كارەكە ئەدات نەك پێویستكردنی، دەی لەبەرئەوەی ڕێی ڕەوایی داوە، نەك پێویستكردن، پیاوی مسوڵمان بۆی هەیە تەنها یەك ژنی هەبێت، بۆیشی هەیە چەند ژنێتیی بەكار بێنێ، ئەو ڕایەش ڕای موجتەهیدانو فوقەهای بەكۆمەڵو لە هەموو چەرخێكداو لە مەشدا هیچ جۆرە جیاوازییەكیان لەنێواندا نییە.

سنووردارەو زیاتر لە چوار ئافرەت لەیەككاتدا، چوونە دەرەوەیە لە یاسای ئیسلام، چونكە خوا ئەفەرموێت: (مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاع). واتە: دوو، سێ، چوار، كە چوار دوا سنوورەو لەوە بەولاوە تێپەڕ ناكا، ئەم ڕایەش ڕای كۆمەڵی یارانی پێغەمبەر ﷺو پێشەوا موجتەهیدەكانی هەموو چەرخەكانە، هەر كەسێكیش لەو ڕایە دەرچوو بێت یان دەربچێت، جگە لە تێنەگەیشتن لە ڕەوانبێژیی قورئان، هیچی تر نییە.

هەروەها (مالك) لە (الموطأ) و (نسائي ودار القطني) لە (السنن)ە كەیاندا ئەگێڕنەوە: "غیلانی كوڕی سەلمەی ئەلسەقەفی، كاتێ موسڵمان بوو دە ژنی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (اختر منهن أربعا وفارق سائرهن)، واتە: چواریان لێ هەڵبژێرەو واز لەوانی تریان بێنە".

لە (سنن)ی ئەبو داوددا هاتووە: "حارسی كوڕی قەیس وتی: كاتێ موسڵمان بووم هەشت ژنم هەبوو، بە پێغەمبەرم ﷺ ڕاگەیاند، فەرمووی پێم: (أختر منهن أربعا) واتە چواریان لێ هەڵبژێرە".

نەشمین: بەڵێ وا بۆمان دەركەوت كە پێویست نییەو لەچوار زیاتر نابێت، بەڵام ئەی مەرجدارییەكەی چۆنە؟

دڵپاك: مەرجەكەی دادگەرییە، دادگەری، هەر لە یاسای ژمارەی (٣)ی سورەتی (النساء)دا، دوا بەدوای یاسای چەند ژنێتیی خوا ئەفەرموێت: (فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُوا).

جا بەپێی یاساكە هەركەسێك دڵنیا نەبێت لە تواناى خۆی كە بتوانێ ئەو ژنانە بە هەموو جۆرێك ئاتاج نەكات، لە ڕووی شەرعییەوە بۆی نییە لە ژنێك زیاتر مارە بكات، واتە ئەبێ ژیانیان بەهەموو واتایەكی وشەی ژیان بۆ دابین بكات، لە

جلوبەرگ‌و خۆراك‌و جێی ژیان‌و هەموو پێداویستییەكانی ژیانی كەسێكی ناوەندی ئەو چەرخەی كە تێیدا ئەژین، ئەو ژیانەش وەها بژین‌و لە هاوچەشنانیان كەمتر نەبن، لەوەش گرنگتر ئەبێ لەمانەوە بەلایانەوە بەشەودا بەشیان وەكو یەك بێت، جا ئەگەر وەهای كرد دیارە دادگەریی بەجێهێناوە، خۆ ئەگەر وا نەبوو ئەوە لەدادگەریی لایداوەو مەرجەكەی شكاندووە، بەوەش خۆی خستۆتە باوەشی تاوان‌و ستەمكارییەوە، خوای میهرەبانیش دژی ستەم‌و ستەمكارییە، ئەوەتا لە فەرموودەیەكی قودسیدا ئەفەرموێ: (یا عبادي اني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بینكم محرما، فلا تظالموا)[1]. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (من كانت له امرأتان فمال الى احداهما جاء یوم القیامة أحد شقیه مائل)[2]. دیسان ئەفەرموێ: (ان المقسطین عند الله على منابر من نور عن یمین الرحمن، وكلتا یدیه یمین، الذین یعدلون في حكمهم وأهلیهم وما ولوا)[3].

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ‌كە، ئەی پیاوان، بەو مەرجە دەتوانن چەند ژنێتیی بكەن كە پەیڕەوی دادگەریی لەنێوانیاندا بكەن، ئەگەر ئەزانن ئەوەتان بۆ ناكرێت، نەكەن دەست بدەنە چەند ژنێتیی، یا نەكەونە ستەمكارییەوە، هەروەك چەند جارێكی تر دووبارەمان كردەوە، ئیسلام ئەو كارەی بۆ كاتی پێویست هێشتووەتەوە، نەك بۆ هەوەسبازی، جا نازانم تای ترستان نزم بۆوە یان هەروەكو خۆی بە بەرزیی ماوەتەوە؟

سكالاّ: من (تا) بەریدام، جا بۆ ئەمانی تر نازانم، كارەكە (تا) دار نییەو سەلامەتە.

دڵپاك: ئایەتەكە ماناكەی زۆر وردە، ڕەنگە لەوە ورد نەبووبنەوە كە فەرمووی (ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلاَّ تَعُولُواْ) دیارەو ڕوونە كە لەوەدا بەستنەوەی پیاوی تێدایە، بەستنەوە بەلایەنی ئابووریی پیاوەوە، یانی هەروەك ستەمكردن نابێ ببێ، هەر بەو جۆرەش نابێ چەند ژنێتیی ببێتە مایەی هەژاریی پیاوەكە، خۆ دیارە ئەگەر هەژار بێت هەر لەسەرەتاوە نابێت‌و ناتوانێ چەند ژنێتیی بەكار بێنێ، هەروەها نابێ ئەو كارە ببێتە هۆی هەژاریی بۆی بەهۆی زۆریی ژن‌و ماڵ‌و منداڵەوە، چونكە ئەو كاتە لاتیی‌و هەژاریی چنگ ئەگرنە قورگیان‌و پیاوەكەش تووشی ستەمكاریی ئەبێت.

واتە پیاوێك مافی چوار ژنێتیی هەیە، كە توانای ئابووری هەبێت، دەستەڵاتی بەخێوكردن‌و مەسروف كێشانی ژن‌و منداڵەكانی هەبێت بە پێی ژیانی ڕۆژگار، ئەمەش پێشئەوەی دەست بداتە ژنهێنانەكە، نەك پاش ژنهێنانەكە، دەی خوشكەكانم، هەروەك ئەزانن پیاوان هەموویان ئەو مەرجانەیان تێدا نییە، هەموویان دەوڵەمەند نین، هەیانە هەژارە، هەیە شێتە، ئیفلیجە، پەككەوتوو نەخۆشیان هەیە، ئەی نابێ بیر لەوەش بكەنەوە؟ ئەی خوا ژیریی بۆچی پێبەخشیون؟

سكالاّ: دەی یاخوا هیچ پیاوێ لەبەشی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی زیاتری نەبێت.

ئاواز: من لەم جۆرە یاسایانەدا ئەوەندە بەقووڵ دانەچووم، نازانم.

جوان: دەی مادام وابێ بەكوێرانە هێرش ئەبەینە سەر ئیسلام، هەرچیش بەكوێرانە بكرێت ڕاست نییە، واتە دڵپاك ڕاست ئەكات، چونكە بەقووڵیی لەباسەكە گەیشتووەو ئەیزانێ‌و ئەوەتا بۆ ئێمەشی شیی ئەكاتەوە.

دڵپاك: هەر حوكمێك لەسەر بنەڕەتی نەزانیی بدرێت ئەوە حوكمێكی ناڕاستە، ئەمەش ڕاستییەكە زانیاریی سەلماندوویەتیی‌و لە باخەڵی خۆما دەرم نەهێناوە.

كورتەی باسەكەش ئەمەیە:

یاسای چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا یاسایەكی جوانی ڕەوشت پاكییە، چونكە ناهێڵێ پەیوەندیی بە هیچ ئافرەتێكەوە بكات جگە لە ژنی خۆی كە بەڕێگەی شەرعیی مارەی كردبێت‌و ژمارەی ژنانیش بۆ یەك پیاو، وەك باسمان كرد دیاریكراوە، هەر كە پیاویش ڕێی دلوێن پیسی لێگیرا دیارە بەوەش داوین پاكیی ئافرەت پارێزراو ئەبێت.

هەروەها یاسایەكی مرۆڤایەتیشە، چونكە گیروگرفتی كۆمەڵگە سووك‌و ئاسان ئەكات، جێكردنەوەی ئافرەتی بێمێرد، لە شوێنێكی وەك لای مێرد، لە قاڵبی پاراستن‌و پەیوەندییەكی لاشەیی‌و گیانییدا، ئایا ڕێزو شكۆی ئافرەتی تێدا نییە؟ گەر لەوەدا نەبێت، ئەی لەچیدا هەیە؟

---

[1] رواه مسلم.

[2] رواه أبو داود وابن ماجه والترمذي وابن حبان .

[3] رواه مسلم.

پرشنگ: لەڕاستییدا مەسەلەی ئافرەت لە ئیسلامدا بەو جۆرەش نییە کە هەندێ کەس بەو ڕەقییە باسی ئەکات! نازانم بڵێم چی!

سکالا: ئەی بۆچی نەڵێین: لە ڕاستیدا ئێمە ئیسلام ناناسین و نەزانین؟

## چەند ژنێتیی دەرمانی دەردی کۆمەڵگەیە

سکالا: گەیشتوومەتە ئەو قایلبوونە کە بڵێم چەند ژنێتیی دەرمانێکی گرنگ و بە کەڵکە بۆ کۆمەڵگە، بەڕاستیی ئەم باسە بیری گۆڕیم.

دڵپاك: گومانی تێدا نییە لەوەدا کە دەرمانە، چونکە بەزۆریی لە کاتی پێویستدا دەستی دەدرێتێ، دەس هەڵگرتن لێی، پشت هەڵکردنە لە دەرمانی دەردێکی کۆمەڵایەتیی و ڕەوشتی، گوێنەدانە بە لێقەومانی ئادەمیزاد، نەنگ و زیان لەیاساکەدا بۆ ئافرەت نییە، بەڵکو ئەگەر زیانێك یان نەنگێك هاتە ڕێی ئافرەت لەم ڕووەوە، ئەبێ بزانین ئەو زیان و نەنگە لەو کەسانەوەیە کە یاساکە بەجێ ئەهێنن، بەلام لەشێوەیەکی لارو چەوتا، ئیتر ئەو کەسانە پیاو بن یا ئافرەت، بەهەڵە بێت یان بە ئەنقەست.

هیچ سەیر نییە ئەگەر کەسێك یان کەسانێك کەژ یان بەخواردن و خواردنەوەو خەوتن و لێپەڕین بزانن، دەست بدەنە ژنهێنان و شووکردن و تەلاقدان و تەلاق لێ سەندن، بەبێئەوەی گوێ بدەنە ئەنجامی ڕەشی ئەو کارانەیان، بەبێئەوەی بیر بکەنەوە لەو پاشەڕۆژە ڕەشەی کە چاوەڕوانی کەسوکارو منداڵەکانیان ئەکات.

پرشنگ: دەی خۆ ئەو یاسایە یاسای خوایەو نابێ قەدەغە بکرێت، ئەو جۆرە کەسانەی کە ئاماژەت بۆ کردن هەن و ئەبن، ئەی چار چییە؟

دڵپاك: پرسیارەکەت زۆر جوانە، ئەگەر دەسەلات لەدەست ئیسلامدا نەبوو، دیارە نابێ سەرزەنشتی ئیسلام بکەین، ئەوەتا ئەبینین هەزارەها تاوان ئەکرێت و ڕوو ئەدات، ئەمیش با یەکێك بێت وەك ئەوان، وەك پێشینان وتوویانە (نۆ وەبادی دە).

ئەگەر ئیسلام دەستەلاتی لە دەستدا هەبوو، ئەوە ئەبێ بەتەنها لەکاتی پێویستدا، دەستی بۆ ببرێت، واتە بەستنی بەمەرجەکانییەوە چاکترین چارەسەرە. هەروەها پاککردنەوەی دەروون، ڕۆشنکردنەوەی مەسەلەکە بۆ هەمووان، بەرزکردنەوەی پلەی ڕۆشنبیری جەماوەری، گەیاندنی سەلمێنراوە ئاینییەکان بە خەڵك، زانینی ئەرك و ماف، ئەمانەش هەموویان هۆو ڕێگەن بۆ چاك جێبەجێکردنی یاسا خواییەکە.

شتێکی تری گرنگ لە مەسەلەکەدا هەیەو نابێ لەبیری خۆمانی ببەینەوە، ئەویش ئەوەیە ئافرەت خۆی لەو چەند ژنێتییەدا ئەتوانێ سەربەستی خۆی بخاتە کارەوەو خۆی لێی بەدوور بگرێت، دیارە ئەوەش کەڵکی هەم بۆ ئافرەت و هەم بۆ پیاو هەیە.

نەشمین: تۆ ئەوەیان بڵێ، بەلام پێمان بڵێ چۆنە؟

دڵپاك: ئافرەت لەئیسلامدا بەزۆر نادرێت بەشوو، ئەڵێم لە ئیسلامداو بەپێی ئیسلام، نەك لەناو بەناو موسڵمانانددا، دەی گریمان کابرایەك ژنێك یان دوانی هەیەو دێت داوای تۆیش ئەکات، نەشمین خان، خۆ بەزۆر نابێ ناچارت بکەن، ئەوسا ئایا لە شووکردن و پێ نەکردنیدا سەربەست نیت؟ ئەگەر زانیت خاوەن ژن و منداڵەو بەڕەزامەندی خۆت شووت پێکرد، خۆت تاوانباری یان ئیسلام، ئەگەر ئەوە بەتاوان دانرا؟

نەشمین: بێگومان تاوان هی منەو ئیسلام گلەیی لەسەر نییە.

ئاواز: ئەوە زۆر جوان و ڕاستە، بەلام ئەی ژنە کۆنەکە یان کۆنەکان؟

دڵپاك: ئەبێ ئاگاداریان بکات، ئەگەر ڕازی بوون ئەوا سەربەستی خۆیانیان بەکار هێناوەو بڕاوەتەوە، ئەگەر ناڕازی بوون، ئەو ناڕازێتیی و پێناخۆشبوونە لەبەر دوو هۆیە، یان بەخیلیی و خۆپەرستییە، یاخود لەبەر نەبوونی دادگەرییە لەنێوانیاندا، جا ئەگەر هۆیەکە یەکەمیان بوو ئەوا هیچ، چونکە ئیسلام دژی بەخیلیی و خۆپەرستییە، خۆ ئەگەر دووەمیان

بوو، ژنە کۆنەکە یان کۆنەکان، ئەتوانن خۆیان بگەیەننە دادگاو سکاڵای خۆیان بکەن و گیروگرفتەکەیان ڕۆشن بکەنەوە بۆ دادوەر، پاش دەرکەوتنی ڕاستیی سکاڵاکەیان دوو ڕێگەیان بۆ دائەنرێت. یەکەمیان، مێردەکەیان بەجێبهێڵن و تەڵاقی لێبسێنن. دووەمیان، پیاوەکە وازی پێبهێنرێت یان واز بهێنێ لە ژنهێنانەکەی.

سکاڵا: ئەی ئەگەر ژنە کۆنەکە یان کۆنەکان کاتێکیان زانی بووک گەیشتە بەر دەرگا، ئەوسا چی ئەبێ؟

دڵپاك: بووك ئەگەر ئاگادار کرابێت ئەوە هیچ، ئەگەر نەکرابێت بێگومان پیاوەکە تاوانبارە، کۆنەکەش یان کۆنەکانیش ئەو ڕێگەیە ئەگرن کە کەمێك لەمەوبەر باسمان کردن.

سکاڵا: ئۆخەی دڵم ئاوی خواردەوە، دڵنیایی تەواوم دەست کەوت، ئیتر لەمەودوا هەر وا بەئاسانی هەڵناخەڵەتێم، ئەی خوایە گیان، ڕێگەی تۆ تەواوە، ڕاستە، یاساکانت بێوێنەن، بەڵام شاراوەنەتەوە لێمان، ناهێڵن پێیان بزانین و بیانناسین، ئەی خوا بەزەییت.. بەزەییت.

## چەند ژنێتیی لەناو ئێمەو ئەواندا

پرشنگ: باشە، پێم ناڵێیت ئەم گیروگرفتە بۆچی هەر لەناو مسوڵمانانندا هەیەو ماوەتەوە؟ ئەی بۆچی لەخۆرئاواو خۆرهەڵاتدا لەناو بیروباوەڕەکانی تردا نییەو باس ناکرێت؟

دڵپاك: ئەم پرسیارەشت زۆر جوان و پڕ لە وردبیرییە، ڕاست ئەکەی بەزۆریی لەناو موسڵماناندا ئەم گیروگرفتە هەیە، هۆی ئەمەش ئەوەیە مسوڵمانان بەهۆی پاکیی ئایینەکەیانەوە، ڕەواو ناڕەوا ناخەنە پشتگوێ و بە تەنگ ڕەواوە دێن، هەوڵدەدەن تووشی حەرامکاریی نەیەن، بەڵام ئەوانی تر لە وەدا وەك موسڵمانان نین و حەرام و حەڵاڵیان بەلاوە نییە.

چەند ژنێتیی لەناو مسوڵماناندا، لەخۆرهەڵات بێ یان خۆرئاوا، هەیە، بەڵام نەك بەپێی بڕیاری یاسا، یان شەریعەت کەچی بە بەرچاوی یاساو شەریعەتیشەوە هەیەو ئەکرێت، بەناوی ژنهێنان و شووکردنەوە نا، بەڵکو بەناوی هاوڕێیەتییەوە، لە چوار ژندا ناوەستێتەوە، بەڵکو ژمارەکەی سنووری بۆ نییە، بەئاشکرا نا کە ئاهەنگی بۆ بگێڕێت و دوو خێزان یان دوو هۆز بەو هۆیەوە ببن بە خزمی یەکتری، بەبێئەوەی خەڵك بەشداریی ئاهەنگی هاوسەرێتییان بکات، بەڵام بەدزیی و نیمچە دزیی و بێئاگایی خەڵك، لەوەش سەیرترو سەرسوڕهێنە تر:

پیاو ناچار ناکرێت کە بەشداری بەرپرسیاریی ئافرەت بکەن لە ئەنجامی ئەو کارەدا، چ لەڕووی دارایی و چ لە ڕووەکانی ترەوە، بەس هەر تەنها ئەوەی لەسەرە ئابڕووی ئافرەتەکە بتکێنێت و ئیتر با هەر بناڵێنێ بەدەست ئێشی سکپڕبوون و ژانی بەرپێ خستن و منداڵبوونی ناشەرعییەوە.

ئایا خۆرهەڵاتی و خۆرئاواییەکان ـ نا مسوڵمانەکانیان ـ پیاو ناچار ئەکەن کە ددان بنێت بەو منداڵەدا کە لەدایك ئەبێت، لە ڕێگەی کاری سێکسی ناڕەواوە، کە هی ئەوە؟ بەشداریی ئەکات لە بەخێوکردنیا؟ بە ناشەرعیی ناو نابرێن؟ بەدرێژایی تەمەنی، ئەو منداڵە هەست بە بێ باوکێتیی و زۆڵیی و لەکەداریی خۆی ناکات؟ ئەگەر نەیشیکات، ئەو کۆمەڵگەیە چۆن کۆمەڵگەیەکە کە هەمووی زۆڵ و زۆڵ ئاوردە بێت؟ جیاوازیی ئەو کۆمەڵگەیە لە کۆمەڵێ وڵاخ و ئاژەڵی تر چییە؟ ئەی بۆچی پێی ئەوترێت ئادەمیزاد؟

چەند ژنێتیی ئەوان لە هەموو هەڵسوکەوت و کارێکی ڕەوشتیی و زیندەیەتیی ویژدان و هەستێکی مرۆڤانەوە دوورە، لە خۆپەرستیی و هەوەسبازیی بەو لاوە تێپەڕ ناکات، دەی جا وەك خوا لێخۆشبوو (شێخ محمد أبو زهرة) ئەڵێت، چەند ژنێتیی حەڵاڵ لە چەند ژنێتیی بەناو هاوڕێ چاکتر نییە؟[1].

دەی چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا گونجاوو پاکترو هەوەس دامرکێنەرترەو بۆ ئافرەت بەسوود ترو بۆ مرۆڤایەتیی لەبارترە، یان لەناو نامسوڵماندا؟ کامیان پێشکەوتووترە؟ کامیان لەژیریی و ژیربێژییەوە نزیکترە؟ کامیان پاکترە، ئەو

---

[1] "ان تعد الحلائل خير من تعدد الخلائل"، تعدد الزوجات في الاسلام: عبدالله علوان.

ژیانەی کە لەگەڵ چوار ئافرەتی حەڵاڵدا ببرێتە سەر، یاخۆ شەوێ لەگەڵ ئافرەتێکی دەستاو دەست پێکراودا؟ کامیان چاکترە، ئەو منداڵەی کە دایکو باوکی خۆی ئەناسێو لەناویاندا بەنازداریی پێئەگات، یان ئەوەیان کە بە زۆڵیی کەوتۆتەوەو باوکی مستر، نەزانراوە؟!

جوان: بەڕاستیی ئیسلام گەورەیە، ڕێبازێکی بەرزە، بەرنامەیەکی خوایی و پڕ لە حیکمەتە، خۆزگەم بەوانەی ئەیناسن و لەگەڵیا ئەژین.

بەخوا خوشکە دڵپاک، ئەگەر خۆمان بەمرۆڤ دابنێین، دیارە ئەوەی ئیسلام، خێری مرۆڤایەتیی تیایە، ئەوەندەش هەیە، خوا ئاییني ئیسلامیی بۆ ئادەمیزاد ناردووە نەك ئاژەڵ، جا ئەگەر ئاژەڵ پەیڕەویی ئەو ئایینەی نەکرد، نابێ گلەیی لێبکرێت.

دڵپاك: قسەکانت هەموویان ڕاستن، بەڵام کاتێ کوفر دێتە گۆ سەبارەت بە نەنگو پیسییەکانی خۆی چاو دائەخاتو چاکی ئێمە وا باس ئەکات کە قیزەون دەر بکەوێ، ئێمەش هەر وا بە سادەیی باوەڕ ئەکەین.

ئەو هەموو داوێن پیسییەی کە لەناویاندایە، ئەو زۆڵانەی کە هەر ساڵێك ژمارەیان ئەگاتە ملیۆنەها، ئەو هەموو جەورو ستەمەی کە ئەیکەن لە ئافرەت، ئەو مۆری نەنگو شوورەییەی کە ئەینێن بەناوچاوانی مرۆڤایەتییدا بەچاکی ئەزانن و گوێی نادەنێ، هەروەك هیچ ڕووی نەدابێ، کەچی دنیایان پڕ کردووە لە پڕوپاگەندە دژی ئیسلام، کە چەند ژنێتیی تێدا هەیە، لە کاتێکدا ئیسلام پیاو ناچار ئەکات کە بەرپرسیاریی ئەدەبیی و دارایی بگرێتە ئەستۆ لە مەسەلەی چەند ژنایەتییەکەدا.

پرشنگ: شەوگار درەنگەو ئەبێ بەیانیش زوو هەڵسین.

## خۆرئاواییەکان ئاوڕیان لێداوەتەوە

سکاڵا: چەند ژنێتیی، ئەو هەموو کەڵکانەی هەیەو بەو شێوەیە کۆمەڵگە ئەپارێزێ لە گێروگرفت، چۆن خۆرئاواییەکان ئاوڕیان لێنەداوەتەوە؟

دڵپاك: ناتوانین بڵێین ئاوەڕیان لێنەداوەتەوە، بەڵکو ژمارەیەك لەنووسەرو بیرکەرەوەو زاناکانیان، زۆر بە پەرۆشەوە بانگەوازیان بۆ کردووەو هاندانو شتیان بەکارهێناوەو کەڵکی ئەو کارەیان بۆ کۆمەڵگە باسکردووە، جا هەر بۆ نموونە، نەك هەڵدان، با لەم پەڕاوەی (عەبدوڵڵا علوان)دا تەماشایەك بکەین، ئەها تەماشاکە با لەلاپەڕە بیستەوە دەست پێبکەین:

- (جروتیوس) زانایەکی بەناوبانگە لە یاسادا، بە پەرۆشەوە لە چەند ژنێتیی کۆڵیوەتەوەو شەریعەتی ئابە عیبرانییەکانو پێغەمبەرانی سەردەمی کۆنی زۆر بەچاك هاتۆتە بەرچاو لەڕووی چەند ژنێتییەوە.
- فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانیی (شو بنهور)، لە نامیلکەکەی (وشەیەك دەربارەی ئافرەت)دا ئەڵێت: "یاسای هاوسەرێتیی لە ئەورووپادا لەسەر بنەڕەتێکی گەنیو دامەزراوە، چونکە یەکسانیی ڕەچاو ئەکات لەنێوان ئافرەت پیاودا، وای لێکردووین کە لەیەك ژن زیاترمان نەبێت، بەوەش نیوەی مافمان بزرمان کردووە، ئەرکی سەرشانیشمان دووقات بۆتەوە..".

دیسانەوە ئەڵێت: "لەو ئەو نەتەوانەدا کە چەند ژنێتییان تێدا هەیە، ئافرەت بەدی ناکرێت کە خۆی خۆی بەخێو بکات، چونکە مێردیان هەیە، بەڵام لای ئێمە (واتە لە ئەورووپادا)، مێردداران ژمارەیان کەمە، بێ مێردان لەژماردن نایەن، بەخێوکەریشیان نییە، لە چینە بەرزەکاندا کچ ئەبینی پیر بووەو دڵتەنگو وەڕس لەژیان، لە چینە نزمەکانیشدا، چەندەها ئافرەتی لاوازو هەژار ئەبینی کە تاڵاو ئەچێژن، قورسترین ئیش وا بەسەر شانیانەوە، تیایانەیە ئابڕووی خۆی فرۆشتووەو بە ناپاکیی و کوێرەوەریی ئەسووڕێتەوەو ئەژیو مۆری نەنگو شوورەیی بەناوچاوانییەوە دیارە، تەنیا لە شاری (لەندەن)دا، هەشتا هەزار کچی دەستاو دەست پێکراو هەیە کە خوێنیی شەرەفیان تکاوە لەبەر زەحمەتی شووکردن و

بوونەتە قۆچی قوربانی یەك ژنێتیی لەئەنجامی لووت بەرزیی و نەهاتنەوە خوارەوەی خانمی ئەوروپیی و شانازییکردنی بەخۆیەوە، دەی ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە چەند ژنێتی بە حەقیقەتێکی پڕ لەسوود بۆ ڕەگەزی ئافرەت بژمێردرێن؟"[1].

. غوستان لوبون، لە پەڕاوەکەیدا (حضارة العرب)، دەڵێت: "باوەڕ بوون بە ڕێبازی چەند ژنێتیی ڕۆژهەڵاتییەکان ڕێبازێکی چاکە، چونکە ئاستی ڕەوشت لەناو ئەو نەتەوانەدا بەرز ڕاگیر ئەکات و پەیوەندیی خێزان بەتین ئەکات و ڕێزو بەختیارییەکی وەها ئەبەخشێ بەئافرەت کە ئەوروپا بەخۆیەوە نەیدیوە".

. لیبون ئەڵێت: "هەر ئەبێ یاسا ئەوروپییەکان ڕێگەی چەند ژنێتیی بدەن".

. مامۆستا (اهر نفیل) ئەڵێت: "چەند ژنێتیی کارێکی پێویستە بۆ پاراستن و مانەوەی ڕەگەزی ئاریی".

. ئەنی بیزانت کە سەرکردەی (التیصوفیة العالمیة) کە ئافرەتە، لە پەڕاوەکەیدا (الادیان المنتشرة في الهند)دا ئەڵێت: "هەرکاتێ کاروبارمانمان بە تەرازوو پێوەرێکی ڕاست کێشانەو پێوانە کرد، بۆمان دەرئەکەوێ کە یاسای چەند ژنێتیی لە ئیسلامدا . کە پاراستن و ئاگادارییکردن و خۆراك پێدان و پۆشاك بۆ پەیداکردنی تێدا بۆ ئافرەت ئەبینرێت . هەر زۆر بەکەڵکترە بۆ ژن لە سەڵیتەگەریی ئافرەت لە خۆرئاوادا، کە پیاو لە خۆرئاوا ئافرەتێك هەڵئەخەڵەتێنێ و هەوەسی خۆی پێ تێر ئەکا، کە لە هەوەسبازیی تێری نۆشی، ئیتر بەرەڵڵای ئەکات و دەری ئەکاتە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکان".

. ڕۆژنامەی (دیلی میل)ی ئینگلیزی، وتارێکی بڵاوکردەوە، گەلێ بەرگریی لە چەند ژنێتیی کردو گلەیی لەو گیروگرفتانەش کرد کە لە ئینگلتەرەدا بوونەتە بەشێك لە ژیانی ئافرەت، تیایدا هاتبوو: "ڕێدان بە چەند ژنێتیی تاکە ڕێگەیە کە چارەسەرێکی سەرکەوتووانە بێت، یەك ژنێتیش جگە لە لەسەر ڕاهاتن و باوەڕپێبوون بەولاوە هیچی تر نییە، ئەمەش لەڕاستیی و لەواقیعدا ئەنجامی ژمارەو نیسبەتە". لەسەری ئەڕوات و ئەڵێت: "یەك ژن بۆ یەك پیاو ڕێك و چاکترە، بەڵام کاتێ ئەوە ڕێك و چاکترە کە ژمارەی ژن بەقەدەر هی پیاوان بێت، بەڵام هەر کە ژمارەی ژنان بەسەر هی پیاواندا بەرز بۆوە، ئەگەر چارەسەری بۆ دانەنرێت دیارە شەڕو هەرایەکی هاڕێنەر لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا بەرپا ئەبێت".

. دکتور (نظمی لوقا) لە پەڕاوەکەیدا (محمد الرسالة و الرسول) ئەڵێت: "گومانی تێدا نییە کە ڕێبازی یەك ژنێتیی بەشێوەیەکی هەمیشەیی ڕێبازێکی نموونەییە، چاو پیاگێڕانێك بەواقیعی ژیانی مرۆڤدا، هەر لە مێژووی دێرینەوە تا ئێستا، نیشانمان ئەدات کە چەند ژنێتیی هەر پەنای پێبراوە چ بەئاشکراو چ بەنهێنیی، یان لەڕێگەی مۆڵەت وەرگرتنەوە لە ئایین یان لەیاسا، تەنانەت دژ بە ئایین و یاسایش لە گەلێ کات و باردا، هەرکەسیش خاوەنی ژیریی بێت ئەزانێ چەند ژنێتیی مۆڵەت پیدراو لە مۆڵەت پێنەدراو چاکترە..".

سکاڵا: ئەی بۆچی لە قوتابخانەکاندا مامۆستاکانمان کە باسی چەند ژنێتیی و ژیانی ئافرەتیان بۆ ئەکردین، خۆیان لەم جۆرە باسانە نەئەدا؟

ئاواز: سکاڵا پرسیاری زۆر بوو، جا ئیتر خۆتبگرە بۆی دڵپاك.

دڵپاك: ئەی بۆچی نەڵێین، سکاڵا چاوی کرایەوە، هۆشی هاتەوە بەخۆیا؟ بەڵێ خوشکەکانم، ساڵ لەدوای ساڵ خۆرئاواییەکان، بەتایبەتی زاناکانیان بۆیان دەر ئەکەوێ کە یاسای چەند ژنێتیی ئیسلامیی پێویستییەکی مرۆڤایەتییە، بەتایبەتی لەڕووی ڕەوشتەوە، ئای کە چەند ژنێتیی بەرزو بەنرخەکاتێ بەراوردی ئەکەین لەگەڵ ژیانی ئەو ئافرەتانەداکە بێ مێردن، خۆیان ئەگەڕێن بەدوای پیاودا، لەسەر شەقامەکاندا، لەشوێنە پیسە جۆر بەجۆرە زۆرەکاندا هەتا دەستبازیی و گەڵبازی نارەوایان دەسکەوێ، دەی چی بکەن کە بێ مێردن،ماڵێك نییە بەمێردو منداڵەوە بیانگرێتە خۆی، کەسێك نییە ڕێزیان بگرێت یان نازیان بکێشێ، لەبەر ئەوەی کە ئافرەتن، نەك لەو چەند ساتەدا کە لە گەنداوی لێپەڕیندا دەیبەنە سەر، تاوان تاوانی کێیەو هۆیەکەی چییە؟

هەر ئەم جۆرە بیرو سەرنجانە لەو واقیعە تاڵە دڵگوشەرە، یەکێك لە خانمە ئینگلیزییەکانی هێنایە دەنگ و بە فرمێسك ڕژاندنەوە بنووسێت: "بێگومان ئاوارەو دەربەدەر لە کچانمان ئێجگار زۆرە، بەڵام هەموو لایەکی گرتۆتەوە، باسکەرانیش

---

[1] ئەو هەشتا هەزارە لەسەردەمی شوبنهوردا بووە، کە لە (١٨٦٠)دا مردووە، ئێستا زۆر زۆرترن.

دەربارەی هۆی ئەو مەبەستە زۆر کەمن، من کە ئافرەتێکم و پەنجە بۆ ئەو کچانە ڕائەکێشم، خەریکە دڵم لەت و پەت ببێت بۆیان، ئای کە بەزەییم پیادا دێنەوە، بەڵام ئەبێ پەستیی و دڵگرانیی من چ سوودێکیان پێبگەیەنێ، تەنانەت گەر خەڵکیش هەمووی بەشدارییم بکات بێکەڵکە، هەتا دەست نەدرێتە لەناوبردنی ئەو بارە بۆگەنە، ئەی سەد ڕەحمەت لە گیانی پاکی زانای بەڕێز (تومس) کە دەردەکەی بەوردیی تەماشا کردو دەرمانێکی زۆر چاکی بۆ نواند، کە ڕێگەدانی پیاوە لەوەی کە زیاتر لەیەك ژن مارە بکات، بەو بەزمە بێگومان بەڵاکە ئەڕەوێتەوە، کچەکانمان ئەبنە ماڵدار، بەڵا زلەکەی ئێمە لەناچارکردنی پیاوی ئەوروپادایە کە بە یەك ژنەوە بساچێت و ببەسترێتەوە"، "ئەو یەك ژنێتییە کە بۆتە هۆی ئاوارەکردنی کچەکانمان، کە پاڵیان پێوە ئەنێت هەڵسن بەئیشو کاری پیاو، دیارە نەگبەتییەکەش مەزنتر ئەبێت ئەگەر ڕێگا نەدرێت بە پیاو کە چەند ژنێکی هەبێت"[1].

سکاڵا خان، ڕەنگە لات سەیر بێت، کە پاش جەنگی جیهانیی دووهەم، ئافرەتان هەر خۆیان لە ئەڵمانیادا سەرپێچییان لە زیناکردن و بەدڕەوشتیی کردو لێی یاخی بوون، شتەکە دای لەدڵیان، وایان لێهات تفیان لەو ژیانە قێزەونە پیسە ئەکرد، کە هەر وا بە خۆڕایی لە بازاڕی بێئابڕووییەتییدا ئافرەت بەسەری بەرێت و لە ئەنجامیشدا زۆڵ بگرێتە باوەش، کە ئەو بەسەزمانەش پێگەیشت لەناو هاوڕێ باوکدارەکانیدا شەرم لەخۆی بکات، چونکە زۆڵە!

ئەو ساوا جوانەی بەخێوی ئەکا. ئەم هیوای پییە

ئەپرسێت: دایە بۆچ وەك منداڵان من باوکم نییە؟

بۆچی پێم ناڵێیت؟ ئۆف بیری ئەکەم! کوانێ؟ لەکوێیە؟

چۆن تێیگەیەنێ؟ چ دایك، چ کۆرپە، دە چاریان چییە؟

ئافرەتانی ئەڵمانیا سەرپێچییان لە یاسای زیناکردن کردو کەوتنە وتووێژو ڕاوێژکردن و کۆنگرە بەستن، لەدواییدا بڕیارێکی زۆر سەیریان دەرکرد، کە بەبیری خۆرئاوادا لەوانەیە نەهاتبێ!

داوای ئەوەیان کرد کە شووکردن و مێردداریی بەسەرەو بەنۆرە بێت، هەر ئافرەتێك لەگەڵ پیاوێکدا بۆ ماوەیەکی دیارییکراو بژی، ئەمجا لێی جیابێتەوە بۆ ئەوەی ڕێگا چۆڵ بکات بۆ هاوسەرێکی ترو ئەویش بێبەش نەبێت لەو مافە، بۆ ئەم کارە چەندان کۆمەڵیان ڕێکخست و دامەزراندن ئەو داوایەیان بەگەرمی دووبارە ئەکردەوە[2].

لەهەموو لاوە هەستی بەوەکرد، وا لەچەند لاوە

هاوارو ناڵەو سکاڵایەتی، ئۆف! ئەقیژێنێ

ئەڵێ: لەجوانیی و مێیەنیی و فترەم ئاوڕووت کرام

بە پەشیمانیی وەك تاوی باران ئەسرین ئەڕژێنێ

سکاڵا: دەی توخوا با بەرەو بەختیاریی ئافرەت دەست پێبکەین.

## ئافرەت خۆی ئەوەی دایە دواوە

ئاواز: دڵپاك، باسی ئافرەت قووڵ و فرە لایەنەو قسەی لێ ئەبێتەوە، لەو کاتەدا کەباسی چەند مێردێتیی کرا تۆ بەمنت گوت: "ئەم پێشنیارەی کە دەستت کەوتووە"، مەبەستت لەوەدا چیبوو؟ لەکوێ دەستم کەوتووە؟ قسەیەك بوو کردم و زادەی بیری خۆیشم بوو، ئیتر کەی پێویست بە قووڵکرنەوە ئەکات؟

دڵپاك: چاوەکەم، ئەوە تەنها قسەیەك نییەو بڕێتەوە، هەروەها زادەی بیری خۆیشت نییە، بەڵکو (فکرە) بیرێکی دەستاو دەست پێکراوەو لەناو گەلێ میللەتا، بەتایبەتیی لای سۆشیالیستەکان، ئەو بیرە هەیەو هەوڵی زیندوو کردنەوەیشی ئەدەن، هەوڵی تازەکردنەوەو جێبەجێکردنیشی بۆ ئەدەن، لەبەر ئەوە پێویستی بە تازەکردنەوە هەیە.

---

[1] ڕۆژنامەی (لاغوس ویکلی رکورد) لەڕۆژنامەی (لندەن تروت) وەریگرتووە.

[2] حقائق الاسلام وأباطيل خصومة، والمرأة في القران: عباس محمود العقاد.

ئاواز: تۆ دەربارەی سۆشیالیست قین لەدڵی، چەند مێردایەتیی و داوێن پیسیی و ئەو جۆرە شتانە، لە سۆشیالیستەوە دوورن و کارو پیشەی سەرمایەداریین.

دڵپاك: بۆچ لەیەكتر زوویری بین؟ دەی با لەیەكتر بگەین، خوشكە ئاواز، ئەی چۆن خۆت نابەڵەد ئەكەی لەوەی كە سۆشیالیستییەت ددان بەخێزان و بە خێزانداریيدا نانێت؟ ئافرەت بۆ پیاوو پیاو بۆ ئافرەت، بەپێڵاو بۆ پیێ و پێ بۆ پێڵاو لە بازاڕدا دائەنێت؟ لەسەر ئەو بنەڕەتەی كە هەموو شتێ بۆ هەموو كەسێكەو هیچ كەس هیچی بۆ تایبەتیی نییە.

ئەی نەتخوێندۆتەوە كە كارڵ ماركس ئەڵێت: "هاوسەرێتیی (الزواج) بەبێ چەندو چۆن شێوەیەكە لە شێوەكانی موڵكایەتیی تایبەتیی گوشێنراوو كۆسپێكە لەسەرە ڕێگەی مەشاعییەتی ئافرەتانداو ناهێڵێ ئافرەت ببێتە موڵكی هاوبەشی كۆمەڵ"! ئەمەت نەخوێندۆتەوە؟

ئاواز: ئەوا بیستم، ئەوە قسەی خۆتە دڵپاك، نەك هی كەسێكی تر.

دڵپاك: نا گیانەكەم، قسەی من نییە، فەرموو سەیری ئەم پەڕاوە (المرأة في التراث الاشتراكي) لە بە عەرەبیكردنی (جورج تەرابیشی) بكە، ئەها لە لاپەڕەی (٩) دا نووسراوەو لەیەكێك لە دەستنووسە ئابووریی و فەلسەفییەكانی ماركس كەژ مارەی (١٨٤٤)ی دراوەتێ، وەرگیراوە!

سكاڵا: ئا، خۆ بە چاوی خۆت دیت، دڵت ئاوی خواردەوە ئاواز؟

ئاواز: بەڵام باسی هاوبەشیی پیاوانم لە ئافرەتدا نەكرد، پرسیارێك بوو دەربارەی چەند ژنێتیی كردم، تۆیش وەڵامت دامەوە.

دڵپاك: ئێ خوشكە گیان وەك خۆت ئەڵێیت، منیش وەڵامم دایتەوە، جا بۆ زیادە ڕوونكردنەوەش، با پێت بڵێم كە چەند مێردێتیی كە ئەڵێن لە ڕۆژگارە دێرینەكاندا، كاتێ ئادەمیزاد لە دەوری وەحشییەتدا بوو، ئەویش بووە، هەر ئافرەتان خۆیان لەو دیاردەیە سڵەمینەتەوەو لێی دوور كەوتوونەتەوە، چونكە بە خراپ و پیس و بەدئەنجامیان زانیوەو بارێكی قورس بووە بەسەر ئافرەتەوە، فەرموو گوێ بگرە:

"بێگومان باخوفن ناو جەرگەی ڕاستیی پێكاوە جارێكی تر، كە بەدڵنیاییەوە باسی بەجێهێشتنی قۆناغی چەند مێردێتیی ئەكات، كە لەچەند مێردێتییەوە بوو بە یەك مێردێتیی، كە ئەمەش لە بنەڕەتدا ئافرەتان دەستیان پێكرد، جا چەندە مەرجەكانی ژیانی ئابووریی پێش ئەكەوتن، ئەوەندەش بنەڕەتەكانی شیوعییەتی كۆن لە بن ئەهاتن، چەندیش ژمارەی دانیشتووان بەرەو زیادبوون برۆیشتایە، ئەوەندەش پەیوەندییە جنسییە ساكارەكان شێوە سەرەتاییە پووچەڵەكانی خۆیان كە ڕیسواكەرو زەحمەت بوون بۆ ئافرەت، گوم ئەكرد، ئافرەتیش بەتاسەوە، بە بەردەوامیی بەرەو داوین پاكیی و ڕووەو شووكردنی كاتیی یان هەمیشەیی بەیەك پیاو هەنگاوی ئەنا، چونكە ئەوە ڕێگەیەك بوو بۆ قوتاربوونی لە چەند مێردێتیی (المزاوجة الفاجرة)، ئەوەش قەت بەچاكەی پیاوان، یاخۆ لەسەردەستی پیاواندا نەئەكرا بێتە دی بۆ ئافرەت.."[1].

ئاواز: دەی خۆ ئەوەتا سۆشیالیزم دژایەتی خۆی بەرامبەر چەند مێردێتیی ئەنوێنێ.

دڵپاك: نا، من بۆ ئەو مەبەستە ئەوەم بۆ باس نەكردی، بەڵام لەو قسانەدا چەند شتێك بەڕوونی خۆیان نیشان ئەدەن:

١. ئافرەت بەسرووشت حەز لە چەند مێردێتیی ناكات، چونكە كارێكی زەحمەت و قێزەونەو كەڵك و سوودی بۆ ئافرەت نییە.

٢. سۆشیالیزم، لە كاتێكدا هەست بەوە دەكات، چۆن ئەبێ داوای هاوبەشی (مشاعیة)ی ئافرەت و كردنی بە موڵكی گشتیی بكات؟

٣. كە ئافرەتان پاش بڕینی قۆناغی وەحشییەت دەستیان دایە یەك مێردیی، بۆچی ئێمە بیانگێڕینەوە بۆ ئەو قۆناغە؟ ئایا ئەوە ستەمكردن نییە لە ئافرەت؟

---

[1] أصل الاسرة والملكية الخاصة والدولة ـ الفصل الثاني/ فردیك أنجلز.

سکالا: من بڵێم چی؟ داوای وەڵامەکان لەئاواز بکە، نەك من.

## ئەبێ تۆیش یارمەتیم بدەیت

دڵپاك: ئاه! خوشکەکانم، گیروگرفتی ئێمە، ناتەواویی و کەموکوڕیی و نەگونجانی ئیسلام نییە، بەڵکو نەزانیی و دوورە پەرێزیی خۆمانە لە ئیسلامەوە. ئینجا هەروەك نەزان و دوورە پەرێزین، ناحەزان بەشێوەیەکی هەڵەت و پەڵەت ئەیدەن بەگوێماندا و ئێمەش باوەڕ ئەکەین، ئا، ناحەزان بەشێوەیەکی گۆڕاوی پڕ لە ساختەکارییەوە ئەیدەن بەگوێماندا، ئێمەش نەزانین و ناتوانین بدەین بە دەمیانداو هەستیش بەوە ناکەین کە لەو بە گوێدادانەدا مەبەستی تایبەتیی خۆیانیان هەیە، دواییش ڕەخنەمان لێئەگرن و ئەڵێن: "ئاخر ئەوەیە ئیسلامەکەتان، ئەها لەگەڵ چەرخا ناڕوات، ئەها پڕ لەکەموکورتییە، ئەها لەگەڵ ژیرییدا یەك ناگرن.. هتد".

کەچی ئێمەش لەبەر نەزانیی و دوورە پەرێزییمان لە ئیسلامەوە، دەممان دائەخرێت و ورتەمان پێناکرێت، وەهایش سەیری خۆمان ئەکەین گوایە لێزانین و ڕۆشنبیرین، بەمجۆرە لە نەزانینێکی ئاوێتەدا ئەژین!

ئاواز: وانییە دڵپاك، قابیلە هیچ لەبارەی ئیسلامەوە نەزانین؟

دڵپاك: زانیاریی بێتان و پۆ کەم و کورت! زۆرجار بۆ ئادەمیزاد لە نەزانین زیان بەخشترە، چونکە ئەو کەسەی کە نەزانە لەوانەیە بەخۆی بزانێت کە نەزانە، جا لەوانەیە هەوڵی زانین و فێربوون بدات، هەروەها فتوایش نادات، بیشیدا کاریگەری و دەنگدانەوەی نییە، بەڵام ئەو کەسەی کە هەندێ گەندە زانیاریی پرش و بڵاوو بێتان و پۆلەم لاو لەولاوە، لە دەم خەڵك و لەناو سکی هەندێ پەڕاو یان لەسەر جادەو لەناو کۆڵاناندا دەست کەوتووەو خۆیشی بەزانا ئەزانێ، ئەوە وای لێ ئەکات کە لەخۆی ڕازی بێت و ئیتر پاڵ بداتەوەو ئەو زانیارییە کەمە ناتەواوەی بکات بە گەنجینەی خۆی و هەمیشەیش، لەهەموو گیروگرفتێکدا بیگرێت بەدەستەوەو پەنای بۆ ببات، تەنانەت فتوایشی پێبدات، ئەمەش سامناکترین دەردە کە ژمارەیەکی زۆر لە بەچکە ئیسلامی پێوە گیرۆدەیە.

دەردەکەمان قووڵ و گیرگرفتەکانمان ئاڵۆزن، ئەمڕۆ زۆربەی ڕۆڵەکانی ئیسلام، بەتایبەتی کیژە ڕۆشنبیرەکان!! هەموو زانینێکیان لە بارەی ئیسلامەوە لەو جۆرەیە کە باسمان کرد، بریتییە لە هەندێ زانیاریی بێتان و پۆی کاڵ و کرچی پرتووکاو، لە هەندێ چیرۆك و ئەندێشەو ئەفسانەی دوور لە گیانی پاکی ئیسلام کە پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نییە، لەوەیشەوە لە بیرو مێشکیاندا کۆمەڵێك وێنەی شێواو، بیری بێناوەڕۆك کۆبووەتەوەو ناویان لێناوە ئیسلام!

ئیتر هەست ناکەن کە ئیسلام بەرنامەیەکە خوا دای ناوە بۆ ئادەمیزاد، نازانن کە ئەو بیرو وێنە شێواوانە، ئەو چیرۆك و شتە پڕوپووچانە لەلایەن دوژمن و خزمەتکارەکانییەوە تێکەڵی بیری خەڵك کراون، لەوەش زیاتر نازانن کە گومڕا کراون و فریو دراون، لە شاڕێگەی ژیان ترازاندوویانن و زۆر زۆریش دوو خراونەتەوە!

دەی توخوا هێشتا کاتی ئەوە نەهاتوە کە ئێمەی ڕۆشنبیر ئیتر لەدەمی خەڵك و ناحەزانەوە سەیری ئیسلام نەکەین؟ لەڕەفتارو کرداری خەڵکەوە، تەنانەت لە هەندێ لەوانەوە کە کاڵا و بەرگی ئیسلامییان پۆشیوە تەماشای ئیسلام نەکەین؟ بەتایبەتیتریش ئەوانەی دەم لە ئیسلام ئەکوتن و خۆیانیان کردووە بە ئاغاو کاربەدەستی موسڵمانان، کەچی لەڕاستیشدا خۆرەی گیانی ئیسلام و خزمەتگوزاری ناحەزانی ئاینی خوان.

سکالا: باشە، ئەی ئێمە ئیسلام چۆن بیناسین خوشکە دڵپاك؟

دڵپاك: ناسینی ئیسلام بە کوڵی شێرەوە نییە، بەتایبەتی بۆ ئادەمیزادی خوێندەوار، ئەتوانێت یەکسەر خۆی بگەیەنێتە سەرچاوەکانی، کە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ، بەفەرموودەو کردەوەکانییەوە، ئەم دووانە سەرچاوەی سەرەکیی ئیسلامن، مرۆڤ ئەبێ لەوانەوە ئیسلام بناسێ و دەست بکات بە شارەزابوونی.

بێگومان هەرکەس لەوانەوە ئیسلام بناسێ، ئیتر دوایی پەشیمانیی و دڵەڕاوکێیی نابێت و هەر قسەو ڕەخنەیەکی ساختەچییان بەرگوێ بکەوێ بە گیزەی مێشوولەی ئەزانێت، چونکە بۆی دەرکەوتووەو تێگەیشتووە، چونکە ڕاستیی بۆ ساغ بۆتەوە.

بەڵێ، هەرکەسێ ئەیەوێ مسوڵمان بێت، ئەبێ ئیسلام بناسێت، لەوەشدا ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای یەکەمین قوتابخانەی کە قورئانە.. قورئان، ئەبێ ببێت بە قوتابی قورئان، بیخوێنێ، لێی تێ بگات، بیخوێنێتەوە، ئەوسایش دەست بداتە خوێندن و تێگەیشتنی فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ، چونکە ڕاڤەکردن و شیکردنەوەو ڕەنگدانەوەی قورئانن، وێنەی پاکی ڕاستەقینەی یاساکانی قورئانن، مرۆڤ دەبێ لەودوو سەرچاوەیەوە ئیسلام بناسێت، بیخوێنێت، فێر ببێت و ڕێگەی ڕاست بدۆزێتەوە.

سکاڵا: من باوەڕم بەوە هەیە، بەڵام ئەوە تەنها بۆ خوێندەواران دەست ئەدات، خۆ هەموو کەسێك خوێندەوار نییە.

دڵپاك: نەخوێندەوارەکان، لەهەزاردا یەکێکیان، چ پیاو، چ ئافرەت، ڕێگەی نەگریسیی و سەهندێتیی و ئینکارییکردنی بوونی خوا ناگرنە بەرو دەمدرێژو پڕو پاگەندەچیی نین لەم ڕووەوە، چونکە لەسەر پاکیی سرووشت و فیترەی خۆیان ماونەتەوە، باوەڕیان بە بوون و یەکتایی (الوحدانیە)ی خوا هەیە، باوەڕیان بە بنەڕەتەکان و یاساکانی ئیسلام هەیە، لەوەش زیاتر، هەر کاتێ، هەر هەڵەیەك ڕوو بدات لێیان ددانی پێدا ئەنێن کە هەڵەیە، ئیتر ئەو هەڵەیە بە نەزانیی بێت یان ئەنقەست، ڕۆژێك لەڕۆژان پەشیمان ئەبنەوەو داوای لێبوردن لەخوا ئەکەن، خۆ هەر هیچ نەبێت دەم درێژیی ناکەن و ڕەخنە لە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ناگرن، خۆیان یاخۆ یاسا چەپەڵەکانی فەرەنسەو شوێنەکانی تر لەخواو پێغەمبەر ﷺ و یاساکانی ئیسلام زاناترو بەچاکتر نازانن، خۆزگە ڕۆشنبیرەکان! وەك ئەوان ئەبوون.

ئاواز: کوا ڕەخنەمان لە خواو پێغەمبەر ﷺ گرتبێ؟ کەی ئەوەمان گوتووە؟

دڵپاك: خانمی ڕشنبیر، ڕەخنەگرتن لە ئیسلام، ڕەخنەگرتنە لە خواو پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئایینی ئەوانە، بەرنامەی ئەوانە، ئەی نابێ ئەمە بزانی؟ نابێ بیری لێبکەیتەوە؟

سکاڵا: پەنا بەخوا.. پەنا بەخوا! بەخوا من ئەوەم نەزانیوە، زۆر لەو تێگەیشتنانەوە دوور بووم، ئەی خاکم بەسەر! جا چی بکەم؟

دڵپاك: ئەگەر ڕاست ئەکەی بگەڕێوە، خوا موحاسەبەی نەزان لەسەر کارو کردەوەکانی پێش نەزانینەکەی ناکات، (عفا الله عما سلف)، . خوا میهرەبان و لێبوردەیە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (کل بن آدم خطاء، وخير الخطائين التوابون)، بەڵام گەڕانەوەش ئەبێ بە بیرکردنەوەو تێن و بزێویەوە بێت، نەك کوێرانەو سرو سارد.

سکاڵا: خوا یار بێت دەست پێئەکەم،.. دەست پێئەکەم، بەڵام ئەبێ تۆیش دەستم بگریت، یارمەتیم بدەیت، خوشکە دڵپاك.

دڵپاك: تۆ دەست پێبکە خوا بەهەموو شێوەیەك یارمەتیت ئەدات، وەك ئەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا).

# بەشی دەیەم

## قورئان شاڵی هەمەگیر نییە

ئاواز: خوشکە دڵپاك: ئەڵێن قورئان هەموو شتێکی تیایە، ئایا ئەو قسەیە ڕاستە؟ ئەوە چۆن هەموو شتێکی تێدا جێ بووەتەوە؟

دڵپاك: نەخێر خوشکە ئاواز، ئەوە ڕاست نییەو قسەی ناحەزانی ئیسلامەو هەندێ مسوڵمانی سادەش بە سادەیی وەریان گرتووەو بەڕاستی ئەزانن، خۆ قورئان شاڵی هەمەگیر نییە، جا هەر کەسێکت دیو ئەو قسەیەی کرد یان بەڕاستی زانی، یەکسەر بزانە ئەو کەسە لە ئەنجامی نەناسینو نەشارەزاییەوە لە قورئان شتی وەها ئەڵێت، شاگردی ڕاستەقینەی قورئان قسەی وا ناکات.

قورئان بۆ ئەوە نەنێرراوە کەبێتە پەڕاوێکی کیمیا یان فیزیا یاخۆ پزیشکەوانیی.. هتد، هەرچەندە لەو بابەتانەشی بەگشتیی تێدا هەیە، بەڵکو پەڕاوێکی ڕێنموونیی بێدارو ورياکردنەوەیە، بۆ ئەوە نێرراوە کە ویژدانو ژیریيو سۆزو گیانو دڵی مرۆڤ بدوێنێو پاك بکاتەوە، ڕێڕەوی ژیان بەپاکیی بهێڵێتەوەو بپارێزێ، بەهرەو هێزو تواناکانی بەجۆرێکی وەها ڕێکو پێك بکات کە لە کاروباری دنیادا بەشێوەیەکی بنیات نەرانەی گەرمو گوڕ بخاتە کار.

سکالاّ: من لەم مەبەستە تێناگەم، ئەوە چۆن وا ئەڵێیت؟

دڵپاك: خۆ ئەگەر ئیسلام خۆی ببەستایەتەوە لەناو بازنەی بەشێك لە بەشەکانی کاری ژیریی مرۆڤدا، وەك کیمیا، فیزیا، یان شتێکی تر، بێگومان ئەبوایە گیروگرفتە سەرەکییەکەی فەرامۆش بکردایە، مەبەستم ئەو گیروگرفتە گەورەیەیە کە قورئان لە پێناویدا نێرراوە، کە بەکورتیی ئاماژەمان بۆ کرد، لەو حاڵەشدا دەرگای بیری مرۆڤایەتییو بزووتنەوەی شارستانییەت لەڕووی مرۆڤایەتیی دائەخرا، ئەو کاتەش چەند چوارچێوەیەکی مرۆڤانەی تەمبەڵیی نوێ دروست ئەبوو.

جا ئەگەر قورئان ئەوەی بکردایە، ئەو کاتە ئەبووە هۆی لەناوبردنی بزووتنەوەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیی، ئەوسا جەوهەرو کاکڵەی پەیامی خۆی لە ژیاندا بزر ئەکرد، خۆ دیارە دواندنی مرۆڤی سەدەی حەوتەمی زایین بەزانستێك کە بە چەند سەدەیەك لەبیرو مێشکی بەرزتر بێت، وەك ئەوە وایە کە فەلسەفەی ئیبنو ڕوشد، یان ئەفلاتون یان چۆنییەتیی هەڵدانو ناردنی کەشتی ئاسمانی، بۆ قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی، باس بکەیتو بە هیوایش بێت کە فێری بن.

قورئان پەڕاوێکە باسی بوونەوەرو پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ بوونەوەردا ئەکات، باسی ئەو یاسایانەی کە گونجاندن لەنێوان بوونەوەرو مرۆڤدا ئەهێننە دی ئەکات، باسی پەیوەندیی ئەو دووانە لەگەڵ پەروەردگارەکەیاندا ئەکات، لەباسی یاسا سرووشتییەکاندا، تەنها ئەو سەلمێنراوە گەورانە باس ئەکات کە پەیوەندییان پتەوو بەتین تر ئەکات لەگەڵ ئەو لایەنانەدا ناومان بردن، هەر لەبەر ئەمەیشە کە زانا سرووشت ناسەکان هەرچەندە زانیارییو تاقیکارییان چەندێ زۆرو فراوان بێت لە کارەکەیاندا، هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن بڵێن، سەلمێنراوێك لە سەلمێنراوەکانی قورئان لەگەڵ ئەنجامێ لە ئەنجامی باسەکانیاندا. ئەو باسەی کە دەست ئەدات بکرێت بەیاسایەك نەك تیورو بیردۆزێك. لەگەڵ یەك دژنو لەیەکتر ئەدەن.

خوشکە گیان، قورئان بەگەرمییو بەجۆش داوا ئەکات کە ئادەمیزادان تەماشای بەڵگە (ایات)کانی خوا بکەنو لێیان ورد ببنەوە، لەبوونەوەردا، لەئاسۆکاندا، لە دەروونددا، لە گیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەو تەماشاکرنو لێوردبوونەوە زۆرانە

ببنە وەرزشێك بۆ ویژدانی ئادەمیزاد، بۆ ئاراستەكردنی بەنیازو هیوای دیتنی گەورەیی خوا، بۆ بیركردنەوە لە دەستەڵاتی خوا، لەتواناو هێزی، تا بەوەش ئاوڕدانەوە بەلای ئەو بەڵگانەوە تەنهایی خوای بۆ دەربخات، هەروەها بیركردنەوەو وردبوونەوە لەوانە، جوانییو ڕێكو پێكیو گەورەیی نواندنێك ئەخەنە دڵو دەروونی ئادەمیزادەوە، چ زاناكانو چ ئادەمیزادە ئاساییەكان.

قورئان كاتێك ئەفەرموێ: (وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لَّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الجاثية: ١٣)، مەبەستی ئەوەیە ژیریی مرۆڤ ئاگادارو بێدار بكاتەوە كە ڕوو بكاتە كایە (مجال)ی ئەو كارەی كە پێویستە لەسەری، بەڵام ئەگەر بێتو قورئان خۆی بەدرێژیی باسی بكات بۆ مرۆڤو هەموو نهێنییەكانی بوونەوەری بەجارێكا بۆ دەربخات، بەبێئەوەی كایەو دەروازەو بوارێك بهێڵێتەوە بۆ هەوڵدانی ژیری ئادەمیزاد، زۆر ئاشكرایە ئەوە جگە لە كوشتنی ژیریی هیچی تر نییە، بەڵێ، ئەوە كوشتنی ژیرییو واتای ژیانو فەلسەفەی ژیانە.

مامۆستا (محمد الصادق عرجبون) لەڕووی بەڵگە بوونەوەرییەكانەوە (الآيات الكونية) ئەڵێت: "لایەنی بوونەوەریی لە قورئاندا لایەنێكی گرنگە، چونكە كۆڵەكەی بەڵگە خواییەكانە بۆ ناسینی خواو دەستەڵاتو تەنیایی خوا، قورئان ئاماژەی بۆ گەلێ لە پەنهانییەكانی بوونەوەر كردووە كە زانیاریی پەی بەهەندێكیان بردووە، بەڵام ئەو پەنهانییانە سەلمێنراون نەك تیورو بیردۆز بنو ڕۆژێ لەڕۆژان زانیاریی بەدرۆیان بخاتە، هەروەها ئەوانە بیری كلمولی فەلسەفیی نین كە قابیلی گۆڕینو دەستكاریی كردن بنو هەوڵی چەسپاندنیان بۆ بدرێت، چونكە وەك گوتمان خۆیان (حقائق)و سەلمێنراون".

ئاواز: ئەم باسەتم زۆر بەلاوە جوان بوو دڵپاك، بەڕاستیی زۆر سەرم سوڕئەما كە ئەیانگوت قورئان هەموو شتێكی تیایە، لە دڵی خۆما ئەمگوت، باشە ئەو هەموو شتانە چۆن جێیان بۆتەوە تیایا؟ خۆ ئەبوایە لاپەڕەكانی نەك ملیۆنەها بەڵكو ملیارەها لاپەڕە بوونایە.

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، ئەی نەئەكرا تەماشای قورئان بكەیتو بەوردییو سەرنجەوە بیخوێنیتەوەو ئەو سەرسوڕمانەت بەگۆڕ بكەیت؟

خوشكەكانم، ئێمەی خوێندەواری بەچكە مسوڵمان پێویستە لەسەرمان كە قورئانەكەمان پشتگوێ نەخەین، بەوردیی شارەزای ببین، چونكە بەرنامەو كەتەلۆكی ژیانە، شارەزابوون لەقورئان، ژیرو ورياو ئاگادارمان ئەكات، چاوی سەرو دڵمان ئەكاتەوە، بوونەوەرمان پێئەناسێنێ.

ئایینو ئەركو پێویستییەكانی، بە چاولێگەرییو دەماودەم لە خەڵكەوە، دیارە بە كاڵو كرچیو ناتەوایی ئەگاتە دەستمان، ئەوەش حەیفەو بۆ ئێمەی خوێندەوار گەلێ شوورەییە، ئەوە ئێمە هەستمان كزو لاوازە كە گوێ بەو شوورەییو نەنگیە نادەین.

سكاڵا: خۆزگە هەموو موسڵمانێك وەها ئیسلامی بەخەڵك ڕائەگەیاند! خۆزگە مسوڵمان بەمشێوەیەی تۆ نەرمو نیان بوایەو بەمشێوە زانیارییەش لە ئیسلام ئەدوا، نەك وەك هەندێ كە بەتووڕەییو زۆركاریی ئەیانەوێ خەڵك بگێڕنەوە بۆ ئیسلام.

دڵپاك: چاوەكەم، كێ ئەڵێ پاش ماوەیەكی تر ئێوە لەوەدا پێشم نادەنەوە؟ خۆ ئێوەش سوپاس بۆ خوا مسوڵمانن و ڕۆڵەی ئیسلامن.

## خۆمم ناسیوە

سكاڵا: خوشكە دڵپاك، بەیانی بەشێوەی سپاردە دەستێك جلی ژنی فەڕاشەكەمان ئەهێنمو خوا یار بێت خۆم ئەكەم بە مسوڵمان، مەبەستم ئەوەیە ئیتر ئەمەوێ مسوڵمان بم، كە ڕۆژی هەینی هاتو كە لەشار ئەبین، جلوبەرگی شیاو ئەدەم بەدووریینو ئیتر كیژێكی مسوڵمان ئەبمو بەمسوڵمانانە ئەژیم.

دڵپاك: بۆ جلوبەرگ پەك ناكەوێت، ئەگەر مەسەلە تەنها جلوبەرگ بێت، فەرموو لە جلوبەرگەكەی من كام دەستەیان هەڵئەبژێریت بەخۆڕایی نەك هەر جارێ، سەد جار پیرۆز بێت، بەڵام خوشكەكەم، وای بەچاك ئەزانم جارێ پەلە نەكەیت، لەوانەیە پەلەكردن باش نەبێت.

خوشکە سکالاٌ، ئەگەر لەڕووی منذا دائەمێنیو بۆ دڵنەوایی من ئەو کارە ئەکەیت، تکات لیٚ ئەکەم مەیکە، بەخوا من لێت زویر نابم، هەروەك تا ئێستا وەك خوشکی گەورەی خۆم تەماشام کردوویتو ڕێزم گرتوویت، هەر بەو جۆرە، لەوانەیە لەوەش زیاتر ڕێزت بگرم، حەز ئەکەم پەلە نەکەیت.

سکالاٌ: من لەبەر دڵنەوایی و ڕازیکردنی تۆ ئەوە ناکەم، بەڵکو لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەمەویٚ خۆم بگۆڕم، چونکە بەهۆی تۆوە، ڕۆشنایی باوەڕ بەخوا، جوانییو دادگەریی ئیسلام، تاریکایی دڵو دەروونمیان ڕۆشن کردۆتەوە، بەڕەفتارو گوفتار بۆت سەلماندم کە ئیسلام بەرزترین ڕێگەو بەرنامەی ژیانە، چۆتە دڵمەوەو هاتنەدەرەوەی بۆ نییە، بەلاٌم لێرەدا، سەرم لە تۆ سوڕ ئەمێنیٚ کە ڕێگەم لیٚ ئەگریت! بۆچی وا خوشکە دڵپاك؟!

دڵپاك: سەرت سوڕنەمێنیٚ، من ڕێگەیشت لێناگرم، بە هەڵە بۆی دامەچۆ، من ئەمەویٚ تێبگەی، پێبگەی، ئیسلامەتیی هەر وەك چۆتە دڵتەوە، هەر بەو جۆرەش بچێتە مێشکتەوە، دڵ خۆی بەتەنها کاری ناتەواو ئەبێت، لەوانەیشە بەرگە نەگریت، دڵ ئەبیٚ مێشك پشتگیریی بکات.

خوشکە بەڕێزەکەم، موسڵمان پێشئەوەی لەشی بە بەرگ دابپۆشیٚ، پێویستە دڵو مێشكو سۆزی بە بەرگی باوەڕ برازێنێتەوە، ڕۆژگارەکەشمان وەك ئەبیٚ بیزانی ڕۆژگاری نەفامێتییە، مسوڵمان تووشی تانەو تەشەرو ڕەخنەو هێرشو شالاٌوی هەمەجۆری ناحەزانو نەفامان ئەبێت، بەئاسانی یەخەی بەر نادەن، بەتایبەتی ئافرەتی خوێندەوار، کە بیەوێت موسڵمانانە بژی، ئەکەوێتە جەنگەوە لەگەڵ کۆمەڵگەدا، بە باوو نەریتو ژیانییەوە بەتێکڕا لەگەڵی ئەجەنگێن، ئەمەش شتێکی ئاسان نییە، سادەو بچووك نییە بۆ کەسێك کە لەسەرەتای گەڕانەوەدا بێت، مسوڵمان ئەمڕۆ ئەبیٚ خۆگرو ئارامو لێبڕانی هەبێت، پێش ئەوانەش ئەبیٚ باوەڕی بەهێزو زانیارییو شارەزایی هەبێت، لەوانەش زیاتر ئەبیٚ خۆیو ئەرکی سەرشانی خۆی بناسێتو بزانێت.

سکالاٌ خان، دانەدواوەی ژیانو گوزەرانو باوو نەریتو مۆدەکارییو یاسای نەفامیی بەشتێکی سووکی هەڕەمەکیی مەزانە، ئافرەت کە ئەوانە بەجێئەهێڵیٚ، ئایا ئەزانی کە شۆڕشێکی گەورەی لەبەردەمدا ئەبیٚ؟ ئایا ئەزانی کە بەوە ئەبێتە شۆڕشگێڕو شۆڕش ئەگێڕێت؟ خۆ شۆڕش زەردو سوور نییە، ئەی شۆڕش گۆڕینی بارودۆخێکی خراپ نییە بەرەو چاکیی؟ دەی تۆیش ئەبیٚ بەوردیی بیری لێبکەیتەوە.

ئاواز: دڵپاك، تۆ بۆچی دڵی سارد ئەکەیتەوە؟ دەی وازی لێبێنە بەشکو ببێت بە شۆڕشگێڕێكو شۆڕشێك بەرپا بکات، ئێمەیش لە سایەیا بحەسێینەوە.

سکالاٌ: خانم، چاك لە مەبەستت تێئەگەم، ئەو قسانە هەڵگرە بۆ کاتێکی تر، ئەوەش دڵسارد کردنەوە نییە، بەڵکو زاخاودانە.. زاخاودان.

دڵپاك: خوشکە سکالاٌ، پاش ئەوەی کە پێم گوتی، ئەبیٚ بزانیت کە تۆ لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، زۆر گەورەو گرنگیت، تۆ جێنشینو خەلیفەی خوایت لەم سەر زەوییەدا، خوا بۆ کارچاکیی خەلقی کردوویت، تۆ کارگەی مرۆڤایەتیت، دارێکیو بەرهەمەکەت مرۆڤە، سبەینیٚ ئەبیتە هاوسەری پیاوێكو دوایش ئەبیتە دایك، ئەو دایکەی کە بەهەشتی لەژێر پێدایە، تۆ ئەبیتە یەکەمین قوتابخانەی جگەرگۆشەکانت، ئەبیتە پەروەردیاریانو ئەبیٚ پەروەردە کردن بزانیت.

سکالاٌ: جا چی لەوە چاکترو گەورەتر هەیە؟ دەی یارمەتییم بدە.

دڵپاك: چاوەکەم، دەی ئەبیٚ خۆت بناسیت، خۆت بگری، ڕەخنەو دەمبازیی نەفامان کارت تێنەکەن، ئەبیٚ خۆت یەکلا بکەیتەوە، پەندو ئامۆژگارییو دەرس لەخاتوو (خەدیجە)وە وەربگریت، ئەو خەدیجەیەی کە یەکەمین کەسێك بوو باوەڕی بە پێغەمبەرێتیی موحەممەد ﷺ هێنا، پەند لە (سوومەییە) وەربگریت کە یەکەمین شەهیدە لە ئیسلامدا، دەرس لە (زەنیرە) وەرگبریت، کە لەپێناوی باوەڕەکەیدا، لەژێر زەبرو ئەشکەنجەی نەفامییدا هەردوو چاوی کوێر بوون، کەچی پەشیمانو پاشگەز نەبۆوەو موسڵمانێتیی خۆی هەر بردەسەر، تا ئەوکاتەی گەڕایەوە بۆ لای خوای خۆی.

خوشکیٚ، یەکەم کەس بێباكو پەروا

کەخوێنی ڕێژرا، باوەڕی هێنا

سومەییەی شەهید، خەدیجەی زانا

هەر لە ئێوە بوون، بەڵام ژیر، دانا

خوشکێ زەنیرە هەردوو چاوی خۆی

بەئەزیەتدان و لێدان لەدەس ڕۆی

دەستم دامێنت تۆش خۆت بناسە

ها .. خوشکێ، ئەمڕۆ زەنیرە ئەتۆی

سکالاّ: دڵپاك گیان، خۆمم ناسیوە، بەختیاریی خۆم و ئافرەتانی تر تەنها لە ئیسلامدا بەدی ئەکەم، دەی دەستم بگرە بەرەو بەختیاریی ئافرەت، لە خۆناسیندا هەرگیز کۆڵ نادەم، فێرمکە، دەستم بگرە، خۆمم ناسیووە.

## ساختەکاریان بناسە

سکالاّ: ئەوانەی کە ناحەزی ئیسلامن، خۆ بناغەکەیان بۆش و پووچە، نازانم چۆن هەندێ جارو لەهەندێ شوێندا جۆرە سەرکەوتنێك لەناو مسوڵماناندا بەدەست ئەهێنن؟ ئایا ئەوە چی ئەگەیەنێ؟

دڵپاك: زۆر سوپاسی خوا ئەکەم کە یارمەتی دایت و بیرو هۆشتی گەیاندۆتە ئەم ئاستە، کە پرسیاری ژیرانەی وردی وەهای لێبوەشێتەوە، پرسیارەکەت هەرچەندە زۆر قووڵ و فراوانەو پێویستیی بە وەڵامێکی دوورو درێژە، بەڵام با بە کورتەیەك وەك بەرکوڵ وەڵامت بدەمەوە، بەو هێوایەی ڕۆژێ لەڕۆژان خۆت بگەیتە ئاستی وەڵامەکەیشی.

ئەو جۆرە سەرکەوتنە، لەو هەندە کات و شوێنەدا کە لەناو مسوڵماناندا ناحەزان بەدەستی ئەهێنن، ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکیی:

یەکەمیان: نەزانیی و بێئاگایی مسوڵمانانی ئەو کات و شوێنانەو ساردو سڕی لە باوەڕەکەیاندا، خۆ ئاشکرایە کە نەزانیی دایکی هەموو دەردێکە، جا هەر کاتێ ئەو نەزانییە ساردو سڕییشی لەگەڵدا بوو، دیارە چاکترین و گونجاوترین زەمیینە بۆ بزووتنەوەو دەست وەشاندنی دوژمن ساز دەبێت، نەخوازەڵڵا مسوڵمانان یەکگرتوو نەبن، پارچە پارچەو پەرتەوازە بن.

دووەم: ساختەکاریی ناحەزان، حەز ئەکەم ئەوە زۆر باش بزانیت کە ناحەزان نایەنە مەیدانەوەو ڕاستەو ڕوو بڵێن، ئێمە مسوڵمان نین، دوژمنی ئیسلامین، ناڵێن باوەڕمان بە ئیسلام نییەو ئەمانەوێ لەناوی بەرین، یەکسەر لە ئیسلام نادەن، چونکە زۆر چاك ئەزانن، ئیسلام گەرچی بەشێوەیەکی گەرم و گوڕیش نەبێ، ڕەگ و ڕیشەی لەدڵی مسوڵماناندا هەر هەیەو ماوەتەوە، ئەشزانن دەرهێنانی ئەو ڕەگ و ڕیشەیە زەحمەتەو بەزۆریی سەرناگرێت، لەبەرئەوە دەست دەدەنە ساختەکاری، بەڕاوە فێڵی ڕێوی دێنە ناوەوە، ڕێگەیەك ئەگرن کە مسوڵمان . جگە لەوانەیان کە تێگەیشتوون . پەی بە فێڵەکانیان نەبەن و ئاوەزیان پێنەشکێت، ئەو ڕێگەیەش ونکردن و شاردنەوەی ڕاستییە، کردنییەتی بەژێرەوە هەتا بەرچاوو بەرگوێی مسوڵمانان نەکەوێت، لەهەمانکاتدا بەشێوەیەکی سەیری هونەرمەندانەو جادووگەرانە، هەندێ لایەنی بەرنامەی ئیسلام بەکەموکورتیی و خوارو خێچیی و ڕەخنەسازیی ئەخەنە بەرچاو مسوڵمانان، دیارە ئەوەش ڕەنگدانەوەیەکی کاریگەری ئەبێت.

بەڵێ خوشکی بەڕێزم، دوورخستنەوەی ڕاستیی بەشێوازیکی ئاشکراو ڕاستەوخۆ زۆر گرانە، جا بۆ ئاسانکردنی ئەوە، گیروگرفتی پووچەڵ و پڕ لە ساختە، ئەهێننە کایەوە، وەك جێگر (بدیل)ێك بۆ ڕاستییەکە، ئیتر بەڕێگەو شێوەی شەیتانانە ئەو جێگرە ئەڕازێننەوەو بەرزی ئەکەنەوەو زلی ئەکەن، هەتا وای لێدێت مسوڵمانان ئالوودەی ئەبن، ئینجا بە ئالوودەبوون لەگەڵ ئەو جێگرەدا گیروگرفتە سەرەکییەکەیان لەبیر ئەچێتەوە، بەمجۆرە خەڵك بەرەو لای خۆیان ڕائەکێشن و لەباوەڕ بەخوا . بەبێ ئەوەی هەستی پێبکرێت . دووری ئەخەنەوەو ئەیخەنە باوەشی کوفرەوە!

سکالاّ: بەڕاستیی لە فێڵبازی و ساختەکارییدا لێزان و چەتوونن!

دڵپاك: بەڵێ فێڵبازو ساختەکارن، بەڵام لێزان‌و داهێنەر نین، چونکە ئەو ڕێگەیە داهێنراوی خۆیان نییە، تەنانەت زۆربەی زۆری ئەوانەی کە بەو جۆرە کارە هەڵدەستن، ئاوەزیان بەو نهێنییە ناشکێت‌و هەستی پێ ناکەن، بەڵکو هەروا کوێرانە بەناوی پێشکەوتن‌و شارستانییەت‌و سەربەستیی‌و یەکسانییەوە ئەو کارەیان پێجێبەجێ ئەکرێت، یان لە ڕێگەی پارتبازییەوە پێیان جێبەجێ ئەکەن، لەوە زیاتری لێنازانن، جا کاتێ قسەیشیان بۆ ئەکەی وەك فیشەکە شێتە ئەچن بەئاسمانداو بەدواکەوتوو و کۆنەپەرست‌و چەندان ناوی تر ناوت ئەبەن، هەروەك خۆیان لە چڵەپۆپەی ڕاستیی‌و وریایی‌و کارامەییدا بن!

ئاواز: باشە، ئەی کێ فێریان ئەکات؟ چۆن تۆ ئەوە ئەڵێیت؟

دڵپاك: سەرچاوەی ئەو پلان‌و کارانە، کۆمەڵێك یان چەند کۆمەڵێك جوولەکەن کە زاناو پسپۆڕن، پسپۆڕییان لە زۆربەی لقەکانی زانستدا هەیە، ئەوان ئەو پلانە سەیر سەیرانە دائەنێن‌و شاگردەکانیشیان ئەیانخەنە بازاڕەوە، ئیتر خەڵکی نەزان‌و دواکەوتوویش یەکسەر ئەیان قۆزنەوە، جا شاگردەکان لەلایەن سەهیونیزمی جیهانیی‌و هاوکارەکانییەوە پشتگیریی ئەکرێن‌و هۆیەکانی ڕاگەیاندنیش برەویان پێ ئەدان‌و بەخەڵکیان ئەناسێنێ، بەڵام لەکاڵاو بەرگ‌و شێوەو دیمەنێکی وەهادا کە مسوڵمانی نەك سادەو نەخوێندەوار، بەڵکو بەناو ڕۆشنبیریش پێیان هەڵئەخەڵەتێ.

سکاڵا: خوا پاداشتت بداتەوە مامۆستا دڵپاك، بەڕاستی من لە جیهانێکی دوور لەڕاستیدا ئەژیام، نەفام‌و سەرگەردان بووم، وابووم کە تۆ باست کرد، کەچی قەت بەخۆیشمم نە ئەزانی، خوا پاداشتت بداتەوە کە ڕێگەی فامیدەیی‌و کارچاکانت پێنیشاندام‌و توانیت لە دەمی گورگی گومڕایی‌و سەرگەردانییدا بمگریتەوە، بەخوا من باسی ئیسلامم بەمجۆرە هەرگیز لەهیچ کەس نەبیستووەو خۆیشم نەمزانیوە بەرنامەکەی ئەوەندە پاك‌و فراوان‌و پڕ لە دادگەرییە، ئێستا ئەزانم کە خوای گەورە چاکی بۆ کردم کە تۆی بۆ گەیاندم.

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، زۆربەی قسەکانت لە باسەکەدا ئاراستەی من کران، هەق نییە بەو شێوەیە هەستم بریندار بکەیت.

دڵپاك: خوشکی بەڕێزم، تۆ خۆت‌و لەخۆتەوە بەو جۆرە بیری لێ ئەکەیتەوە، ئەگینا من مەبەستم تۆ نەبووە‌و هەرگیزیش نامەوێ هەستی هیچ کەسێك بریندار بکەم، بەتایبەتی تۆ کە لەگەڵما ئەژیت، لەوەش زیاتر مسوڵمانی وریا زۆر باش ئەزانێت کە باوەڕ ناشتن لەدڵ‌و دەروونی بەتانەو تەشەرو پلارگرتن سەر ناگرێت، جا هیوادارم دڵنیا بیت کە مەبەستم تۆ نەبووەو تۆیش نابێت، من ئەمەوێ ساختەکاریی ناحەزان بناسن‌و ئاگادارتان بکەم تا وریابن‌و دەستان نەبڕن، ئەی تۆیش وەك ئێمە زادەی خێزانێکی موسڵمان نیت؟ ئەتەوێ خۆتمان لێ جیا بکەیتەوە؟ نا.. نا، خوشکی بەڕێزم، تۆ هەر مسوڵمانی.

## بێگەردی خۆت ڕاگرە

سکاڵا: سوپاس بۆخوا بەهۆی تۆوە ڕێگەی ڕاستم دۆزییەوە مامۆستا دڵپاك، باوەڕم بەڕاستیی ئیسلام پتەوو هێقمەو خوا یار بێت دایشئەمەزرێم، خوا پاداشتت بداتەوە کە ئەم جلوبەرگە مسوڵمانانەت پێشکەش کردم‌و خۆمم پێپۆشتە کردووە، داوات لێ ئەکەم کە ئامۆژگارییم بکەیت، دەستم بگریت، خۆت ئەزانی لە سەرەتادام‌و پێویستم بەفێرکردن‌و دەست گرتنە.

من ئێستا وەك ئەو کەسە وام کە تازە لەنەخۆشییەکی کوشندە هەڵسابێتەوە، جا ئەو چۆن پێویستیی بە حەب‌و دەرزی‌و دەرمان‌و خۆراکی چاك هەیە، بۆ ئەوەی خوێنی تێکەوێتەوەو هێزی بێتەوە بە بەرا، منیش بەو پێیە پێویستیم بە ئامۆژگاریی‌و چاودێریی‌و ڕێنیشاندان هەیە، تکات لێئەکەم ئاگادارییم بکە، تێمگەیەنە، پێمگەیەنە تا بتوانم خۆم بگرم.

ئاواز: بەرگەکەشت جوانەو چاکت لێدێت، لەڕووت دێت پێوەی بگەڕێیتەوە بۆ شار؟

سكالاً: یاخوا پیرۆزم بێت، بەلاًم زۆر سەیرە بەلامەوە! جاران بەسەرو مل و سنگ و قاچ و قولی ڕووتەوە، كە بەرەڵلا كان تەنها بۆ جنس تەماشایان ئەكردم، هەموو مرۆڤێكی مەرد قێزی لیٚ ئەكردمەوە، ئەوە بۆچی بە شانازییەوە بەسەر شەقامەكاندا بە كەشخەوە ئەڕۆیشتم؟ ئەی ئەبێ بۆچی ئێستا كە خۆم كردۆتەوە بەمرۆڤێكی خاوەن حەیاو ئابڕوو، لەڕووم نەیەت بچمەوە شار؟ ئای لەو كێشانەو پێوانە پێچەوانەیە!!

دڵپاك: خوشكە سكالاً، من هەرچییەكم لە دەست بێت دریٚغیت لێناكەم، بەلاًم لەهەموو شتێ گرنگتر لەم قۆناغەتا ئەوەیە بێگەردیی خۆت بپارێزیت، گوێ بەتانەو تەشەری هیچ كەسێك نەدەیت، تەنیا شوێن و ڕێگەیەكیش كە بتوانن تۆ پەنا بدەن و بتگەیەنن بەئاوات، قورئانەو فەرموودەكانی پێغەمبەرەﷺ، جا خۆت بكە بەشاگردیان هەتا تێكەڵی گیان و خوێن و گۆشت و مۆخ و ئێسقان و بیرو مێشكت بن.

بەلاًم بێگەردیی.. بێگەردیی خۆت بپارێزە، لەم ڕووەوە ناتوانم لە داڕشتنەكەی (ناجی النجار) لە پەڕاوی (كلمات مضیئة مهداة الی المرأة) بەپێزترو چاكترت بۆ داڕێژم، جا فەرموون گوێی لێبگرن كە ئەڵێت: "هەموو كۆمەڵ و كۆمەڵگەیەكی خاوەن شارستانییەت نیشانەو سیفاتی گشتیی خۆی هەیە لەژیانیدا كە لە كۆمەڵ و كۆمەڵگەكانی تری جیا ئەكاتەوە، بەرزترین نیشانەو سیفاتی كۆمەڵگەی ئیسلامیی كە لەژیانی ناو كۆمەڵگەی ئیسلامییدا بەرچاو ئەكەوێت بێگەردیی و داوێن پاكییە، لە هەموو لایەنە جۆر بەجۆرەكانی ژیانی كۆمەڵگەی ئیسلامییدا كە بەو بێگەردییەوە ڕەنگ كراوەو ڕەنگ ئەكرێت، بێگەردی تەنها جلو بەرگ و لەبەركردنی نییە، هەروەك هەندیٚ وا بۆی ئەچن، بەڵكو بێگەردیی واتاكەی لێكدانەوەیەكی گەورەو فراوانی هەیە، هەموو لایەنێكی ژیان ئەگرێتەوە، پۆشاك تەنها لایەنێكە لەو لایەنانە، بە مەفهومی ئیسلام، مسوڵمان هەتا بێگەرد نەبیٚ بەمسوڵمان ناژمێررێت..".

ئاواز: ئێوە بۆچی ئەتانەوێ بێگەردیی تەنیا بەسەر ئافرەتانا بسەپێنن؟ بۆچ هەر ئافرەت ڕاگیری بكات؟ ئەی بۆچی داوای بێگەردی لە پیاویش نەكرێت؟

دڵپاك: دەی گوێم لێبگرە، با یاسایەكی خواییت بۆ بهێنمەوە كە تیایا ئەبینی، پێشئەوەی ئیسلام داوا لە ئافرەت بكات بۆ بێگەردیی، ئەبینیی داوای لە پیاو كردووە. واتە لەپێشەوە بێگەردیی لەسەر پیاو پێویست كراوە: (قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ) پاشان ئەفەرموێت: (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ..).

سكالاً: بەڕاستی یاسایەكی پڕ لەدادگەرییە! ئەوەتا لە پێشەوە داوای لە پیاوان كردووە كە بێگەرد بن، ئەمجا لە ئافرەتان، یاسا ئەبیٚ وا بێت!

دڵپاك: دیسانەوە ناجی النجار لە هەمان پەڕاودا دەڵێت: "ئەم دواندنە خواییە كە ئاراستەی كۆمەڵگەی ئیسلامیی كراوە بەپیاوو ئافرەتەوە، بەشێوەیەكی لێزانانە، بێگەردیی تێدا بەمانایەكی فراوان دیارە، سنووری ئەدەبیی و كۆمەڵایەتیی بەپێی بیروڕای ئیسلام دیاریی كردووە، بۆ ئەوەی ژیان بە پاكیی بۆ هەموو مسوڵمانان كە پڕ بێت لە بێگەردیی، خاوێنیی، ڕەوشت بەرزیی بسازێنێت و دوور بێت لە لادان و پیسی و تاوانباری".

پاشان ئەڵێت: "ژیانێك كە تەنیا ئافرەتی تێدا بە داوێن پاكییەوە نەبەسترێتەوەو جڵەوی پیاو شل بكات و هەرچی بكات بەئارەزووی خۆی بیكات، نا، ئافرەت و پیاو لە بێگەردیی پاراستندا وەكو یەكن، لە پێشەوە (قل للمؤمنین) ئەمجا (قل للمؤمنات)".

خۆزگە ئەمزانی كەی قوول ڕووتی و سنگ ڕووتی و مەمك دەرپەڕاندن و دەم و چاو بۆیاخكردن و چەندەها شتی تر لەو بابەتە، هۆیەك بوون لەهۆیەكانی بلاًوكردنەوەی زانیاریی و كەی نیشانەی پێشكەوتن بوون؟!.

دەی خوشكەكانم، با بیر بكەینەوەو ورد بینەوە، بابزانین بێگەردیی بۆچ ئەبێتە هۆی دواكەوتنی مرۆڤ؟ ئەی چۆن و بۆچ بێئابڕوویی بە گرنگترین هۆی پێشكەوتن و شارستانییەت بژمێرین؟ تاكو كەی بەچكەو شاگردەكانی كوفر هەر بتوانن بمانخەڵەتێنن؟ تاكەی ئێمەش گوێ لەو خەڕەكەیان بگرین كە هەر لێی ئەدەن و لێی ئەدەنەوە؟!

سکالا: بەخوا پێشکەوتن و شارستانییەت بەستراون بەزانین و کارکردنەوە، نەك بە بێئابڕووییەوە، پێشکەوتن ئەگەر حەیاو ئابڕووی پێوە نەبێت پوولێك ناهێنێ، ئەوە دواکەوتنە، گەڕانەوەیە بۆ دواوە، لەمرۆڤایەتیی دەرچوونە، دەی خۆ ئەوەتا ئاژەڵەکان ڕووت و قووتن و خوا چۆنی خەلق کردوون هەروا ماونەتەوەو هیچ بەرگێکی دەستکردیان نەپۆشیوە، کەچی یەك هەنگاویان بەرەو شارستانییەت نەناوە، پێشکەوتنیان بەدەست نەهێناوە، لەکاتێکدا گوێشیان نەداوە بە بێگەردێتیی و هیچ جۆرە ئەرەجێکیشیان لەسەر نییە.

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، نموونەکەت زۆر جوان و بەرجەستەیە، جگە لەوەش، ئەگەر تەماشای هەندێ وڵاتی دواکەوتوویش بکەین، ئەبینین ڕووت و قووتیی لەناویاندا یەکجار زۆرە، ناوی بێگەردییش نازانن، دەی ئەبوایە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێشکەوتووتر بوونایە، کەچی وایش نییەو زۆر دواکەوتوو و نەزانن.

بۆچ داوێن پاکیی، پۆشتەو پەرداخیی، بەها پاراستن
تۆ لە داهێنان، لە کارو زانست، پێ و دەست ئەبەستن؟
حەیا، ڕوو سووریی، لەگورگ خۆلادان، ڕێگەی هەق گرتن
لەڕێی پێشکەوتن کەی ئەبنە کۆسپ؟ ئەی بۆچ بەربەستن؟
خوشکێ، جوانی ڕاست نەرم و نیانییتە، ڕەفتار چاکییتە
کارو بەرهەمە، خۆداپۆشین و داوێن پاکییتە
خێزان پەروەریی، مامۆستایەتی و بیرو زانیینە
ڕێزی خۆگرتن، سەربەرزیی و ژیریی و خودا ناسییتە[1].

## ئاوارەو بەدبەخت نییە

ئاواز: دڵپاك خان، خۆ باسەکانت جوان و بەتامن، بەڵام ئیتر ئەمە ژیانە هەرکەس بۆ خۆی ئەژی و بەپێی بیروڕای خۆی ئەجووڵێتەوە، دیارە ژیانیش کاتێکی کورتەو لە دەست ئادەمیزاد دەرئەچێت، جا هەرکەس بەجۆرێ ئەیەوێ بژی، ژیانیش بۆ هەموو کەسێك ڕەوایە، بەڕاستیی ئادەمیزاد لەم سەر زەوییەدا ئاوارەو بەدبەختە، ئاه!!

دڵپاك: چاوەکەم، مەبەستی من ئەوە نییە کە بڵێم ژیان بۆ هەمو کەسێك ڕەوا نییە، ئەزانم کە هەموو کەسێ بیرو ڕای خۆی هەیە، بەڵام ئایا هەموو بیروڕایەك ڕاست و پاکە؟ هەموو جوڵانەوەیەك ڕەواو لەبارە؟ ڕاستە ژیانی مرۆڤ لەم سەر زەوییەدا کورتەو ئەبڕێتەوە لەسەری، بەڵام چۆن بڕانەوەیەك؟ ئێمەی مسوڵمان بە بڕانەوەی یەکجاریی باوەڕمان نییەو پێی ئەڵێین، گواستنەوەی هەوار لە جیهانێکەوە بۆ یەکێکی دی، نەك بڕانەوەی یەکجاری، بەڵام ئادەمیزاد لەم سەر زەوییەدا نەئاوارەیەو نە بەدبەخت و پێویستیش بەئاخ هەڵکێشان ناکات.

ئاواز: ئاخر ئەمەیان چۆن؟ تۆ هەمیشە ئەتەوێ ڕەددی من بدەیتەوە.

دڵپاك: نا.. نا، مەبەستم ئەوەیان نییە، بەڵام چاوەکەم، ئەو قسانەی تۆ هی کەسێکن هەست بە مەبەستی بوونی خۆی نەکات و نەزانێ کارو گرنگیی خۆی لەم ژیانەدا چییە، نابێ تۆی بەچکە مسوڵمان ئەو قسانە بکەیت، چونکە ئایینەکەت لە ئاشکراترین شێوەدا مەبەست و گرنگیی ئادەمیزادی دەربڕیووە، ڕۆڵی خۆی لەم ژیانەدا بۆ ڕۆشن کردۆتەوە.

ئادەمیزاد بە هەوانتە خەلق نەکراوە، هەروا بەر نەدراوەتە ئەم ژیانەو بەرەڵڵا بێت، نەخێر، بۆ مەبەست و حیکمەت دروست کراوە، هەروەها بۆ ئەوە خەلق نەکراوە کە ببێتە بەندەی یەکێك لە ڕەگەزەکانی ئەم بوونەوەرە، یان هەر بخوات و بخواتەوە، وەك ئاژەڵ و تەمەنی خۆی هەر بەوە بەسەر ببات تا ئەو ڕۆژەی کە گڵ قووتی ئەدات و کرم و مێروو تێی بەرئەبن.

---
[1] سروەی بێداری - چاپی یەکەم.

بەڵکو بۆ ئەوە خەلق کراوە کە پەروەردگاری خۆی بناسێت و بپەرستێت، ئەو پەروەردگارە کە کردوویەتی بە جێنشین و وەکیلی خۆی لەم سەر زەوییەدا، گەورەترین سپاردەی پێ خەڵات کردووە، ئەرك و پێویستیی خستۆتە ئەستۆ، تا بەوە پێبگات و خۆی ئامادە بکات بۆ ژیانێکی تری پاك و چاکی هەرگیز نەبڕاوە، بۆ ئەو ژیانەی کە دادوەریی بە تەواویی تێدا دێتەدی.

خوشکەکانم، ئادەمیزاد لەم سەر زەوییەدا ڕێبوار یان هەوارییەکە، بەرەو جیهانێکی تر بەڕێوەیە، ئەو جیهانەی کە برانەوەی بۆ نابێت، دەی با بزانین کە ئەم ژیانە هەر بۆ خواردن و خواردنەوە نییە، ئەی نەتبیستووە کە گوتراوە: "گەمژە بۆ ئەوە ئەژی بخوات و بخواتەوە، بەڵام ژیر بۆ ئەوە ئەخوات و ئەخواتەوە کە بژی". خۆ ئەمەش گرێیەکەمان بۆ ناکاتەوە، چون ژیان خۆی مەبەستی کۆتایی نییە، بەڵکو هۆیەکە بۆ مەبەست.

بێباوەڕان ئەڵێن: ئادەمیزاد بۆ خۆی و وەدەستهێنانی لەززەت ئەژی، بەڵام باوەڕداران ئەڵێن: نا، ئادەمیزاد ژیانی خۆی بۆ خوا تەرخان ئەکات، هەتا خۆشیی هەردوو جیهانی دەستکەوێ، ئای ئەوانەی کە بۆ خۆیان دەژین و ئەوانەش کە بۆ خوا ئەژین چەند لەیەکترەوە دوورو جیاوازن!

بۆچوونی بێباوەڕان لەبوونی ئادەمیزاددا مەبەست بەدی ناکەن، چونکە مەبەست مەبەستخوازیی ئەوێ، مەبەستخوازییش مەبەستخوازی ئەوێ، جا خۆ ئەویش ددان بەوەدا نانێت کە ئادەمیزاد بۆ مەبەست خەلق کرابێت، لەبەرئەوە لەلایەن بێباوەڕانەوە ئەگوترێت: "ئادەمیزاد هیچ پەیامێکی لەم ژیانەدا پێنییە، جگە لە تێکۆشان لە پێناوی ژیاندا". جا هەر کە ئەوەی بۆ نەهاتەدی ئیتر خۆی بەئاوارەو بەدبەخت ئەزانێت و ئەکەوێتە گلەییکردن لە ژیان.

چەند جوانە کە هەندێ لە زانایان و وێژەوانان گاڵتە بە شەیدایانی ژیان ئەکەن و پێیان ئەڵێن: "ئەو کەسەی کە مەبەستی ژیانی لەسك و ناو گەڵدا بەدی بکات، نرخی بە قەدەر ئەوەیە کە لەو دووانەوە دێتە دەرەوەوە!!".

بەڵێ، ئادەمیزادی خوانەناس تەنها بە دەوری خۆیا ئەسووڕێتەوە، چونکە هەر خۆی ئەبینێت و بیری وا بەسەر هەواو هەوەس و خارشی خۆیەوە، تەنها لەشی ئەبینێ و ئەناسێ و لایەنەکانی تری بوونی فەرامۆش ئەکات، بەوەش هەرگیز ناتوانێ حەزی خۆی کۆتایی پێبهێنێت، یەکێك لە نووسەرەکان لەم ڕووەوە ئەڵێت: "ئادەمیزادی وجوودیی وەکو ئەو سەگە وەهایە کە بەدەوری خۆیا ئەسووڕێتەوە بۆ ئەوەی کلکی خۆی بگرێت، کەچی بۆی ناگیرێت و ئەویش لەڕاکردن و سووڕانەوە ناکەوێ..".

خوشکە بەڕێزەکەم، من حەز ئەکەم تۆو هەموو خوشکێك لەڕاستیی بگات و خۆی بە بەدبەخت و ئاوارە نەزانێت، ئەمەوێ هەر هیچ نەبێت هەنگاوێك بەرەو بەختیاری ئافرەت بنێین.

## ئەوە ئەوە وا ئەڵێت؟

دڵپاك: ئاواز خان، ئەگەر ڕێم بدەیت، حەز ئەکەم چەند کۆپلەیەك لەم باسە بدەم بەگوێتداو دوایی ڕای خۆیشت بەرامبەری دەرببڕیت.

ئاواز: فەرموو.. فەرموو، گوێم لێ ڕاگرتوویت، ئادەی بیخوێنەرەوە.

دڵپاك: لە لاپەڕە (٥٧ ـ ٥٩)دا هاتووە: "چەند وشەیەك لەبارەی چەند ژنێتیی و چەند مێردێتییەوە ئەڵێین، ئەم دوو شێوە هاوسەرێتیە، جگە لە دوو بەرهەمی ناپێویستی ڕابواردن، لە جۆرەکانی بەرهەمانی ڕابواردنی مێژوو، بەولاوە هیچیتر نین، سا مەگەر لەو وڵاتانەدا کە هەردووکیان لەیەککاتدا بووبن، کە وەك زانراوە ئەوەش وەها نەبووە، کەواتە لەبەرئەوەی کە پیاوان نەیانتوانیوە خۆیان لە چەند ژنێتیی بپارێزن، بەهۆی مانەوەی ئەو ئافرەتانەوە کە بەبێ مێرد ماونەتەوە لەکاتی چەند مێردێتییدا، لەبەرئەوەی کە ژمارەی پیاوان و ئافرەتان تا ئێستاش نزیکە وەکو یەك ماوەتەوە، هیچ شێوەیەك لەو دوو شێوەی هاوسەرێتییە شێوەی گشتیی نەڕەخساندووە، چەند ژنێك بۆ یەك پیاو جگە لە بەندایەتی

هیچی تر نەبووە، لە خێزانەکانی (بطریکة) سامییەکاندا، باوك خۆی بە تەنیاو هەندێ لە کوڕەکانی لەکاتی خۆشگوزەرانییدا بە چەند ژنێتیی ژیاون، کەچی خەڵکی تر یەك ژنە بووە، تا ئێستاش لە ڕۆژهەڵات ئەوە ماوەتەوە.

چەند ژنێتیی جیاکەرەوەو ئیمتیازێکە کە هی دەوڵەمەندان و کاربەدەستانەو لەسەر بنەڕەتی کەنیزەك کڕیین دامەزراوە. بەڵام خەڵکی ڕەش و ڕووت بەیەك ژنێتیی ماوەتەوە، چەند مێردێتیی لە (هیند، تبت)دا جۆرە لادانێکە لەوە..، بەهەر حاڵ وا دەرئەکەوێ کە چەند مێردێتیی لەڕووی هەڵسوکەوتی عەمەلییەوە زیاتر نەرم و نیان و پڕ لە لێبوردن تر بێت لە کۆزی موحەممەدییەکان . واتە ئافرەتیان وەك ئاژەڵ کردۆتە کۆزەوە . کە لەسەر خانەگومانیی دامەزراوە، بەلایەنی کەمەوە لە هینددا لەناو (نایر)دا سێ، چوار یان زیاتر لە پیاوان یەك ژنیان هەیە کە هاوبەشن تێیدا، بەڵام هەریەکەیان بۆی هەیە لەگەڵ پیاوێکی تردا یان دووان، سیان یان زیاتردا ژنێکی تریان هەبێت".

ئاواز: ئەو قسانە لەقسەی کابرایەکی شێت یان سەرخۆش و ژیری شێواو ئەکەن، پڕن لە دژایەتیی و بەیەکتر داماڵیین.

سکالا: باشە، ئاخۆ ئەو قسەکەرە خۆی لە مەبەستی خۆی تێبگات؟!

دڵپاك: ئا، چاك تێئەگات، خوشکە ئاواز، تۆ بۆ وات گوت؟

ئاواز: چەند ژنێتیی، یان چەند مێردێتیی ئەگەر دوو شێوەی هاوسەرێتیی بووبن، چۆن بە دوو هۆو بەرهەمی ڕابواردنی مێژوویی ئەژمێرێن، ئایا هاوسەرێتیی بۆ ڕابواردنە، یان یەکێکە لە پێویستییەکانی ژیان و لەیاسا سرووشتییەکان؟ ئەی ئەگەر هەردووکیان لەیەك وڵاتداو لەیەککاتدا بووبن بۆچی بە بەرهەمی ڕابواردن دانانرێن لەبەر چی؟

هەروەها مادام چەند ژنێتیی بە بەندایەتیی و بە بەندەکردنی ئافرەت دابنرێت، ئەبێ چەند مێردێتیی بە بەندایەتیی و بەندەکردنی پیاو دابنرێت، کەچی ئەو نووسەرە ئەمەیانی فەرامۆش کردووە، هەروەك مەبەستێکی تایبەتی لەوەدا هەبووبێت، جگە لەوەش سەبارەت بە ژمارەی پیاوان و ئافرەتان باسەکەی چاك نەپێکاوە، من لەم ڕووەوە باسەکانی تۆم باش لەبیرماوە.

دیسانەوە، ئەگەر چەند ژنێتیی تەنها کاری دەوڵەمەندەکان و خاوەن پلەو پایەکان بووبێت یان ببێت، خۆ لەو کاتانەدا کە ئەڵێن چەند ژنێتیی باو بووە، یان لەناو مسوڵمانەکانی سەردەمی چەرخی یەکەمیی ئیسلامدا، ئەو کاتانە دەوڵەمەندو خاوەن پلە زۆر زۆر کەمبووە، کەچی چەند ژنێتیی لە ئێستازۆر زۆرتر بووە، دەی ئەبێ دەوڵەمەندەکانی ئێستا هەریەکە بەدەیان ژنیان هەبێت، بەتایبەتیی مسوڵمانەکانیان، کوا؟ هەیانە؟

دڵپاك: ئەی دەستت خۆش بێت و خوا ڕێنموونیت بکات، بەڕاستیی چاکت زانی، جا فەرموو سەرنج بدە، چەند مێردێتیی (نایروتبت)و شوێنە دواکەوتووەکانی تر چەند بەگرنگ و پڕ لە لێبووردن و نەرم و نیانیی ناو ئەبات! کەچی چەند ژنێتیی مسوڵمانان، کە بەدرێژایی باسمانکرد، بەو هەموو حیکمەتەیەوە، چۆن دێنێتە خوارەوەو چ داڕشتنێکی بۆ بەکار ئەهێنێت!!

ئاواز: ئەوە ئەو وێژەرە کێیە؟ ناوەکەیم پێ ناڵێیت؟

دڵپاك: بۆچی نا؟ فردریك ئەنجلزە، ڕەنگە بیناسیت، یان ناویت بیستبێت.

ئاواز: چۆن؟ ئەوە ئەوە وا ئەڵێت؟ ئەو پەڕاوە ناوی چییە؟

دڵپاك: بەڵێ.. بەڵێ، ئەوە ناوی (المرأة في التراث الاشتراكي)ە.

سکالا: بەڵام من نایناسم.

## مەدحی بورژووا بۆچی؟

دڵپاك: مامۆستا ئاواز، تۆ گوتت: "هاوسەرێتیی یەكێكە لە پێویستییەكانی ژیانو لەیاسا سرووشتییەكان".

ئاواز: بەڵێ، جا ئەوە هیچ ناڕاستیی و لارییەكی تێدایە؟

دڵپاك: بەپێی بۆچوونی ئیسلام تێیدا نییە، بەڵام..

ئاواز: بەڵام چی؟ بۆچی قسەكەتت بڕیو تەواوت نەكرد؟

دڵپاك: ماركس هاوسەرێتیی بەشێوەیەكی تر لێكئەداتەوەو خێزانیش بە شتێكی تری پێچەوانەی بۆچوونەكەی تۆ باس ئەكاتو پەیوەندیی نێوان كەسانی ناو خێزان زۆر سەیر ناو ئەبات.

ئاواز: ئاخر تۆ چۆن وا ئەڵێیت؟ لەوانەیە لە بابەتەكە چاك تێنەگەیشتبیت.

دڵپاك: نا.. نا، مامۆستا ئاواز، گوێبگرە كە ئەڵێت: "بۆچوونە پڕ لە خۆپەرستییەكانتان پاڵتان پێوە ئەنێن بەرەو گۆڕینی شێوە كۆمەڵایەتییەكان، كە زادەی جۆری بەرهەمهێنانو پەیوەندیی موڵكایەتیی ئێستان، كە بە یاسای ئەزەلیی و سرووشتیی و ژیرییان بژمێرن، لەگەڵ ئەوەشا جگە لە پەیوەندیی مێژوویی هیچی تر نییە، كە لەگەڵ بەڕێوەبوونی مێژوودا سەر هەڵئەدەنو سەر ئەكەن بەناوا..".

ئاواز: ئاخر ئەوە بە بورژوواكان ئەڵێن، هیچی تر ناگرێتەوە.

دڵپاك: ئاوازخان، تۆ كچێكی زیرەكیت، توانای شیكردنەوەت هەیە، خۆت گێل مەكە، ئەو مەبەستی خێزانو خێزانداریی و پەیوەندی ئەندامانی ناو خێزانە، ئەمەتا ئەپرسێت: ".. بەڵام لەسەر چ بنەڕەتێ ئەمڕۆ خێزانی بورژووا دائەمەزرێت؟". ئەمە شتی زۆری تیایە ئاواز خان.

ئاواز: ئەی پێم نەگوتی كە ئەو ئەوەی بە بورژوواكان گوتووە؟

دڵپاك: جا كەواتە هەر بورژوواكان ددان بە خێزانو خێزاندارییدا ئەنێنو ماركسیزم ددانیان پیادا نانێت، ئەی ئەوە نییە كە ئەڵێن: "لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە پەیوەندیی مێژوویی هیچی تر نین؟" كە ئەڵێن: "لەگەڵ بەڕێوەبوونی مێژوودا سەرهەڵئەدەنو سەر ئەكەنەوە بەناوا..!".

هەروەها كە ئەڵێت: "ئەو پەیوەندییە مێژووییانە سەرهەڵئەدەنو سەر ئەكەنەوە بەناوا"، ئەوە ئەگەیەنێ كە بیری هاوسەرێتیی (الزواج)و ئەركو پەیوەندییەكانی ئەزەلیی نەبن، واتە لەگەڵ خەلقبوونی ئادەمیزاد نەهاتوون، سرووشتیی نەبن، لەوەش زیاتر پەسەندیان نەكات، ئەی ئایا ژیری ئەوە پەسەند ئەكات كە پیاو لەناو ئافرەتدا وەك سابرین لەناو بزناندا وابێت، یان ئافرەت وەك ئاودەست هەموو كەسێك پاشەڕۆكی خۆی تێبكات؟ چ ژیرییەكی ساغ ئەوەی بەلاوە پەسەندە؟!

ئاواز: مامۆستا دڵپاك، بورژووا ئافرەتی تا ساندووەو چنگی لەقوڕگی ئاڵاندووە، جا لەبەرئەوە هەرچییەكی دەربارە بگوترێت هێشتا هەر كەمە.

دڵپاك: لەمەدا لەگەڵتامو زۆر ڕاست ئەكەی، بەڵێ بوورژووا ئافرەتی بەسەزمانی لەمرۆڤایەتیی خۆی ئاوەڕووت كردووەو هێناویەتییە پلەی ئاژەڵەوە، بەڵام ئەی بۆچی ئەگەر بورژووا هەنگاوی بەرەو وێرانكردنی ئایینی پاك مەزنترین زیندووكەرەوەی وزەو تواناكانی ئادەمیزادە نابێت ئەو هەنگاوذانە بە كارێكی بەرزی بە كەڵكی گەورەو گرنگ بژمێرێتو بەو پەڕەی پیاهەڵدانەوە باس بكرێت؟

ئاواز: كوا شتی وا هەیە؟ باوەڕ ناكەم ببێت!

دڵپاك: بەڵێ هەیەو باوەڕیش بکە، گوێبگرە کە مارکس ئەڵێت: "بورژووا دەورێکی شۆڕشگێڕانەی باڵای لەمێژوودا دی.. بورژووا پەردەی سۆزدارییی کە درابۆوە بەسەر پەیوەندییەکانی خێزاندا، دڕاندو زاڵبووە بە سەریاو کردی بە پەیوەندیی دارایی ڕووت.. پیرۆزترین دەمارگرژییی تینی ئاینیی برد بە ناخی زەویدا.."[1].

جا لێرەدا ئەپرسین: بۆچی هەنگاوەکانی بورژووا (بەپێی بیری مارکسیزم)، هەموویان کۆنە پەرستانەو گلاّوو نزمن، کەچی کە لە ئایین بدات، ئەو هەنگاوەی بە شۆڕشگێڕێتیی (بەپێی بۆچوونی مارکسیزم) مۆری داراییە کە بەناوچاوانی بورژوواوە دیارە، بەڵام ئەی کە بۆرژووا زاڵبوو بەسەر پەیوەندییەکانی ناو خێزانداو کردنی بە پەیوەندیی دارایی ڕووت، بۆچی ئەو کارە بە دەورێکی شۆڕشگێڕانەی باڵای مێژوویی ئەژمێرێت، ئەی ئەم بۆچ پیرۆزترین دەمارگرژیی تینی ئاییدی برد بەناخی زەویدا؟

سکاڵا: بەخوا ئاواز گیان، لەڕووی دۆستایەتییەوە پێت ئەڵێم، حەیفە ئادەمیزاد لە گێژاوی ناهەقییدا بسووڕێتەوە.

# گەر مۆڵەتیان پێدام دێم

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، شتێك لە دڵمایەو هەر ئەبی پێتی بڵێم، چونکە ئەگەر بمێنین، لە ڕێماندایە، جا دڵنیام کە تۆ لێی ئەزانی، منیش ئەمەوێ شتێکی لێبزانم، خۆ پرسیین نەنگو شوورەیی نییە؟!.

دڵپاك: نەنگ و شوورەیی لە نەزانین و نەپرسییندایە خوشکەکەم، پرسین لە ئیسلامدا ئەرکو پێویستییەکی گرنگی سەرشانە، (فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُون)، هەرچی لە دڵتایە بەوپەڕی سەربەستییەوە بپرسە، تەمو مژ لە دڵ و مێشکتدا با برەوێتەوە، ئەزانم ئەوەی لەمەوبەر دراوە بەگوێتا سەبارەت بە ئیسلام جۆرە ژەنگێکی لە دڵتا بەجێهێشتووە، منیش هەر شتێکم زانی ئەوا وەڵامت ئەدەمەوە، ئەوەش کە نەمزانی ئەوسا پەنا ئەبەینە بەر سەچاوەکانو بە هەردووکمانەوە وەڵامی پرسیارەکە ئەدۆزینەوە، سوپاس بۆ خوا سەرچاوە بەزمانی عەرەبیی زۆرە، خۆزگە ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەندییان بە ئافرەتەوە هەیە بە زمانی کوردییش زۆر ئەبوون، ئای کە بە کەڵك ئەبوو!

سکاڵا: شووکردنی مسوڵمانانە چۆنەو ئەبێ بەچ شێوەیەك بێت؟

دڵپاك: پرسیارەکەت زۆر بەجێیە، بەڵام وەڵامەکەی زۆر دوورو درێژە، وا ئێستا بەرەو قوتابخانە ئەچین و لەوێشەوە بەرەو شار ئەچینەوە، ئەی بەیانی هەینی نییە؟ ئەگەر حەز ئەکەیت با نەڕۆینەوەو بۆت باس بکەم، گەر خوا یاربێت و گەڕاینەوە باسی ئەکەین و شووکردن و ژنهێنان و مافی ژن و پیاوو بەسەر یەکترەوە، هەمووی باس ئەکەین.

ئاواز: کچە وازبێنن، ئەڕۆینەوە بۆ شار، بەخوا من ئەڕۆمەوە.

سکاڵا: حەز ئەکەم بچینەوە، بەڵام خۆ ئەکرێت شەو باسی بکەیت بۆم.

دڵپاك: ئاخر چۆن؟ خۆ ئەوە بە تەلەفۆن ناگونجێ و ناکرێت.

سکاڵا: ئەوە ئەزانم، کە چووینەوە یەکسەر ئەچین بۆ ماڵی ئێوەو ئیزن وەرئەگرین و شەو لە ماڵی خۆمان ئەبین، دایك و باوکم زۆر حەز ئەکەن بتناسن و داوایان لێکردووم کە بەدیدارت شادمانیان بکەم، دایك و باوکی من هی تۆیشە، هیوادارم بێیت و دەست نەنێیت بەڕوومەوە، بەشکوم تۆزێك کەڵك بەوان و خوشکەکانیشم بگەیەنی، ئای کە شادمان ئەبن کە بەم بەرگە موسڵمانانەوە ئەمبینن!

دڵپاك: خوشکە گیان، ئەوەی گوتت هەموویم بەلاوە جوان و بەکەڵکە، بەڵام ئەگەر دایك و باوکم مۆڵەتیان پێنەدام، ناتوانم سەرپێچییان لێبکەم، تکام وایە گلەییم نەکەیت.

---

[1] المرأة في التراث الاشتراكي: ترجمة جورج طرابيشي، ص ٢٠ ـ ٢٢.

سکالاْ: زۆرچاکە، جا لێرەوە یەکسەر ئەچینەوەو بۆ ماڵی ئێوەش ئەچین، پاش وەرگرتنی مۆڵەت ئەچین بۆ ماڵی خۆمان، دڵنیاشت ئەکەم کە ماڵی ئێمە ماڵێکی گومان لێکراو یان مەترسی لێکراو نییە.

دڵپاك: قایلمو لارییم لەوەدا نییە، بەڵام ئەبێ خوشکە ئاوازیش بەشدارییمان بکات، من خۆشم ئەوێتو حەز ئەکەم هەمیشە لەگەڵیا بم.

سکالاْ: ئا.. ئا، ئەبێت ئەویش بێت لەگەڵماندا.

ئاواز: دێم، بەڵام میوانی دڵپاکم، نەك ئێوە، چونکە ئەو داوای لێکردم، خۆت نەت ویست پێم بڵێیت.

سکالاْ: نا.. نا، وا مەڵێ، منیش پێم ئەگوتی.

## سەرچاوەكان

١. القران الكريم
٢. كتب الاحاديپ النبويه
٣. تفسيرى في ظلال القران.
٤. فقه السنة . السيد سابق.
٥. اسلامنا . السيد سابق.
٦. التطور والثبات في الحياة البشرية . محمد قطب.
٧. شبهات حول الاسلام . محمد قطب.
٨. الاسلام وقضايا المرأة المعاصرة . البهى الخولي.
٩. المرأة بين البيت والمجتمع . البهي الخولي.
١٠. المرأة في القران . عباس محمود العقاد.
١١. المرأة في القران والسنة . محمد عزة دروزة.
١٢. ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين . السيد أبو الحسن الذدويى.
١٣. الحجاب . أبو الأعلى المودودي.
١٤. مجموعة رسائل . للعلامة محمد حامد.
١٥. فجر الاسلام . أحمد أمين.
١٦. المرأة في القرن العشرين . جروان السابق.
١٧. كلمات مضيئة مهداة الى المرأة . ناجي النجار.
١٨. حقائق الاسلام وأباطيل خصومه: عباس محمود العقاد.
١٩. ماذا عن المرأة: الدكتور نورالدين عتر.
٢٠. الأيمان والحياة: يوسف القرضاوي.
٢١. البيت الاسلامي كما يجب أن يكون: مقداد يالجن.
٢٢. تعدد الزوجات في الاسلام: عبدالله جورج طرابيشي.
٢٣. الاسلام والجنس: فتحي يكن.
٢٤. المرأة في التراث الاشتراكي: ترجمة جورج طرابيشي.
٢٥. حقيقة البابية والبهائية: الدكتور محسن عبدالحميد.
٢٦. ئافرەت لەمێژوودا . دكتۆر كمال مظهر.
٢٧. ژیانی پێغەمبەری مەزن محمدﷺ عبدالعزیز پارەزانی.
٢٨. خوا لە ڕوانگەی زانیارییەوە: وەرگێڕانی ئەحمەد كاكە مەحمود.
٢٩. چەند سەرچاوەیەكی جۆربەجۆری تر.

**بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)**

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | فازڵ قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێنننامە)ی زەردەشتی | ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ،<br>ئەفسانەی مێژوونووسێك | حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئامادەکردنی:<br>ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |